# ئاڤێستای نەورۆز



ئەو کاتانەی ئێراق هەمووی کوردستان بوو
کاوەی گووتی ( جاف ) و ئەژدیهاك بابلی بوو



ئاڤێستا نامەی

عەبدولخالق سەرسام

# ئاڤێستای نەورۆز

ئەوکاتانەی ئێراق هەمووی کوردستان بوو

کـاوەی گووتــی جــاف و ئــەژدیهاك بــابلی بـــوو



ئاڤێستا نامە ی

## عەبدولخالق سەرسام

٢٧٠٤ك. – ٢٠٠٥ز.

ناوی پەرتوك : ئەو کاتانەی ئێراق هەمووی کوردستان بوو
دانەر : عەبدولخالق سەرسام
ژمارەی سپاردن: (٣٤) ساڵی ٢٠٠٥
تیراژ : ١٠٠٠ دانە
چاپی یەکەم : ٢٠٠٥
چـــــاپ : چاپخانەی منارە – هەولێر
پیتچینین : سەنتەری کۆمپیوتەری شەهاب / سۆران

ئەم كۆپلە شیعرەم لە ساڵی ١٩٦٩ نووسیوە كە لە نامیلكە شیعرییەكەم بە ناوی بەستەی گومان لاپەڕە ٧ كە لە هەمان ساڵ بڵاوم كردۆتەوە دوای (٣٥) سی و پێنج ساڵ كە ئێستاكەیە بەڵگەی هەمان پەیڕەوو پرۆگرامی نەگۆڕاومە.

# تــۆڵــە

پێچكەی رۆژگار، ئەگێڕمەوە
تاكو بەرزترین شوێنم
جا لەوێوە بەبەرزایی
ئەڕۆم جیهان ئەدوێنم
ئەڕۆم بە تاو
بەرەو هەتاو
ماف باوكی هەڵخەڵەتاو
لەهەر چوار لا دەسێنمەوە
چۆن ئەمناسی، مێژووی بەرزی
ئاواش لەنوو، وەك سەركەوتوو
خۆم بە برایان ئەناسێنم

بەستەی گومان
هاوینی ١٩٦٩، ل٧. عەبدولخالق سەرسام

سپایزەر دەڵێ گووتییەکان پێش سۆمەرییەکان لە هەمان شوێن بوون
منیش دەڵێم گوتییەکان لە تۆڵەی هێرشەکەی نرام سن بۆ سەر
کوردستان هێرشییان کردەوە سەر ناوچەی سۆمەر وئەکەد
لە ساڵی ٢٢٣٠پ.ز ئەکەدییەکانی تەفرو توناکرد و لەناوبرد وەك چۆن
ئاشوورییەکان بە دەستی میدییەکان هەتا هەتایێ لەناوچوون.
گوتییەکان ناوچەی سۆمەریشیان رزگار کرد ئەم شیعرە کە هی ئەو
سەردەمە یان ئەکەدەییەك یان سۆمەرییەك ئەم شیعرەی نووسیوە کە
باسی هێرشەکەی گوتییەکان دەکاو دەڵێ:

(گوتییەکان) میلەتێکن سەر دانانوێنن ولاتێکی لە ژمارە نەهاتوون
ولاتی گووتییەکان، ولاتێکە هیچ بەربەستیان نابێ
(انلیل) ئەوانەی لە چیاکانەوە هێنا
خاکیان داپۆشی بە ژمارەیەکی زۆر وەکو کوللۆ
دەستیان گەیشتە دەشتاییەکان
دەتوت تۆری راوە بۆ رەشەولاخ دانراوە
هیچ شتێك لە دەستیان رزگاری نەبوو
کەسێك لە دەستیان نەی توانی رابکا
لە کۆتاییدا دەڵێ:
دەرگای شارەکانیش کەوتە ژێرخاکەوە

ژێدەر: سومر اسطورة وملحمة، د. فاضل عبدالواحد، ص٧٠.
یان لا ٤٤ هورمزی بێگلەری و. حەمە سەعید

# پێشکەش

- بە یەکەم پەیامبەری برایەتی ئاشتیخوازی کورد کــاوە وفیدراســیای گوتــی کە بە بــاوکی کــورد ویەکــەم دانیشــتوانی بەرەبــەیانی مێــژوو لــە ناوەراســتی کوردستانەوە تا دوا سنووریان لە فوراتی خواروو حوکمیان دەکرد.
- پێشکەشە بە زەردەشت و زاگرۆسی کورم و ئاڤێستا و ئاریان وئاڤــانی کچــم، بە دایکیان حەبیبەی سەرسام کە کتێبخانەکەم وون نەکەن لە پاشەڕۆژدا.

# پێرستی بابەتەکان

# پێشەکی

مێژوو نوسینەوە بۆ ئـەوە نیـە تـەنیا چـەند رووداوێـك لەتـەك یـەكدا تۆمـار بكەیت بەبێ لێكۆلینەوە،: لێكۆلینەوەش بۆ ئـەو بابەتانـە نـەهاتووە كـە ئاشـكراو دیـارن یـان چـەند كەسـێك لەسـەری نوسـیوەتەوە دووبـارەی بكەیتـەوە بـەبێ تازەگـەری. لێكۆلینـەوە پـیرۆزە چونكـە بـەدوای راسـتی گـەران و سەرخسـتنی هەقیقەتی ئەو راسیتانەیە كـە شـێوێندراون زەرەر لەراسـتی گـەورە دەدەن.. رێـز لـەسمبولی نەتەوایـەتیمان نـاگرن، ئەگـەر هـەتا دوێنـی تاكـە رێگایـەك لەبـەردەمی لێكۆلینەوە سەرچاوەكان بوون. كە زۆر بەدەگمەن و ناتەواو و بەردەست دەكەوتن ئەوا مرۆڤ ئەمرۆ جگە لەم رێگایەش دەبێ بەدوای رێگـەی تـردا بگـەرێ كەبـەرەو راستیەكانی دەبات، وەك ئەنترۆپۆلۆجیا و جوگرافیا چونكە لاوازی هەر میللـەتێك لـەلاوازی ناسـنامەیدایە مـرۆڤ داوای هـەقێك نـاتوانێ بكـات ئەگـەر بەڵگـەی بەدەستەوە نەبێت، دزینی مێژوو لەلایەن دەوروبـەرەوە دزینـی ناسـنامەیە دزینـی تاپۆی خاك و مۆركی نەتەوایەتیە بروا بەخۆبوون ئـەو كاتـە پتـەوتر دەبێـت كـاتێ مرۆڤ هەسـت بەرابردویـەكی بـەهێز و پـاك دەكـات. كـورە پاشـا لەبـەر ئـەوە واز لەتاجی باوكی ناهێنێ چونكە دەزانی بـاوك وباپـیرانی پاشـا بووینـە تاجەكـە هـی ئەوە هەر ئەم منالە ئەگەر لەمنالیەوە لەشوێنێكی دیكـەدا گـەورە ببوایـە دوور لـە هەقیقەتی روشنبیری بنەماڵەكەی ئەوا قەت جورئەتی ئەوەی نەدەكرد داوای تاجی پاشایەكی باوكی بكاتەوە ئەو نەك هەر هێندە بەهی خۆشی نەدەزانی چونكە نەی دەزانی باوكی كێیە؟

هەر لەسەرەتای ژیانمەوە كە بەگومانكردن لەهەموو شتێك چـاوم كـردەوە، ئەوەی لەماڵـەوە كـەباوكم مەلایـەكی ئـایینی بـوو فـێری دەكـردم، لەگـەڵ هەلسـو كەوتی رۆژانەی دێیە بچكولانەكەی (میركەی) كۆچەران (بلەی بارزان) كووچەكانی

هەولێر یەكدی گر نەدەبوونەوە، ئەوەی لـەو خەڵكە نوێـژ كـەرو بەئاینـەم دەدیـت بەرۆژ. بەشەو بەجۆرێكی دیكە بوون.

كاتێ لـەنێو كۆمـەڵ لـە مزگـەوت و دیوەخانـەكان. خۆیـان كۆدەكـردەوە و لەمەزهەب و ئـاین و راسـتی دەدوان– لـەدۆڵ و چیـاو نیـو رەزو باخـەكان لـەكاتی تـەنیایی و رەفتـاری بەپێچەوانـەم لێ دەدیـتن– ئـەوەی فـێری كـردم خـاك راستایی‌یە... ئاسمان حەوت چینوو تەبەقەیـە رێـزی لـەو مامۆستایە دەگـرت كـە دەی ووت زەوی خرە و رۆژناسورێ خاك بـەدەوریا دەسـورێتەوە زۆر بـەدوای ئـەو ئەجندانە گەرام كە شـەوانە چیرۆكـەكانی كـۆڕی بـەر ئـاگردانی پـێ گـەرم دەكـرا، هـەبوو دەی ووت باپـیری فلانەكـەس شـوژنی لەئەجندەیـەك دابـوو كـاری بـۆ دەكرد.... بەڵام كەسیان شاهێد عەیانی مەسـەلەكە نـەبوون.....خـەیام سەرسـام تـری كـردم، سیاسـەت و كوردایـەتی و بـەرژەوەندی تایبـەتی كارەبەدەسـت زۆر جیاواز بوون لەگەڵ سـردووەكانی نیشـتمانی تەنانـەت سـرود بێژەكـەش رەفتـاری لەگەڵ ئاینی سردووەكەی جیابوو.. هەموویان لەسەر مەزهەبی:

بەقسەم بكەن بەكردەوەم مەكەن، بوون.. كەواتە ئەگەر واقعی حـاڵ وابـێ دەبێ باپیران چۆن ژیابن؟! مێژوو چۆن نووسرابێتەوە؟ گەلان چۆن پەیدابوون و چۆن لەناوچوون؟ كێ مێژووی نووسیەوە؟!. دەورو پشت مێژوومان بۆیـێ لێ وون دەكەن كەرۆژێك لە رۆژان لـەوان بـاڵا دەسـت تـر بویـن، هـەتا جورئـەتی ئـەوەمان نەبێت داوای باڵا دەستی و حوكم بكەینەوە خاك و سەربەستیمان لەدیلیەتی رزگار بكەین، مێژوی عـەرەب مێـژووی فـارس مێـژووی تـورك زنجیرەكـانی نووسـینەوەو راستیەكانی نەپچڕاوەن بەڵام خاڵە بەهێزەكانیان بەدیار دەخەن خاڵە لاوازەكانیان دەشارنەوە كەلەهەمان كات دەبێتە خاڵە بەهێزەكانی ئێمە – كە ئەو كاتەش ئێمە داوای گەرانـەوەی مێـژوو دەكـەین. بۆیـێ: هـەموومان لەهەلقـەكانی مێـژووی گەلەكەمان ناشارەزا دەبین.. ئەگەر تەمەنمان بەقەد تەمەنی میللەتەكەمان نـەبێت

بیرەوەری و هەلس و کەوتی باپیران و سەرکەوتن و ژیرکەوتینان دەبێتە بەشێك لە بیرەوەری تەمەنی کورتمان کە لەنێو تەمەنی درێژی میللەتادایە. بۆیە دەبێ بەگومانەوە سەیری هەموو شتێك بکەین تا راستی وەدەست دەهێنین، راستیش تەنیا دەچێتە لای ئەو کەسانە کەلەهەموو کون و کەلەبەرو لایەنەکان و نهێنیەك و کاری فەلسەفیانەی دەگەن.. راستیش تەنیا لەپێش تیشکی خۆری عەقلْ و مەعریفەت بەرجەستەو بەرچاو دەبێت، ئەم هەوڵەی ئێستامان تەنیا گومانکردنێك بوو بوە هۆی دۆزینەوەی راستیەکی گەورە کە میللەتەکەم لەچەند دێرێك زێتر هیچی نەدەزانی ئەویش ئەژدیهاکی کورد کوژە کەبەلەناو بردنی جەژنی نەورۆزی نەتەوایەتیمان لەدایك بووە ئەگەر پرسیمان کێ بوو مێژووی نووسیەوە بەچ زمانێك نووسیەوە بۆ سەرخستن و سەرفرازی کێ بوو؟ ئەو مێژوو نووسەی خۆی بۆ خۆی زانسیانە بیر ناکاتەوە، چۆن دەتوانی بۆ خەلکانی دیکە بەزانستیانە بیر بکاتەوە[1] پرسیارێك دروست بووە لەلام بۆ هەر ئاینێك و بەزمانێك نووسراوەتەوە کە ببێتە هۆی پەراوێز کردن و لەناو بردنی زمانەکان و نەتەوەکانی دیکە، بۆ داگیر کەران نەیان هێشت هەر میللەتێك و لەسەر خاکی خۆی مێژووی دروست بکات بەزمانی خۆی بینوسێتەوە لەنێو ئەم خەون و بیرکردنەوانە دابووم. زولم و زۆری و ئەنفال کردنی میللەتەکەم رای پەراندم هەستم کرد مێژوو وا دووبارە دەبێتەوە چونکە بەرامبەرەکەمان لەمێژووی خۆی دەگات و کورد تائێستا لەمێژووی خۆی ناگات تا پەندی لێ وەرگرێ، بەلْکو مێژووی میللەتانی دیکە بە پیرۆز و راست دەزانێ و رۆژانە دیخوێنێتەوە. لە مێژووی خۆشی هیچ؟! ماران گەست دەبێ لەپەت

(١) شوێنەوارەکان لەدەست نەیارانی کوردبوو بۆ خۆیان بۆ بەرژەوەندی مێژووی خۆیان تەفسیریان دەکرد ئەوەی دیکەیان دەشێواند یان لێی بێ دەنگ دەبوون رێگاشیان نەدەدا دلْسۆزانی کورد لێکۆلینەوەی تێدا بکەن. ئێستاش بە هەمان شێوەن عەرەبەکان بەشێوە زمان و فونەتیکی خۆیان ئێراقیان بەعیراق تۆمار کرد کە دواتر باسی لێوە دەکەین. بەناونیشانی (ئێراق ناوو شوێنێکی کوردەواری بووە).

بترىسىٚ، ئەوانەی رابردووی خۆیان لەبیرنەماوە نازانن دوژمنەکانیان کێن، ئـەوەی ڕەگی نەپارێزێ گەلای تووشی وەرین و خۆر بەدی ناکا، لەگەڵ ئـەم شـەپۆلە پـڕ دوو کەڵ و تۆزو بایە بیابانیەش شەماڵی فێنکـی چیـا سەرکەشـەکانی رۆژهـەلات و رۆژئـاوای کـوردەواری.. بۆنـی بـەفر و سەربەستی بـۆ هێنــام، جیهانگەرایــەتی و فەلسەفە تازەکانی سەربەستی مەشخەڵی رێبەرایەتی و فانۆسـی خوێندنـەوەی بـۆ هەلیگرساندوم، تا کـوردە هـەموو شـتێك هـەموو رەفتـارێك کـە ئێسـتا دەی بینـن دووبـار بوونەوەیـەکی دیکەیـە بـەڕەنگ و شـێوەیەکی دیکـە. عـەرەبکانی جـاهلی لـەنێو خۆیـاندا لـەو کاتانـەی لـەپێش هـاتنی ئیسـلام لەسـەر بوتێکـی کەلەبـەرد دروستکرا بوو یەکتریان دەکوشت لەلای ئەوانە (سەدەنە) و پارێزگاری کردنی ئـەو بەردانە شەرەفێکی گەورەی کۆمەلایەتی بوو، کاتێ دوعاشـیان بـۆ یـەکتر بکردایـە دەیـان ووت (سـقاك الله)[٢] خـوا تـێر ئـاوت بکـات لەبـەر نـەبوونی ئـاو تاکـە کانیاوەکـەیان بـەلا پـیرۆز بـوو.. یـان دەیـان پەرسـت بـەخۆڵ و خـاك خۆیـان دەشوشت. کەلەو کودیلەهاتنە دەر وەك چـۆن لەقـەندیلی ئەفسـوناوی بێنـەدەر و گەیشتنە لێوار ئاوی شیرینی دیجلە و فورات وەك زێرو بـەلێوارەکانی وەنووسـاون هەڵکشان قۆناغ بـەقۆناغ بـەروو بارەکـان سـەردەکەوتن. نـەوە بەنـەوە وەچـە بـە وەچـە لەسـەر رووی تـری خۆیـان گونـدی دیکـەیان داگـیر دەکـرد و خەلکەکـەیان ئاوارەو بێ گیان دەکرد. هەموو ماڵ و مولك منالی ئەو کەسانە حەلال بوو کـە دژە رەفتاریان بکات. ئەو شوێنانەی نەیانتوانی بیگرن. زمانەکـەیان نیـوە روح دەکـرد نـەتوانن بـەکوردی بـیر بکەنـەوە. ئـەوەی لـێرەدا ئێمـە تیشـکێ دەخەینـە سـەر چۆنیەتی گرتنی خوارووی ئیراقی ئێستا کە پێشتر ناوی ئیراق بوو (ئـیراك) (ئـاری واك) بـەواتای شـوێنی تـەیری واق کـە وولاتـی ئـەو هـەزاران پۆلـە پـۆلی تـەیری

(٢) حسن بيرنيا عباس اقبال، تاريخ ايران، ل٦٦. بە فارسی.

ماسیگرەی سەر زەنگاو[٣] ئەهوارەکان و گۆمە ئاوەکان و دەم و رووبارو لقەکانی زەنگاوی خواروی عیراق بوو کە ئاریەکان پێ یـان دەگـوت (ئـارواق) (اراك) ئـاروك وەك ئەو شارەی کەلەخوارووی ئێرانە لەسەر کۆمـەلێك زەنگـاوەو بەهـەمان شـێوە ناوی (ئەراك) بوود بەعەرەبی بەم دورگە نێو ئاوانە و شوێنە زەنگاوانەیان دەگوت (بلاد واق واق) کە خوارووی ئێراق یەك لەوانـە بـوو ئەگـەر (بـلاد واق واق) بکەینـە کوردی یا (ئاری) کۆن کە (ئار) بەمانای شوێن دێت (چ لە ئـاریَ دانیـە) ئـەوا بـلاد واق واق) ئار واق عەرەبیش وەك چـۆن زۆر لـەم ووشـانەی گوریوەتـە سـەر شـێوە زمانی عەرەبی وەك (ئاکرە) عـەقرە سـەیری (ئـا) بووەتـە (ع) (ك) بووەتـە (ق)– یـان کرمانشـاه قرمسـین. ئـاواش اراك ئـێراق کراوەتـە عـیراق کـە زێـتر لـەم لێکۆلینەوەیە باسی لێـوە دەکـەین ئـەوان کـە هـاتن خەلکەکـە وەك هـەموو کـاتی هاتنی داگیر کەرێك مالْ و منالّی خۆیان دەستگرتووە و هەلاتوون، ئـاواش خـەلکی کوردی خوارووی عیراق (ئێراق).

بـەرەو قولایـی کوردسـتان و فـارس رایـان کـردوو هەندێکیشـیان بـوون بەموسلمان و تەسلیم بوون ئـەوانی دیکـەش هـەندێکیان گەراونەتـەوە سـەر زێدی باپیرانی خۆیان پاش ئەوەی بوو نەتە موسلمان[٤]. بەم جـۆرە هـاتنی عەرەبـەکان لە خوارووی ئێراق دەستی پێ کرد کە پێشـتر یـەك تاکـە عـەرەبی لێ نـەبوو تـەنیا ناوچەی (حیرە) نەبێ حیرە بەزمانی ئارامی بەمانای (شوێن چادر) دێت کە شوێنی کوچەرەکانی عەرەب بوو کە هاوینان دەهاتنـە لێـواری رۆژئـاوای رووبـاری فـورات ئاژەلەکانیان ئاو دەدا بەلاّم پەرینەوە لەرووبارەکان زۆر زەحمەت بوو دەگەرانەوە حیجاز هەر بەشـی ئـەم رووبارانـە سـنوورێکی سروشـتی شـەپۆلی ئـاری کـورد لـە

(٣) بروانە بەشێکی تایبەت لەم توێژینەوەیە یـان نووسـینێکمان بەناونیشـانی ئـارو ١٠١ دۆزینـەوە لـە زمان و مێژوودا، گۆڤاری هەولێر، عەبدولخالیق سەرسام.

(٤) بۆ ئەم زانیاریانە بروانە بلاذری فتوح البلدان – فتح ارض السواد (بین النهرین).

ڕۆژهەلات و شەپۆلی سامیەکان بوو لە ڕۆژئاوا.. کاتی سەرایی سوپای عەرەبەکان گەیشتە سنووری فورات هەر لەوێش کۆفە و نەجەف و کەربەلایان کردە پایتەخت زۆربەی سەرکردەکانی ئەو کاتە هەر لەوێش لەسەر حوکم و تالانی میللەتان یەکتریان دەکوشت و تەرمەکانیان لەوێیە هەر ئەو شوێنەش کە پێشتر ناوی (حیرە) بوو کەربەلاو نەجەفی ئێستایە.

ئەو کاتە کوردە (گاوانیەکان)[٥] ئەو کوردانەی کە هەزاران ساڵە لەو شوێنە جێنشین بوون و خەریکی بەخێو کردنی گاو گۆلك و گامێش بوون ئەوانە یەکەم هۆزی شارسانی کورد بوون کە پاشماوەی گوتی گاوانی و سۆمەریەکانی. وەك زۆر بەووردی بەدوای رەگی دانیشتوانی خوارووی ئیراقدا شۆربوومەوە دوور لە هەموو جۆرە لالایانی و سۆز و عاتیفەوە سەیرم کرد- پاشماوەی هەمان دانیشتوانی (ئور) و (بابل) بوو کە دەکاتە بابلیەکان و سۆمەریەکان هەمان دانیشتوانی سەردەمی هخامەنشی و ساسانی و پاشتر یەکەم سەردەمی هاتنی عەرەبەکان بووە کەلە کورد و (سۆمەر) و مەندایی و کلدان پێك هاتبوو کە مەندابییەکان ئێستا پیێان دەلێن (صائبە) و بەتەواوەتی بوون بە عەرەب و هەروەها کوردەکانی ناوچەی خوارووی ئیراق مەندانیەکان لە قوولایی ئەهوارەکان بوون چونکە ئایینەکەیان ئاینێکی (تعمد) و جۆرە پیرۆزیەکی ئاوی تێدا بوو کە زۆر بە تەقسە ئاینیەکانیان لەنێو ئاودا بوون ئەوان کەمایەتیەکی نەتەوەیی بوون وەك چۆن کلدانیە بابلیەکان هەر زۆریان نەخایاند دوو هەزار ساڵ زۆر زێترە دەسەلاتیان بەرەو ئاشوریا (سوریە) و وولاتی کەنعانیەکان باش کێشەی لێ کرد بەلام بوونی کوردەکان تا لەناوچوون بەهەزاران داستانی یەك لەدوای یەکی بینی. پێشەکی دەبێ ئەوە بزانین پێش هاتنی عەرەبی موسلمان هەزار ساڵ بوو، ساسانیەکان ئەم ناوچەیان حوکم دەکرد کە زۆر جار سنووریان هەتا میسر و یەمەن و لێواری

(٥) لە داهاتوودا بەدرێژیی باسیان دەکەین.

دەریای (ڕۆم) بوو (میدیتریان) یـان دەریـای سـپی ناوەراسـت یـان پـێ دەگـوت.. کورد لە نێو ئەم دەولەتە دەستێکی بـالأی سـەربازی هـەبوو بـەڵکو زۆربـەی زۆری سەربازەکانی لەخەڵکی دەوروپشتی پایتەختـە کـە بـوون کـە (تیسـفون) یان پـێ دەگووت یـان (مدایـن) کەبـەمانای کۆمەڵـە شـاردێت.. هـۆزی (گـاوانی) کـورد کـە عەرەب بە (جابانی) تۆماری کردووە هەر لە دوا لێواری خوارووی فـورات و لێـواری ئـەهوارەکان لـە (گرگرایـە) و (بـابل) کـە دواتـر عـەرەب دوو شـاریان لەتـەکیان دورستکرد بەناوی (واسط و حلە).. دوای موسلمان بوونی کوردەکان شان بەشانی عەرەبەکانی (الأسدیة) کە بەهۆی هێزی سەربازی عەرەب لەناوچەکە جێنشبوون.. ئیـتر بەربـەرەکانی و شـەرو ئـاژاوە و کوشـتن و بریـن بـەردەوام بـوو بـە کۆتـایی لەناوچوونی کوردەکان بوونیان لەم ناوچەیە کۆتـایی هـات، دەسـەلاتی عـەرەبیش بەهاتنی هۆلاکۆ یتر نەیتوانی ئیمپراتۆریەت و دەولەتی گەورەی دیکـە دابمـەزرێنی وەك چۆن کوردیش دوای دەولەتی ئەیوبی و هەزار ئەسـپ و هـەزبانی و رەوەنـد و زەندی کورد ئیمارەتی بچـوك بچوکـی دامـەزراند وەك بابـان و سـۆران و ئـەردەلان وبۆتان و بادینان. ئێمە لێرەدا دەگەرێینەوە سـەری سـەنتەری مەبەسـت و رەگـی گاوانیەکان و جمولیان لەخوارووی نێوان دیجلە و فورات یان ناوچەی سومەرو بابل واسط پاشان پەیوەندی نێوان ئەوان و سەربردەی مێژووی ناوچەکە بەشـێوەیەکی زانسیتانە کە دەلێم زانستیانە مەبەستمان منطقـی عـەقل و مەعریفەیـە سـەرچاوە شوێنەوارەوە ئەو راستیانەی کە هارمۆنیەتێکی روحی دروست دەکـات و هاوکـاری یەکترن کەلە هیچ شوێن و سەردەمێکی دیکەدا جێگایان نیـە و نـەبووە... چونکـە هـەر رووداوێك لەسـەر پارچـە خـاکێکی ئـەم زەویـە کـە روو دەدات سـەـردەمەکە تۆماری دەکات بەهەمان شێوە و هەمان رەنگ هەمان سەردەم دووبارە نابێتـەوە. بۆیـی لـەکاتی لێکۆلینـەوە لـەزمانی ناوچـە دەبینـین هەربۆیـەش داگیرکـەران کـە دەهـاتن کوردستانیشـیان داگـیر دەکـرد نـاوی شـارودێهاتی دەشـت و کیویـان

دەگۆری، تەنانەت وایان لەخەڵکەکەش دەکرد ناوی خۆیان بگۆرن وەك ناوی ئەوانی لیّ بکەن. بۆ ئەوەی هەست بەبوونی خۆیان نەکەن پاشان هەست بەخاکیش و مەلکیەتی خاکەکە و دەریان بکەنەوە. ئەوان دەهاتن لەدوای مهانە و خالێك دەگران دەست بەسەر خاك داگرن. دەرت بکەن ئاوارەت بکەن تەنانەت گەر بیرو بروای ئاینیەکە لەگەلّ ئەوان نەبوایە هەقی کوشتن و ژن و مندالّ زەوت کردن و ئەنفالی دەدایە خۆی، ژنەکەی دەبردی منداڵەکەی پەروەردە دەکرد بۆ جەنگ دووبارە پارچە خاکی تری پیّ بگرێتەوە پیّ داگیر بکات. کچەکانیشی بۆ زێتر کردنی نەوەی خۆی، لەولاش پیاوەکانی بەهەر بیانویەك بایە دەکوشت ئەگەر نا بەزۆری دەیناردە جەنگی نەتەوەیی خۆی پیّ بکات. ئەگینا دەستی بەسەر خاك و مالّ و مندالەکەی دادەگرت بەم جۆرە پیّ بەپیّ خاکی کوردیان داگیرکرد و لەقولایی کوردستان نزیك دەبوونەوە بەلاّم کورد هەمیشە گورد بووە و ناوەناوە راپەریوەو هەر نەبیّ توانیویەتی نەهێلّی لەناو بچێت. ئەگەر بلاوکردنەوەی هەر ئاینێك رێگا پێدراو بێت لەلایەن هەندیّ میللەتانەوە تالان و داگیرکردنی لەلا پیرۆز بیّ دوای بلاو کردنەوەی ئاینەکە نەگەرانەوە شوێن خۆیان جێنیش بوون، مانایەکی دیکە دەدات بەدەستەوە ئێمە باش دەزانین عەقلیەتی ئەم سەردەمەی دیموکراتی و سەربەستی خوازی هە موو جەنگێك مەحکوم دەکات تاکو لەسەر ئاین و بیروبرواش بێت بەلاّم ئێمە باسی جەنگی سەرەتایی ئیسلام ناکەین تا کورد بوو بە ئیسلام زێتر باسی ئەو جەنگانە دەکەین کە عەباسی و ئەمەوی دژی کوردیان دەکرد بۆ زەوت کردنی خاکەکەی سەرەرای بوونی بەئیسلام بۆ ئەوەی خاکی لیّ داگیر بکەن نەگەرانەوەی عەرەب بۆ نەجدو حیجاز دوای تەواو بوونی کارەکەیان بە بلاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام چاکریتن بەلگەیە بۆ ئەمە ئەم شەپۆلە کە داگیر کەربوون نەك نامەبەری ئیسلامی پیرۆز ناوی شار و دێهات و ناوچەکە.. بەهاناتەوە دێت و شاهێدی دەدات بۆ رەفتارەکانیان بەلاّم هەر چەند مێژوو

شێونەوار ناس ئەگــەر توێژەرێكـی زەیـرەك بێـت وەك پـارێزەرێكی زیـرەك خـاڵێك دەگرێت تاوانبار بەرەو روخان دەبات و راستیەكان ئاشكرا دەكات هەر بەم جــۆرە گرتنـی وولاتــان جۆرێكـە لـەدژی خەلكەكـەی بەهــەر نـاوو نـاتۆرێك بێـت جۆرێكــە لـەتاوان و لـە كوشـتنی بەكۆمـەڵ.. دەسـت بەسـەر شـارو دێـهات و موڵـك داگرتـن ستەمكاری و چـاوچنۆكی و درندەیـیـە... پـۆلی نووسـەرانیان بەهــەموو جۆرێــك بەدرێژایی مێژوو هەوڵیان داوە تاپۆی رەسەنایەتی وون كەن و دەنگی خاوەنی كپ بكـەن.. تـا بتوانـن.. دزیاریەكـە بخـۆن دابـەش كـەن بـەم جــۆرەش هێرشــەكانی داگیركەرانەی ئەم جیهانە لەهەموو سەردەمەكان مەحكوم دەكەین كە ناویان نـاوە (سەركەوتن). داگیركردنی وولاتان پالەوانی نیـیە لە راستیدا ترسـنوكیەكی لـەرادە بەدەرە.. بەرامبەر بەبوونی میللەتان و لاوازی خۆیان.. كـە هەمیشـە هـێز لـەكاتی لاوازی عـەقل و مەعریفـەت بەرامبـەر بــە هــێز و عــەقلی بەرامبەرەكــەی بــەكار دەهێندرێ. ئیسـلامی پـیرۆز كەجـەنگی نیـوان موسـلمانان و زەوت كردنـی خـاكی قەدەغە كردووە. مێژوو نوسینەوە دەبێ زانستیانە بێت بەلام كاتێ بەرامبەرەكەت بە چەواشە كاری دەسـت پـێ دەكـا تـۆ ناچـاری دەنگـت بلّنـد بكـەیت تـا هـەموو خەڵكی گوێ لێ بێت و بێت بەهاناتەوە.. یان هەر نەبێ ئاگاداری راستیەكان بێـت، مـن ئـەم چـەند ووشـە تونـدەم ئاراسـتەی چەواشـەكارانی مێـژوو دەكــەم كـە دژ بەمێژووی كورد كردویانە یان ئەوانــەی ژیـانی كوردیـان شـێواندوە نەیانهێشـتووە، لەرێچكەی سروشـتی و لەسـەر خـاكی خـۆی پـەرە بـەژیانی خـۆی بـدات هەمیشـە خەڵكانێك كە بەخاكی خۆیان رازی نەبوینە هەوڵی دزینی خاكی دیكەیان كردووە.. بەم زەقیە دەمەوێ هەموو ئەو پینەو پەرۆیەی بــۆ شـاردنەوەی دراندایـەتی داگـیر كەر كراوە هەڵتەكێنم و راستیەكان ئاشـكرا بكـەم، ئەگـەر كـورد بـەدرێژایی مێـژوو وەك ئەفسـانە و رووداو فلكلـۆر راسـتیەكانی دركـاندووە بـەلام لەهـەندێ سـەردەم لەترسانا تەمو مژی خستۆتە سەر كەدەبێ ئیمرۆ سەردەمێكی سەربەست و ئازادە

دەبا گرێكی دیكەی نەورۆزی نەمری هەمیشە هەڵكەین. چونكە داگیركردن و شێواندنی مێژوو دراندنی تاپۆ مولكداریەتیە بۆ دەستبەسەر داگرتن و داگیركردنی بەشەكانی دیكەی كەماوە لە دەست كوردان چونكە خاسیەتی داگیركردن هەنگاو بەهەنگاوە ناوەستێ قۆناغ بەقۆناغە سەردەم بەسەردەمە كارێكی نەوەستاوە لەخوێنی هەندێ میللەتاندا تواوەتەوە و ناتوانن دەست بەرداری بن- بەشێكە لەتوراسو فلكلۆر و ئاین و مەزهەبیان. بەشێكە لەرۆشنبیری و عەقلیەتی خۆ بەزل زانینی هیچ لەباریان بەرامبەر بەكۆشك و بالأخانەی شارستانیەتی میللەتان.

عەبدولخالق سەرسام

٩/١٠/ ٢٠٠٤ هەولێر

# بۆ زیندوو کردنەوەی
# سمبولی نەورۆز و درەفشی کاویان

ئـەم نوسـینەم وەك سـەرەتای دەسـت پێکردنـی بـەدواداچوونی نـەورۆز ومێژووەکەی لە ژمـارە ٤٧٧ی گۆڤـاری هەفتەنامـەی گـوڵان رێکـەوتی ٢٠٠٤/٣/٢٥ بڵاو کردەوە، ئەمە دەقەکەیەتی لەگەڵ چەندین وێنـەی سـومبولی بـاز بـە درێژایـی مێژوو پێشتریش لـە حەفتاکانـەوە چـەندین لیکۆلینـەوەو نوسـینم لەسـەر هـەمان بابەت بڵاو کردۆتەوە.

نەورۆز–(رۆژی نەو) رۆژی نـوو خـۆی لـەخۆیداماناو مـەدلولێکی مێژوویـی و سروشتی و جوگرافی و کۆمەڵایـەتی قـولی هەیـە وەك لـەناوچوونی سـتەمو هـاتنی سەردەمێکی تازەی ئـازادی و لـەناوچوونی سـوقمی زسـتان ویـەك رەنگـی رەش و سپی و هاتنی بـەهاری رەنگـاو رەنـگ لەهـەمانکاتدا یەکـەم ئاهـەنگی و یـەك بـیرو بڕوای میللەتێکە ئەم رۆژەش وەك بڵێی بۆ کەش و هـەوای رۆژهـەڵاتی ناوەراسـتی دانـرا بێ‌کـە لـە(٢١)ی ئـادار هەسـت بـە گۆرانکارییـەکانی ناوچـەی جوگرافیەکـە دەکـرێ، نـەك لـەبیابان و ناوچـەی عەرەبسـتانی سـعودی و ئەفـەریقیا– یـاقوتبی سەرو و خوارووی زەوی، بۆیە بەسەری ساڵی کوردی دادەنرێت. کەرێك کوردستان دەگرێتەوە.

سمبولی (درەفەشی) کـاوەی ئاسـنگەر کـە ئـەو پێشکۆشـە بـوو لـە پێسـتە دروسکرابوو پاش سـەرکەوتنی کـاوە، فـەرەیدون بـە مـرواری و زێـر رازاندیـەوە[٦] (بڕوانە فرهەنگی طلائی)یـان (فروهـر)لەنووسـینی ئـاورەنگ هـەمان رەنگـی ئـاڵای

---

(٦) بـیروڕای سـەرەتای لێکۆڵینەوەکەمانـە وەك ئەمانـەت دەسـتکاریم نـەکرد، خوێنـەر هەست دەکـا بیروڕای تازە و دۆزینەوەی دیکە دێتە ئاراوە.

كوردستان و ئـالأی ئـاری لـەوەوە رەنگـی وەرگرتـووە كەسـەوز وسـپی و سـوور و زەردە، ئێمە لێرە دا بەخێرایی وێنەكان دەخەینە بەردەست خوێنـەران بەتایبـەتی (درەفشـی كاویـان)و ئـەو بازنـەی كـەوا چۆن لـە(فروهـەر)ی زەردەشـتیەوە یـەك لـەدوای یـەككگۆرانكاری بەسـەردا هــاتووە، ئــەوەی مەبەستیشــە وەك چــۆن زۆر لەنووسەرانی جیهانی و عەرەبی وموسلّمان. لەسەر ئـەو بازانـەیان نووسـیوە وەك: لین بول مایر، ماینكە و ماریانوو گارادیل هەروەها مێژوونوسان قلقشندی،مقریزی، ئـەبو الفـداء، ئیــبن خلــدون باســی(بــازی) ئەیوبیــە كوردەكانیــان كــردووە یــا خوارزمیەكان"بڕوانە العربی ٤٩١سالّی ١٩٩٩و نووسێنەكەی (النسر) بەلأم ئاگاداری فروهەری زەردەشتی و هەخامنشی و ساسانی نەبووینە..

كە ئەم بازەی ئەییوبیەی كوردەكانیش سـەرچاوەكەی(فروهـر)ە و سمبـولی ئـەو رۆژیـش واتـا بـازی"درەفشـی كاویـان" كەئـەو جـۆرە بـازەی لەسـەر هــەمان سەرچاوەكەی(فروهر) و دواتر بازەكانی دروشمی ئاریـە كوردەكانـە لەدەوروبـەری بلأوو بووەتەوە بەم شێوە(بالّ كراوەیە) بالّپێك وەنووسـاوە نیـیە یـا بـالّ بـەنیوە كراوە، داوا لەبەرێزانی خوێنەری ئازیزدەكەین بەراوردی لەوێنەكانی ئەم بازە بكات و بۆیە كەم جاریش دووبارە كردنەوەی (درەفشی كاویـان)دەخەینـە سەرشـان بـۆ یەكەم جار وەك سمبولێكی نەورۆزو جەژنەكەی دروشمی خۆی دووبـارە بكرێتـەوە كەقولّیەكی مێژوویی و پرشانازی بەرەسەنایەتی كردنی جێگیر دەكات.

ئەم نووسینە پێناسەی لێكۆلّینەوەیەكی تێروتەسەلە لەبەردەستمایە.

***لێرەدا دەقەكە تەواو دەبێت وەك ئەمانەتێكی زانستی.***

تێبینی:

١. لەوێنەی بەرگی ژمارەی ناوبراوی (هەفتـە نامـەی گـولأن) درەفشـی كـاوە چـوار رۆژو گولّـی چـوار پـەڕو گەردونـەی چواركـژ وزەمــان نیشـان دەدا. چـوار

رەنگەکەی ئاڵای کوردستانە سەوزو زەرد ورۆژەکە، هیــوادارم لەبــەهارو نــەورۆزی داهاتوودا لەشوێنەکانی ئاهەنگ و رەسمیدا هەڵبدرێ.

٢. پاش لێکۆلینەوە وە لەسەردەمی گوتی‌یە کوردەکان لە وولاتــی سـۆمەردا وێنەی (بازی) باڵکراوەی بەهەمان چەشــنی نزیك لـە چەشـنە بـازی (فروهـەر)ی زەردەشتیان و بازی ئەیوبیانم بەرچاو کەوت بەڵام بە جیاوازی ئــەوەی بازەکـەی سۆمەریان سەری وەك شێرە بەهەرحاڵ بازێکی باڵ کراوەیە هەمان چەشنە بازە دەبێتە بنەماو سەرچاوەی بازی درەفشی کاویان – (ئاڵای کاوە)و نەورۆز.

٣. وەك بەڵگەی رەسەنایەتی ســومبولی (بـاز) یـان هـەڵۆ لـە کوردەواریـدا لـە ئەفسانەو چیرۆکەکانیدا بەختی لەسەر تەختی دانیشتنی پاشایی لەدەستا بــوو، چونکە کاتێك بیان ویستبووایە شاهەنشا یــان مـەلیکێك بۆ وولاتێـك هـەڵبژێرن. بازیان هەڵدەدا ئاسمان لەســەر ســەری یـان شـانی (کــێ) بنیشــتبوایەوە دەیـان کردە (شا) و گەورەی ناوچەکە کەواتە (باز) دەبێتە سومبلی شاهانە پەیوەندی بــەم چــیرۆك و ئەفســانەیە هەیــە کــە ئەمــەش لەســۆمەریەکانی ســەردەمی گوتیەکانەوە دەست پێدەکات کە بەهەزاران ساڵ بەر لەئێستا بوو.



الإله ننكرسو إله لكش يمسك بيده طائر
الصاعقة (أمدوكد)

سمبولی سۆمەریان هەمان سمبولی رەفشی کاویـان بـە شێوەی ســەرەتایی و بەیـەك چـوو

# ئێراك (ئێراق)
# ناووشوێنێکی کوردو ئاری بووە

ئەگەر شوێنەوار شاهیدی رابردووە زمان لەلای من شاهێدو رابردوێکی زیندوو بەردەوامە پێشەکی ووشەی ئیراق ئیراك – ئار واق ئارواك ووشەیەکی کوردیە. بەخواروی عێراقی ئێستایان دەگوت. کەناوچەیەکی پر گۆم و زەنگاو و قامیشەلان بوو کە جێگای هەزاران پۆل تەیری ماسیگەرەبوو کەپێی دەگوترێ (واق) واق واق – واك بەکوردی ووشەی ئار– ئێرە–(چ لەئاریَ دانیە) هەوار = هاو + ئار = هاو = شوێن[٧]. شار = شاه + ئار شوێنێکی گەورە (ئاری) بەمانای ئەو کەسانە دێت کە خەڵکی ناوچەیەکەن بەووڵاتەکەیان دەڵێن (ئار) بۆیی ئاری بەمانای دانیشتوانی ئارەکە دێت – هاوشوێن نمونەمان بۆ ئەمانە زۆرە وەك ئاربل– ئارابخا (کرکوك) ئارماوان گوندێکە نزیك ئاربل – ئاری سیدەکان – ئاری مەندان – لەتەك هەریرو باتاس – ئار گوش– ئارتووش لەبادینان – ئاران دۆلی ئاران – ئاردەلان – ئارموش – گوندێکە لەسیدەکان ئار ئارات (ئەرارات) ئاربت (ئاربەد) لەسلیمانی و لەزاخۆ گرنگترین ووشە (ئێرە)یە بە مانای شوێن دێت ئەم شوێنە جێگای گەهی فارسی وە ئێرە – ئێرە ناوی چی‌یە، کە لە (ئار)ەوە هاتووە (ئێراك) – هتد. ئەمە ئار وەك پێشگر بەڵام ئار وە پاشگرێك لەو ناوانە بەدیدەکەیت شار = شاه+ ئار شوێنێکی گەورە – ئاری شاهانە کە جیایە لەگەڵ

---

(٧) بڕوانە ئارو سەدویەك دۆزینەوە لە زمان ومێژوودا – گۆڤاری هەولێر –ژمارە(١١)ساڵی ٢٠٠١ عەبدولخالق سەرسام یان بەشێك لەم لێکۆڵینەوەیە.

گوندو دێهات ، شـنگار ، بـەهار= بـەه+ ئـار، شـوێنێكی (بـەه) واتـا خـۆش، (وار) هەوار = هاو + ئار كەلەسەرەوە باسمان كرد، گوڵزار + شوێنی گـوڵ زایـین، زەرزا ئاری ئاری زەزایان. بازار = باز + ئار شوێنی كرین و فروشتن بازی لەسەر شێوەی دەست بازی، یان وەك شوێنی وازی و ئارەزوو فێركردت و بەهەزاران ووشە و ناوی دیكە كەدواتر بۆ خوێنەر دیاردەكەوێ.. كەئەمـە بەڵگـەی هـەبوونی رەگـی (ئـار)و ماناكەیتی لەزمانی كوردیدا بـەلاَم لـەهیچ زمـانێكی دیكـە دا نیـە تـەنیا زمانـەكانی ئاری نەبێ كـە كـورد– سـەرچاوە و قولایـی ئاریانـە.. بەبەڵگـەی كـە دەڵـێ وەرە (ئێرە) ئیران – ئاریان. بەلاَم فارسـەكان دەلێـن (بیـا ئینجـا) (گـە) بـەكاردەهێنن بـەمانای جێگـا شـوین دێـت كـە وەك عبیـدالله ئـەیوبیان دەلی ئەوانـە پـەراسـوی ئاریەكانن بەواتای دەورپشتی كورد – شارەكانی ئیراق – ئاریدو، اور (ئور) كەلە ئـارەوە هـاتووە بـەمانای شـوێن شـار (معسـكر) پاشمـاوەی سـۆمار سـۆم + ئـار (سۆمەری)یەكانی كوردە بـەرای مـن وەك دەزانـی (س) و (ز) جێگۆركـی دەكـات سۆم ئار (سومەر) لەزوم ئارەوە هـاتووە یـان هـەمان مانـا دەدات بـەمانای شـوێن كۆمەڵێك چادر و رەشماڵی كـە ئـەو شـوێنە زسـتان هـەواری كوردەكـان بـوو وەك (ئەهوان) شوێنی هۆزەكانی خۆزستان هۆزستان بوو لەزستانان كە گەرمیان بوو بۆ كۆچـەكان. ئێسـتاش ناوچەیـەكی كوردسـتانی خـوارووی بەرامبـەر بـە خـوارووی ئێراق ناوی (سۆمارە).

لێرەدا من گەورەترین بەڵگەی ئەوە دەهێنـم كـە سـامیەكان لەوانـەش ئارامیـەكان بەزمانی خۆیان هەمان ناویان لەناوچەی سۆمەریەكان نـاوە كەبـەدێی لای خۆیـان بـەلای رۆژئـاوای فوراتـەوە كـە شـوێنی چـادر نشـینی عەرەبـەكان بـوو – پـێیـان دەگـوت (حـیرە) حـیرە بـەمانای شـوێنی چادرنشـین[8] یـان كۆمەڵـە چـادرێك

(٨) حسن بیرنیا و عباس اقبال، تاریخ ایران ص ١٩٨ لەسالی ٦٠٢ خسرو بەرویز مەلیكیەكانی لەناوبرد كە لە حیرەبوون.

لەكۆردیشدا زۆم بەمانای هۆبە، كۆمەڵە رەشماڵێك لەدەوری یەكتر –سۆمار بەمانای شوێنی هۆبە و كۆمەڵە رەشماڵی كۆچەرانی كوردبووە لە ئێراق لەدەوروبەری زەنگاوەكان لەناوچەی (بابل) پاشان جێنشینی بوونی بەشێك لەو كوردانە كەبە بەخێوكردنی گاو گامێش خەریك بوون پیّیان دەگوترا گاوانی كە گەورەترین هۆزی كورد بوون لەناوچەكە لەسەر رووی بەغداوە هەتا (ابله) كە ناوی بەسرای ئێستا بوو هەروەها لەنێوان فورات ودیجلە و ناوچەی (واسط) كەشارێك بوو كاتێ عەرەبە موسلمانەكان هاتن لەگەڵ (حله) دروستیان كرد... ئەگینا شاری (گەرگەرایا) لەوێ بوو لەتەك كوت و (واسط) گەر گەرایەشی هەر بەمانای كۆچەرێ و گەران دێت یان شوێن ئەوانەی دەگەرێن بەدوای پاوان بۆ ئاژەڵەكانیان مینورسكی دەڵی (جاف) ەكان پاشماوەی گاوانیەكانن... ئەمە لەدواتر باسی دەكەین، بەلاّم ئەوەی گرینگە حیرە = بەمانای شوێنی چادرەكانی – یاچادرنشین بەزمانی ئارامی. (زۆم ئار) سومار بەهەمان مانای شوێنی زستان ئاری (زم ئاری) ئاریان بەزمانی كوردی یە كەپێشتر سومەریەكان و كورد لەوێ جێنشین بوون چونكە ئەوەی تۆزێك بەووردی بیر بكاتەوە چیاكانی زاگرۆس و پێدەشتەكانی لەلێواری دیجلە جیگای كۆچەرەكانی كورد و میللەتی كوردە هەر لەدێر زەمانەوە هەر ئەوانیش لەبەفرو سوقمی زستان لەچیاكان دا هاتنە لێوار دیجلە و فورات بۆ پاراستنی مەرو مالاتەكانیان تەواوكەری یەك بوون كە هەر دوو شوێن لەتەك یەكن وە هیچ رووبارێك رێگای نەدەگرتن وەك چۆن رووباری فورات رێگایەكی سەخت بوو لەبەردەم پەرینەوەی كۆچەرە عەرەبەكان كە سنووری ئەوان رۆژ ئاوای فورات بوو بەدریژی مێژوو نەیان دەتوانی ئاژەلەكانیان بپەرێننەوە چونكە نەیان دەتوانی پرد دروست، بكەن یا كەدروستیان كردپارێز گاری بكەن :: كەدروستكردنی پرد لەسەر رووبارێكی وابەرین تەنیا لەم سەردەمەدا دەكرێ و بەس كاتی خۆی زۆر بەزەحمەت بووەو لەمێژوودا نەهاتووە پردێك لەسەر فورات دروستبكرێ. چونكە

تەنانەت لەم بیابانە بەردیش نەبووە لەسەریەکی دابنێن بۆپەرینەوە. وەك لەناوچە شاخاویەکاندا هەیە تەنانەت رووبارەکانی نێو کوردستانیش بوونە هۆی پەیدا بوونی فرەشێوە زمانی. ئارامی و ئاشوری و سامیە عەرەبەکان کە هاتن ناوەکانیان گۆری هەندێکیان بەپێی ماناکان وەرگێرایە سەر زمانی خۆیان وەك سۆمار بە حیرە(میثبالو)بە (جەزێرە)کەبە ناوچەی نزمەکەی بێ دەشت و زستان هەوار نشینەکان کورد دەگوترا ئێستاش کە دەڵێی دچمەسەری یان لەچیاکانەوە دەچمەخواری–کەواتە وا بەسەرویان دەگوت زۆزان –کوێستان بەزستان هەواریش (جەزێرە) جە(جیگا) زێرە بەفارسی ژێرە دێت یان عەرەبەکان لەبەر نەبوونی پیتی (ژ) کردیانە (زێرە)و ناوەکەیان لەگەل(جزیرەی)عەرەبی گونجاند و تۆمار کرد بەلام ئاشوریەکان ناوەکەیان بە هەمان مانا گۆریە سەر زمانی خۆیان بەناوی خاکی میسل میثبالو کەمانای (الارض الواطئة او السفلى) دێت هەمان مانای (جە + زێرە)ی کوردیە یان فارسی، پاشان عەرەبەکان ناوە ئاشوریەکەشیان گۆری کردیانە موسل میسل مثبالو وە کردیانە (موصل) بەمانا لەگەل زمانی عەرەبیدا گونجاندیان تەعریبیان کردووە، وەك چۆن (ئاکرە) یان لەگەڵ ووشەیەکی پێك چووی عەرەبیان گونجاند کردیان بە (عقرە) گورینی پیتی (ئا)بە (ع) (ك) بە(ق)وەك (اراك)چۆن کردیان بە (عراق). کە تائیستاش لەخوارووی ئیران شوێنێك هەیە لەسەر زەنگاو ئەهوارە بەناوی (اراك) ئارواك – ئارواق کەناوی شارەکەشی هەیە بەو ناوە نراوە اراك، ئیراق بەمانای شوێنی تەیری ماسی گرە بەکوردی واق – واك = تەیری سپی ماسی گرەیە کە شوێنانەن زەنگاوەکانی خوارەوە بوو بەهەزار هەزاری پۆڵ پۆڵ لەسەر خواردنی ماسیە ووردەکان دەژیان پێش ئەوەی مرۆڤ زیاد بکات وە تەنگی پێ هەلچنی بۆ یێ ئەم شوێنانە لە (الف لیلة ولیلة)[9]

(٩) الف ليلة وليلة – جزائر واق – (أي ارض الطيور) وذلك من شدة صياح الطيور ص٧٧٢ الف ليلة وليلة مجلد /٣ او كما جاء في ص (٧٧٣) في الجزيرة السابعة والى الجزيرة الكبيرة من جزائر واق فاننا

بە (بلاد واق واق ) ناودار بووە – گەر تەرجمەی بكـەین دەبێتـە ئـارواق ئـیراق بـە فۆنەتیكی عەرەبیەكەی بووە (عـیراق). عەرەبـەكان بەسـەر هـەمان شـێوە شـاری (نەوكرد) یان گۆری بە (الحدیثة)[10] كە لە خوار (موسـل) میسـل مثبـالو دایـە یـان خوار ئەرزی یان خاكی جە (زێـرە) بـەمانا مثبـالو میسـل كەنامۆیـە دوو ناوەكـەی عەرەبی موصل و جزیرە كە تعریبكردنی مثبالوو و جێ زیرەیـە ئێسـتاش خـانووی جـەزیرە بـەو خانووانـە دەگوتـرێ لـە گـەرمیانی كوردسـتانا سـەری بـە شـێوەی سێگۆشەیی دروست كراوە مەبەستمان سەری خانووەكە راست نییە.

بەلای سۆمەریەكانیش تەنیا بەهەرە خوارووی ئیستای ئیراقیان دەگوت ئور كەلە تەوراتدا بەشێوەی (ئوروك) (ئاراك) لەتەوراتدا بە (ئـارك) هـاتووە بەشـێوەی (ئارك )[11] هاتووە – كەواتە هەمان بنەمای ناوی ئیراقن وەك = ئوروك – عـوروق – عیروق. عیراق یان وەركا (وارگاه) شوێنی هەوارگایە. یـان شـاری ئـارخ = ئـارك كەناوی لەسفر الخلیفە (١٠/١٠)ەی تەوراتدا هاتووە كەبەشاری (ئوروك ی سومەری تێدەگەن ئێستا بـەناوی (وركـا)[12] یـان نـاوی شـاری (اریـدو) (ئـاری دو) لەسـەر هەمان شێوە كەبەلگەی بۆ چونەكەمان دەسەلمێنێ دەربـارەی (ئـارو سـەدو یـەك دۆزینەوە لەزمان و مێژوودا) بروانە گۆڤاری هەولێر ژمارە (١١)ی سالی ٢٠٠١.

لەئیران شارێكی سەر زەنگاو ئەهوار هەیە ناوی (اراك) (ئاراك) كەبەرای من لە بەر ئەوەی لەسەر زەنگاوە هەمان مانا بەخشە كە ئاری واكە..

كە عەرەبە موسلمانەكان هاتنە خواری ئیراق (ئارواك) ناویـان لێ نـا عـیراقی عەرەبی بەبەشەكەی لای ئیرانیان گوت ئیراقی عەجەمی. نەك فارس كە مەبەسـتی

---

من هنا الى ارض الطيور قصة حسن البصري ليلة (٣٧٦)– ط. المكتبة الحديثة.

(١٠) بروانە – لسترنگ بلدان الخلافة الشرقية. بە تايبەتی نەخشەكانی.

(١١) بروانە حسن بيرنياو عباس اقبال – تاريخ ايران ص ٢٤

(١٢) معجم الاعلام باشكوی سومر فنونها وحضارتها اندری بارو.

عەرەب لەو سەردەمە کورد بوو + فارس چونکە فارسیان ناسی بوو بەهۆی سلمان الفارسی. دواتریش دواسنووری ئێراقی عەرەبی هە تا تکریت بوو بروانە نەخشەکانی (بلدان الخلافه الشرقیه). بەشێك لەسەر رووی ئێراقی عەجەمی کە پێشتر ناوی (بلاد الجبل) بو کرمانشاه و دەوروبەری.

سۆمەرییەکان بە (مەلیك) یان دەگوت (شار) کە هەر مانای کوردی دەگرێتە خۆی -شاه +ئار = شاهی ئار بەمانای مەلیك دێت شای ناوچەکە.

بۆ سەلماندنی ئەوەی کەناوی (ئور - ئارەك - ئارواق- ئاریەوەك سبایزەر دەڵێ کە گوتیەکان پێش سۆمەریەکان لەم ناوچانە ژیاوەن. کەواتە ئەوان ناویان لەشوێنەکان ناوە(ئەوان دانیشتوانی پێشووی ناوچەکە بوون) ئەم چەند ناوەی شارەکانی ئێران دەخەینە بەرچاو کەهەمان ناویان ئارین نزیك لەهەمان ناو وەك (خارك) جزیرة الخلیج - (لارك). یان عراق (اراك) شارو ناوچەیەکە لە سولتان ئابادی ئێستا لا٢٩٨ لا٢٩٩ لا٣٠٠ بابل - سەرووی تاران لا ٣٠١ لە کتابی (اطلاعاتی عمومی)[١٣] چاپی سەردەمی شاهەنشاهە.

لە کۆتایدا دەڵێن کاتێ سپایزەر دەڵێ گوتیەکان پێشی سۆمەریەکان لە ناوچەکە بوون، ناوچەی ئارۆك ئەوان ناویان لێنایە ناویان لە شوێنەکانیدیکەش نایە کە بە پێشگر و پاشگری (ئار) دەیانناسینەوە، سۆمەرییەکان هاتوونەتە سەر ناوچەو ناوەکانیان بۆیە پێشگرو پاشگری (ئار) بەزەقی لە ناوەکانیان ڕا دیارە وەك (ئار - ئۆر - شار- سۆم ئار(سۆمار -سۆمەر - وارگا - وەرکا ) یانیش هەر زمان سۆمەریش نزیك بووە لە زمانی کوردی لەگەڵ گوتیەکان لێك گەیشتوون بەمانای شێزوەزمانی ئاری بووە. من لێرەدا هەردوو حاڵەت بەراست دەزانم.

(١٣) عنایات الله شکیباپور - اطلاعات عمومي - یان دائرة المعارف اجتماعي- با مقدمة دکتر ضیاء الدین سجادي - کتاب فروشی اشراقی- فارسی ص ٣٠١.

# ناوی هەندێ گوندو شارۆچکەی ئێراقی کۆن کەناوەکان ئاری کوردین (یان عەرەبی نین)

١- بغداد-bagdata.bagdata-Bagdatti ناوی خواوەندێکی ئێرانیە لەسەردەم و کاتی کۆندا لەسەدەکانی ٧-٨ی پ.ز، بڕوانە لا ٧٣٥ میدیا.

٢- کلوازی- لەتەك بەغداد بەلای خوارویەوە لەسەرزێی دجلە بەرای مـن کەلوزی شاری میرانی سۆرانە بۆیە پێیان ووتووە میر کەلۆس کە لەبەغداوە هاتووە خەڵکی کەلوازی بووە بووەتە کەلوازی نەك کەلۆس بووە وەك هەندێ مێژوو نووس بە هەڵە تۆمارییان کردووە بەمە بۆمان روون دەبێتەوە میر کەلۆس لە کوردەکانی کەلوازی بووە کە ئەم شارە هەموویان کورد بوون لە خوارووی بەغدا.

٣- باجسری- گوندێك بوو لەسەر نەهرەوان بەمانای بان جسر.

٤- بادرایە- (بندنجین-مندلی ئێستایە).

٥- ماذرایە - دواتر ناوی بووە قریە صالح - نزیك بغداد).

٦- گرگرایا (جرجرایا) - لەنزیك نەعمانیە بوو- گورستانی ئەمیرەکانی گاوانی لێ بوو((بڕوانە گاوان القبیلە الکردیەالمنسیە)

٧- کوثار-لەدەرەوەی بەغدا بوو، کوت + ئار = شوێنی گوتییان.

٨- درزینجان- گوندێکی گەورە بوو لەخوارووی بەغدا بەلای رۆژئاوای دجلەوە ((مێژووی ئیبن ئەل دبیثی کمبرج ورقە (١٩) بلدان یاقوت٢/٦٢٧. دڕ + زێ + نگان.

٩- درزێجە دەر + زێ + جە.

١٠- دیجلە - ذیگلە - زێگەلا - گەلەزێ

١١- حیرە بەزمانی ئارامی بەمانای چادرنشینی دێت

١٢- رووباری (تیری) نزیك هەوێزە (حەوێزە).

١٣- نهرەبان- لەخوارووی واسط ((بروانە نەخشەی عیراق- بلدان الخلافە الشرقیە لسترنك ص٤٠))

١٤- کسکر: لە واسط هەمان سەرچاوە

١٥- کوتی خوارو بەغدا هەمان سەرچاوە

١٦- براز روز - هەمان سەرچاوە

١٧- خانەقین هەمان سەرچاوە

١٨- باقوبا-(بان کوە بان) نەخشەکە هەمان سەرچاوە

١٩- تیسفون- بەغدای کۆن شوێنی کیسری.

٢٠- قەسری شیرین

٢١- جەلەولا - جەهـ - لەو + لا

٢٢- برکوار خوارووی سامراء

٢٣- شاذوران + شا + زەروان

٢٤- نهر سابس (سێ + بز ) لەسەر کێشی دوبز = سێ باز دوو جەزیرە لەناو وەك بەردە بازی پەڕینەوە.

٢٥- دەستمیسان ص٣٣٥ بلاذری

٢٦- الابلە (ئوبولا) بصرەی ئێستا.

٢٧- فورات (فورائورت - ناوی پاشایەکی میدی بوو) کە سنووری گەیشتە رووبارەکە وە بە دەها ناوی دیکەی مێژوویی پێش هاتنی عەرەبی ئیسلام.

تێبینی: هەندێ ناوی دیکەی وەك ناوەکانی کۆنی ناوچەکە یان بین النهرین.

٢٨– خارك: دورگەیەکی بچوکە لەکەنداوی عەرەبی ص٢٩٨ اطلاعاتی عموس.

٢٩– لارك: دورگەیەکی بچوکە لەکەنداوی عەرەبی ص٢٩٨ اطلاعاتي عموس

٣٠– اراك – ئەراك (ئیراك) ناوی سابق سلطان ابابودص٣٠٠ اطلاعاتی عموس طریم.

٣١– بابل – شارۆچکەیەکە لەسەرووی تاران بابەبڵ.

٣٢– ارومیة رضائیة

٣٣– ارابخا – گرخینی(خانەی گڕ) کرکوك (گڕگوك)

٣٤– ارگوش

٣٥– ارتوش

٣٦– ار+ارات.

٣٧– ارکیش – نزیك خابوور

٣٨– اورنمو

٣٩– ننار

٤٠– اورننگریو

٤١– اورنینا

٤٢– اوردن، ٤٣، اورننغرو.

٤٣– اورکیش

٤٤– اورکا

٤٥– اوربلوم (هەولێر) اربل– اربیل.



کوشتنی رۆژ پەرستێك



گایەك لەلای فیرعەونیەکان بەهۆی ماری سەر نێو چەوانی پیرۆزی و خواوەندایەتی وەردەگرێت
سمبولی تێکەڵ بوونی شارستانیەتی بەینە نەهرێن و نیلە

# ناوچەی سۆمەر و بابل
# شوێنی رووداوی کاوە و ئەژدیهاك بوو
# یان بەم جۆرە لەراستیەکان نزیك بوینەوە؟!

ئێمە هەموومان دەزانین ناوچە و شاری بابل و دەوروبەری لەسەردەمی ساسانیان لە دەستی کوردە ئاریەکان بوو بۆ ماوەی نزیکەی هەزار ساڵ پێشتریش لەژێر دەستی هخامنشیەکان بوو پێشتریش بەدەستی عیلام و کاشی و گوتی و میدیەکانەوە بوو کەلەو سەردەمەدا و پێشتر بۆ ماوەیەك بابلیەکان ناوچەکەیان حوکم دەکرد پێش ئەوانیش سۆمەریەکان ئەوەی لێرەدا دیارە بابلیەکان سامین بەلاّم سۆمەریەکان سامی نین وە هیچ کەسێکیش نەیتوانیوە بلێ سامی بوون بەلاّم شتێکی سروشتیە کەوا خەلّکی ناوچەکە بن کە کوردی لێ جێنیش بووە بەهەزار ساڵە لەوانەش گوتی ئیلامیەکان کە پاشماوە شوێنگریان کوردە لورەکانیش گاوانیەکانی ئەوەی لێرە مەبەستە ئەوەیە ئەگەر چی بابلی هاتنە سەر حوکم بەلاّم مانای ئەوە نیە سۆمەریەکان کۆتاییان پێهات خۆ ئەگەر کەسانێك هەبێ ئێستا خۆیان بەبابلی دابنێن کە کلدانی ئاشوریەکانیش هەروەکو وان دەپرسم کوا سۆمەریەکان و کێن پاشماوەی ئەوان کێ بوون بۆ نالێن کوردەکانن کە کۆنترین دانیشتوانی ئەم ناوچەن بەڵکو بابلی و ئاشوری هەموومان دەزانین لە بیابان و لەلێواری دەریای سپیەوە هاتوون. ئەوەی مەبەستە ئەوەیە کەچۆن کاوە(بابلیە) یان خەلکی ناوچەیەکی دیکەیە وەچۆن دەتوانین ئەمە بسەلمێنین لەو کاتەی هەتا ئێستا کە هیچ مێژوو نووسێك نەیزانیووە رووداوی کاوە لەکویی رویداوە وەکاوە خەڵکی کام شوێن بووە ئێمە راستە پشتمان بەچەند

ـــەرچاوەیەك بەسـتووە، بـەلاَم ڕێچکـەی هـارمۆنی زانیاریـەکان و هەلقـــەی یـــەك ـەدوای یـەکی ڕووداوەکـان ژیـانی ناوچەکـە زۆر بەلامانـەوە گرنیـگ بـووە - وەك بەلَگە و پالپشتی بۆ چوونەکە مان، پاشان هەر ئەمەش دەبێتــە هـۆی دۆزینــەوەی هەلقەی دواتر و هەلقەکانی پێشووتر ئەگەر هاتوو (کاوە) نامۆ نەبوو لەناوچەکە وە ـەبەلَگە مێژوویەکانی سەلماندن. جاری لەپێش هـەموو شـتێك هیـچ سـەرچاوەیەك نیە بلێ کاوە خەلَکی فلانە شـوێنە کەواتـە لێکۆلینەوەکـەی ئێمـە ئـەنجامی ئـەوە دەدات بەدەستەوە کەیەکەمین جارە بلێین کـاوە کێیـە کـە مەبەستیشـمان تـەنیا ڕاستیە ڕاستی و بەس کە ئەم ڕاستیەش دەبێتە هۆی دۆزینەوەی زۆر ڕاستی دیکە یان زۆر هەلقەی وونبووی یەك لەدوای یەك و ورو ژاندنی ڕابــردووی چـەندین هـەزار سالَ بەر لەئێستا.. کە ڕووداوێکـی ڕاسـتی تێکـەلَ بەئەفسـانەبووە. لـە پێشـەکیدا وتـەی سپایزەر بەبیر دەخەینەوە کەدەلێ: نەوەی گوتیەکان پێـش سـۆمەریەکان لەوولاتی (ئارۆك) لـە خـوارووی ئـیراق بـوون [١٤]. ڕاسـت دەکـا شـوێنەکە هەمیشـە شوێنی زستان هەواری کۆچەرەکانی کوردی زاگرۆس بووە.

ئەمەش بەلَگەو هەنگاوەکانی بەرەو ڕاستی:

## بەلَگەی یەکەم:

زوحاك بەگوێرەی ئەم بەلَگەیـەی (برهـان قـاطع) باسـی دەکـا و دەلَـی: لـە پاشی نمرود زوحاك لەبابل قەلاتێکی دروسـت کـرد لـە پـاش ئـەویش مەلیکـەکانی (کنعان) ئەوێیان کردە پایتەخت، کەواتـە زوحـاك پایتـەختی لـە ناوچـەی سـۆمەر وبابل بووە.لەوێ حوکمی کردووە زولمی کردووە هەر لـەوێش گەنجـەکانی کـوردی سەر بریوە ئێستا خەرابەیەکە بڕوانە لا ١٣٩ لا ١٤٠ برهان قاطع ئەمەش دەقەکەیە بەفارسی:-

(١٤) هاورێ باخەوان کوردستان نیشتمانی یەکەمینی سۆمەرییەکانە لا ٨٩.

پاش ئەوەی دەڵێ:

(بابل لەنیوە راستی عیراقە (قینان بن انوسی بن شیث علیه السلام بناغود بوو، وبعد از ان نمورد و زوحاك علوانی انـرا دار الملك خـود سـاختند و ضحـاك در انجا قلعه ای ساخته بود انرا کندزو بهشت کنگ نام نهاد بعد ضحـاك ملـوك کنعـان انرا دار الملك خود کردند وبعد ان نیزخرابشد. اسکندر ذو القرنین تجدید عمارتش کرد واکنون باز خراب است. واز توابع شهر حله است) (١٥)

لـەم بەڵگەیـەش روونـتـرو ئاشـکراتر ووتەکـەی (دیـاکۆنۆف)ە لـە لا ٦٣٨ کتێبەکەی دەڵێ (ئاژدیهاك) خەلکی وولاتی بابلە(١٦).

## بەڵگەی دووەم:

زوحـاك عـەرەب(١٧) بـووە کەبەمەسـامی بـووە زۆر مەنتقیەکـە (بـابل) لەسنووری عەرەب و عەربستان و ناوچەی (حیرە) نزیکە بەڵکو رووبـاری فوراتیـان بەینە ئەگەر پاشایەکی عەرەب یان سامی بەهەموو میتولوژیایەوە بپەرێتەوە بـابل و سۆمەر داگیر بکات خەڵکەکـە وای لێ بکـا مارەکـەی بپەرسـتن، یـان گەنجـەکانی کورد سەربڕی بۆ خواردنی مارەکانی ئـەوا دووبـارە هۆیـەکی منطقـی و پێچـووە. چونکە لەو سەردەمەدا و لەهەموو سەردەمێك دەبـێ سـەرکردەیەکی عـەرەب یـان ماسی پایتەختی شارێکی سەرسنووری وولاتێکی داگیرکراوی بێت بـۆ نزیـك بوونـی لە هیمداد و هەلاتن و رزگار بوونی لەمەترسی وەك چـۆن بەهـەمان شـێوە ئیمـامی عـەلی و حسـن و حوسـین و سـەرکردەکانی عـەرەبی بۆ جـاری یەکـەم لـەلێواری رۆژئاوای فـورات لـە کەربـەلا و نجـف دانیشـتن و پایتـەختیان دانـا تـاکو ئیراقیـان لەخـەڵکی ناوچەکـە بـۆ خۆیـان پـاککردەوە یـا زاڵ بـوون بەسـەر هـەموو جـۆرە

(١٥) برهان قاطع لا ١٣٩–١٤٠.

(١٦) دیاکۆنۆف میدیا و. برهان قانع لا ٦٣٨.

(١٧) دکتور عبدالله رازی تاریخ کامل ایران ص٤

ـوچەکە بۆ خۆیان پاککردەوە یا زالّ بوون بەسەر هەموو جۆرە بەرخودانێك ئینجا ـیتەختیان سەد ١٠٠کیلو مەترێك گواستەوە بۆ بەغدا بەگوێرەی‌ئەمە لە (حیرە) ـەلیکی عەرەب دادەنیشت کەواتە زۆر ئاساییە کە زوحاك عەرەب بووە یان ـەتەوەیەکی سامی نەژاد لەبابل یان لەدەوروبەری دانیشتبیّ و کردوبێتە پایتەخت هەر دوو خالّ یەکتر دەگرنەوە و لێکتر نامۆنین جگە لەوە کە هیچ رێك کەوتنێك نیە لەنێوان ئەم دوو نووسەرەدا لەوەی نەووتراوە زوحاك ئەژدیهاکی هیندی لە پایتەختی بابل بووە کە هەرگیز لەو سەردەمیدا ناگونجیّ چونکە بابل لەسەر سنووری عەرەبە نەك هیند وەك چۆن سەلجوقیەکان (همدان) و مەغۆلەکان (مراغە)یان کرد بە پاتیەخت لەخۆیان نزیکتر بوو لەوەی بابل بکەنە پیتەخت. بفەرموون ئەمەش دەقەکە بەفارسی (برحسب روایات فردوسی ضحاك عرب بودە و ظلم وجود پیشە کودە است) بروانە ص٤ کتیبی تاریخ کامل ایران لەنووسینی دکتور عبداللە رازی[١٨]

ئەو دوو بەڵگەیەی لە سەرەوە باسمان کردن تەواوکەری یەکن واتا دەبنە بەڵگەی حاشا هەڵنەگر و چەسپاوەن.

## بەڵگەی سێهەم:

کاوە خەلکی شاربووە وە لەم ناوچەیەش بەڵکو لەو سەردەمەدا تەنیا (بابل) و ئور شاربووە چونکە وەك ئاشکرایە دەڵێن کاوە ئاسنگەر بووە ئاسنگەریش پێشتر لەشار دادەنیشیّ، چونکە کارێکی پیشەسازیە لەو کاتە تەنیا لەشارەکانی سۆمەرو بابل وەشاوەتەوە لەو سەردەمەی خەڵکی هەمووی رەوەند و

(١٨) ئەم ووتەیە لەگەڵ ووتەکەی دیاکو نوف – میدیا – وەرگیرانی برهان قانع ص ٦٣٨ یەکتر دەگرێتەوە کە دەڵی (ئاژدیهاك) خەڵکی وولاتانی بابلە* دکتور عبداللە رازی تاریخ کامل ایران ص٤.

خەریکی بەخێوکردنی مەرو مالات بووینە، چونکە بەپێی ئەوەی کەلەسەردەمی ساسانی و هخامنشی نەوڕۆز کراوە کاوەی ئاسنگەر کەواتە لەسەردەمی پێش زایین لەناوچەکە ژیاوە کە دەکەوێتە سەردەمی ئاوەدانی بابل و سۆمەر و بەمە ئەم بەلگە دەبێتە پالپشتی ئەوەی کەنەگوتراوە کاوە شوان بووە لەناوچەیەکی شاخاوی یان کشتوکالی کردووە تا گومان لەشارستانیەتی کاوە بکەین لەوەی کەخەلکی شاری بابل نەبووە یا ئور بۆیە ئەم ئاسنگەریە دەبێتە بەلگەیەك کەوا خەلکی شاری (بابل) بووە یان شارەکانی دیکە یان لە (بابل) ژیاوە ئەمەش دەبێتە بەلگەیەك بۆ ئەوەی کورد لەبابل ژیاوە یالەناوچەکە و لەوسەردەمەش کورد پێش ئەوەندە هەزار سالە خاوەن پیشە بووە شارستان بووە. ئێمە هەر بەو بەلگانە واز ناهێنین.. بەلگەی ترمان بەدەستەوەیە کە چۆن کورد لەسەردەمی ساسانیانیش و دواتریش لەسەردەمی عەباسیانیش واتا سەردەمی عەرەب هەر لەبابل کورد ژیاوە جگە لەناوچەکە بەگشتی ئەم بەلگانە دەبنە تەواو کەری یەکترو ودەستنیشانکردنی شوێنی کاوەو سەردەمی ژیانی و بوونی کورد لەناوچەکەی دۆزینەوەی لاپەرەیەکی نویی لەمێژووی کۆنی کورد، جگە لە چوونی گوتیەکان بۆ ناوچەی بابل پێش ٤٢٠٠ چوار هەزارو دووسەد سال پاشان کاشی و ئیلامی هخامنشی (الاخمینیون) و ساسانی.

## بەلگەی چوارەم:

شوێنی زوحاك و ڕووداوەکە و شوێنی کاوە پایتەخت بووە بەمانای شارێکی دیارو پایتەختێکی مێژوویی وولاتێکی کوردنشین و دۆزینەوەی کورد و ئاریایی و کە ئەو کاتە واتا پێش هەخامشیەکان (ئەکباتان)و (بابل) و ئاشور و مثبالو (میسل)[١٩] پایتەخت بووینە نەك شارێکی نادیار و خەیالی بەلام لەبەر ئەوەی ناوی

(١٩) بروانە موصل فی العهدین– یان وتارێکم لە گۆڤاری خازر هاوینی ٢٠٠٤ بۆ زێدە زانیاری.

بابل) بەئاشكرا هاتووە وەك پایتەختی زوحاك. ناوی ئاشورو ئەكباتان نەهاتووە جگە لەوەی كە تەنیا بابل نزیكترین پایتەختی سەرسنووری سامیەكان بووە بەتایبەتی عەربستان و جەزیرەی عەرەبی كەواتە ... بەلگەكان دەبنە تەواوكەری یەكتر یان ناوچەی (بابل) ئەو پایتەختە بووە یان ناوچەی سۆمەر (بابل) شوێنی رووداوەكە بوو.. ئەگەر ناوی شارێكی دیكە بهاتبوایە هەڵەیەك دەكەوتە نێو بەلگەكان تووشی هەلقە پچران دەبوو بەمانای هەلقەكان نەدەبوونە تەواوكەری یەكتر.. چونكە شارەكە دەبێ پایتەخت بووبێ.. لەمێژوودا بەواتای دیار بێت ئەگینا ناوی پایتەختێكی خەیاڵی لە منطق دوور دەكەوتەوە. چونكە ئەگەر هاتوو هۆزێك یان كۆمەلێك هاو هەوێنی و جنسی لەگەڵ نەبوایە پاش كوشتنی زوحاك دەكوژراوە بەلآم زۆر منطق و عەقل قەبولی ئەوە دەكات كە كاوە هێندەی جەنگاوەر لەگەڵ بووە پاسەوانانی زوحاكیش بكوژرێ، ئینجا جاری سەركەوتن لێ بداو بالآ دەست بێت لەشارەكە یان ناوچەكە كەواتە كورد زۆر بووینە لەشاری (بابل)و ناوچەكە لەكاتی شورشەكەدا. نەك هەر هێندە بەڵكو لەدەوروبەری (بابل)یش هەمووی كورد بووە كە فوراتی ناوەندە شوێنی گاوانەكانی سەردەمی ئیسلام و ساسانی پێشتر.

## بەڵگەی پێنجەم:

پایتەختەكەو شوێنەكە دەبێ كوردستان یان شوێنێكی كوردنشین بێت، بەلآم مانای ئەوە نیە خەلكانێكی تریشی لێ نەژیا بێ بەڵكو زانستی و مەنتیقی زێتر قەبولتر دەبێ ئەگەر هەندێ عەرەب یان سامی نەژاد لەو سەردەمەدا لەوێ دا ژیابن كە ئەمەش لە (بابل) دەوەشێتەوە كە ووتمان نزیك سنووری عەرەبستان بووە بەڵكو چەند كیلومەترێك لەپایتەختی عەرەبە لە خمیەكان نزیك بووە كە (حیرە)یە بابل لە رۆژهەلاتی فورات و (حیرە) لە رۆژئاوای فوراتە... بەرامبەر بەیەك. بۆ نموونە عەرەب هەرگیز هەبوونی نەبووە لە ئەكباتان (همدان).. یان

(میسل) لەپێش ئیسلام.. بوونی بێگانەش لەم دیوەی رۆژهەلاتی فورات جۆرە پەرینەوەیەکی سامیەکان لەم لێوارە سنووریە بۆ لێواری میللەتانی ئاری بەتایبەتی کورد کە وقوولاییەکەی زاگروسە کێوو چیا سەختەکانی لەپشتە کە زۆر ئاسایی‌یە مرۆڤەکانی بەدەم پاوان و بژێوی خۆیان نەك میللەتانێکی دوورتر کە بیابانی و رووباری بەینە هەر ئەمەش دەبێتە هۆی بەرخودانی و مقاومە بەرامبەر ئەو کەسەو میتولۆژیاکانی نێو بیروبروای کەلەگەڵ خۆی لە رۆژئاواو بیابانەوە دەهێنێ. ئەو کەسانەش گوتی کورد بوون کەلەناوچەکە دەژیان پاشان ناوچەی سۆمەریان حوکم دەکرد و ئەکەدیان لەناو برد، کەواتە دانیشتوانی ناوچەکە زۆرینەیان کورد بوون.

## بەلگەی شەشەم:

ئێمە لەوە چوینە دەرێ کەوا رووداوی شورشی کاوە بەئەفسانە تێ بگەین چونکە هەمو بەلگەکان یەکتریان گرتەوە بەبێ ئەوەی کەسێك بەئەنقەست دروستی کردبێ و یان شوێنی دیار نەبێ وەك چەندین ساڵە تەنیا باسی کاوە دەکرا بەلام شوێنی رووداو ومسەلەکە لە کۆلکە مێژوو نووسەکان وون بوو. بۆیێ کاوە هەبووە (زوحاك) هەبووە شوێنەکە کە (بابل) ناوچەی (ئورە) دیارە تەنانەت کاتەکەشی بەهۆی یادکردنەوەی چەژنی نەورۆز دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی هەخامشیەکانی پێش ساسانیان. یان پێش هەخامنشی و قولتر لە مێژووی کۆندا بەڵکو سەردەمێك لەسەردەمەکانی (بابل) ئاوەدان بووە وە لەهیچ شوێنێکیش ئەم هەموو بەلگە کۆنەبووەتەوە سەریەك.

## بەلگەی حەوتەم:

ناوی (زوحاك) ناوێکی عەرەبیە بەمانای بەپێکەنین هێنەر بەلام لەراستیدا بەگریان هێنەرو تەعریبی ناوی (ئەژدیهاك)ە بەم شێوەیە ئەژدیهاك – لەبەر نەبونی پیتی (ژ) لەعەرەبیدا ئەزدیهاك– زیهاك – زوهاك – زوحاك – گۆرانکاری

بەسەردا هاتووەو تۆمار کراوە بەعەرەبی، ناوی کەسێکی دیار نیە ناوی دەعبایە حەزیایە ناوی دێوو درند و مرۆڤ خۆرو ترسناکە. کەپێی دەڵێن (التنین). ناچێتە عەقلیش ئەژدیهاك لە (زوحاك)ی عەرەبی بەپێکەنین هێنەر هاتبێ.. لەکاتێکدا ماری لەسەر شان بوو زراوی مرۆڤی دەبرد وە بەهەمان شێوە (کاوە) لەقەبە وەك (قەیسرە) (کیسری) فرعەون ناوی هۆز و تیرەو لەقەبە کەلە (گاو) (God)ی خواوەندو هۆزی (گودی) (جودی) غودی یەوە هاتووە گاوان بەعەرەبی بە (جابان) تۆمار کراوە (ابن جابان الکردی اصحاب النبی) ئەمە بۆچونی هارمۆنی لێکتر گونجاوو رەسەنە.

## بەڵگەی هەشتەم:

ئێمە ئەگەر توانیمان لەبابل و ئور و لگش دەوروبەری بوونی کورد بسەلمێنین لەسەردەمی ساسانیان و هاتنی ئیسلام یان پێشتر ئەوا ئێمە هۆزی (کاوە)و پاشماوەی دەدۆزینەوە بەتایبەتی گاوانیەکان یان هەلقەیەك لەهەلقەکان – چونکە شوێنی روداوی (گاوەیە) (یان (گاویان).

## بەڵگەی نۆهەم:

کاوانی – جابانی – گاڤانی بەپێی فوتەتێکی فارسی کە (ب) لەجیاتی (و) سورانی (و) بەکار دەهێنێ لەکرمانجی سەروو (ڤ) وەك ئاب، ئاو، ئاڤ، یان، باب، باو، باڤ، زاب، زەهاو– عەرەبیش لەبەر نەبوونی پیتی (گ)ی کوردی و فارسی لەعەرەبیدا هەموو پیتێکی (گ) کردۆتە (ج) وەك (گرگان) = جرجان – گلگامش – جلجامش – مهرەگان – مهرەجان – هتد. بۆیێ زۆر بەئاسایی ئێمە دەتوانین رەگی گاوانی لە نێو (جابانی) یدا بدۆزینەوە کەلەبەر قورسی (گ) لە زمانی کوردیدا بوە کاوانی بۆیی ئەگەر هاتوو گاوانیەکان لەدانیشتوانی (بابل)

و(ئور) و ناوچەکەی بوون ئەوا کاوە لە (گاوە) گاوانی هۆزی گاوانی کوردیەوە هاتووە کەلەناوچەی حلە (بابل) و (ئور) دەژیان لەسەردەمی ساسانیان و سەردەمی عەباسیەکان و سەردەمی هاتنی ئیسلام بۆیی ناوی (کاوە) لە بیرکراوە تەنیا لەقەبەکەی ماوە وەك هەموو ناوێکی مێژوویی کۆن تەنیا هۆزەکەی بووەتە لەقەب یان ناوە جگە لەوەی عەرەبەکان لەبەر نەزانینی هۆزی ناودارێکی کورد یان شوێنەکەی یان ناوی باوکی بەناوی باوکیان تۆمار کردووە یان تەنیا لەقەبەکەیان بەکار هێناوە وەك یان الفارابی – الخوارزمی – ابن خلکان – بەڵگەشمان ابن جابان الکردی اصحاب النبی کە ناوەکەی دیار نی یە تەنها ناوی هۆزەکەی نووسراوەکە مێژووەکەشی زۆر نزیکە لەچاو مێژووی دێرینی کاوە... کە بەئاشکرا دیارە (جاوان) گاوان (گاوانیە) کەهەمان ناوی کاوەی ئاسنگەرە– دیارە نزیکترین کەس و هۆز لەسنووری عەرەبستان گاوانییەکان بوینە بۆیێ زۆر بەئاسانی (ابن جابان الکردی)[٢٠]. گەیشتۆتە لای (محمد) (د.خ) بووەتە موسلمان کە ابن گاوان بوو کاوەش لە (گاوان) گاو ... بەفارسی بەکوردی (گا) گاوان بەمانای شوانی رەشە وولاخ گاوچێل و مانگا و گامێش بەخێوکردن دێت ئەم بەلگەیە کە پێك چوونی ناوەکەیە بەلأم کاتێ دەسەلمێنرێ خەلکی ناوچەی بابل و بەغدا و دەوروبەری گاوانی بوینە ئەوا یەکسەر بەڵگەی ئەوەیە کە (گاوانی) وەك ناوو لەقەب مەبەست لە (کاوە)ی گاوانیە–

مەبەستی باسەکەمان سەردەمی ساسانیان و سەردەمی دوای ساسانیان – بۆ سەلماندنی ئەوەی کە کاوە گاوانی بووە – خەڵکی بابل بووە – کورد بووە– کوردیش دەورێکی گرینگی هەبووە لەمێژووی ناوچە کە بەتایبەتی کاوانیەکانی دوای کاوەش لەسەردەمەکانی جیاجیا – شورشەکەشی رەهەندو مانان و

(٢٠) من کتابة الاصابة في تميز الصحابة وتفسير روح المعاني ذيل (١٦) صورة فتح کە لەیارانی پێغەمبەر بووە (د.خ) دیارە خواروی عێراق سەروی نزیك عەرەبستان بووە.

بۆچونێکی دیکە دەداتەوە دەست و بەمەش لاپەڕەیەکی گرینگی مێژووی کاوەو کاوانیەکان و کورد دێتەوە سەر لاپەرە زێرینەکانی مێژووی رۆژهەلاتی ناوەراست و دەوری کاریگەری کورد و هەروەها کە ئێراق یەك پارچە شوێنی کورد و کوردستان بووە و ئێراق بەهەمان ناوی کوردی بەو بەشە بچوکە ووتراوە کە دەکەوێتە خوار بابل و ناوچە کوردنشینەکان - تاکوتایی هاتنی دیجلە و فورات و گەیشتنیان بەدەریا و دوورگەی سەریان.

**بەلگەی دەیەم:**

وەك لەلای هەموومان ئاشکرایە گاوان لەگوند دەچێتە دەرەوە بەلام ئێوارە دێتەوە گوندەکەی ئەوەی گاو گامێش و گاو گۆلك بەخێوکات پێویستی بەدەم ئاو و گۆم و زەنگاوە، وەك رەوەندنیە ئاژەلی ووردی هەبێ وەك (بزن) و مەر کەبەسەر چیاکان بکەوێ بەتایبەتی (بزن) کە دەتوانی وەك بزنە کیویی بەسەر سەخترین شاخ هەلبگەرێ... بەمە رەوەند کویستان و گەرمیان دەکا بۆ دۆزینەوەی پاوان بەلام گاو گۆلك و گامێش خواردنیان جیایە لەدەم قەمیشەلان و زەنگاو هەموو شتێك دەخوا جگە لەوەی کەپێویستی بەئاوە... هەمیشە حەزی لەدەم ئاوە.. بەپێچەوانەی مەرو بزن بۆیێ ئەمەش بەلگەیەکی حاشا هەلنەگری ئەوەی کە هۆزی گاوانی یان گاوانیەکان ئەو شوێنە گونجاوەیان هەلبژاردووە بۆ رەشەوولاخەکانیان کە دەم زەنگاو (ئەهوارو مستنقعاتی) ئێراقی کۆن بوونی شوێنی تەیری (واق)ی ماسی گرە.

ئەوەشمان لەبیر نەچێت گوند لەگاە وەندەوە هاتووە رەوەند لەراە وەندەوە هاتووە لەسەر شێوەی زەماوەند سەماوەند- گەر بمانەوێ لەگاە وەند راەوەند بگەین پیتی (و) دەکینەوە (ب) وای لێ دێ گاەبەند - راەبەند - یەکەمیان بەستراوە بەشوێنی دووەمیان بەستراوە بەرێگاوە- هەمیشە لەرێگایە

کەواتە گاەبان– گاەوان – گاە ڤان – بۆ ئەو کەسانەش دێت کە شوێن بەرێوە دەبن بەمانای سەرکردە و جێنیش وکۆچەر کە دیارە گاوانیەکانی (بین النهرین) هەموویان کۆچەر نەبوینە وەك داهێنان لە گۆڤاری کۆری زانیاری کورد ئیشارەتی پێداوە بەڵکو هەمیشە ئەوەی گاو گامێش و گاران بەخێو دەکات خاوەن گوندو جێنشینە وەك گاوانەکان– کەلە داهاتوودا بۆمان رون دەبێتەوە – مێژوو نووسی گەورە رەشید یاسمی لێکیان ناکاتەوە لەنێوان شبانگارەو کاوانی جابان . کەکیشەیان هەبووە لەسەر حوکمی دەولەتی ساسان– وەك لەوبەر بەرەکانیە توندەی لەنێوان خسرو پەروێز بهرام چوبین دا هەبوو – کە بەهرام چوبین شوانکارە و جوبی– جوبان – گابان – گاوان بووە... بەلآم دیارە خەسرو پەروێز لە هۆزێکی دیکەی هەمان خەڵکی ناوچەکە لەهۆزی لور و فەیلیەکان وەك ئاشکرا فەیلی کە شوێنیان دەورو پشتی بەغداو لوڕ بووینە بەخۆی دیارە کاتی خۆشی تیسفون جیگایان بووە ناوەکە زۆر نزیکە لەناوی بەهلەوی – پەهلی – فەیلی – کەبەزمانی ئەوان دەولەتی ساسانی نووسراوە رەسمیەکانی دەنووسیەوە ، وەك ئاشکراشە فەیلیەکان هۆزێکی کوردن چونکە هەمیشە ئەوانەی زمانی پەهلەویان زانیوە.. لەدەوروپشتی بارەگاو سەرکردایەتی و ساسانیەکان بوینە.. هەمیشە پایتەختیشیان هەر لەم ناوە دەرنەچووە گە زستانان لە(تیسفون) و بەغداو هاوینان بەرەو قەسری شیرین و همدان کراوەتە پایتەخت جگە لە پایتەختی شوش و تەختی سولەیمان و(اسگخر) و کەلە بەشێکی تایبەت باسی ساسانیەکان و پەیوەندیان لەگەلّ کورد و گاوانیەکان دەکەین ئەگەر چی زۆریش هەوڵدراوە ئەم لایەنەش لەلایەن فارسەکانەوە ون بکرێ و دەوری کورد لە مێژوودا کەم بکرێتەوە بۆ ئەوەی شارستانیەتەکە تەنیا بەناوی فارس و عەرەب تۆمار بکرێت لەبەر ئەوەی هەردووکیان خاوەن دەسەلاتن و بەشێکی کوردستانیان بەدەستەوەیە نایەنەوێ کوردەکان هەست بەخۆیان بکەن و بروا بەخۆ بونیان بەهێز بێت و

مێژوو دووبارە بكەنـەوە یـا داوای سەربەسـتی و ناسـنامەی خۆیـان بكـەن و مێـژو بـەناوی دەولەتەكـە دەنووسـنەوە یـان ئـەوان بـەناوی ئاریانیــە وە تایبەتمــەندی كوردی وون دەكەن ئەوانەی تریش بەناوی ئاینەوە كورد لـەنێو نەتـەوەی خۆیـاندا بتوێننەوە- مێژووی پر لە شانازی سروشتی وون بكەن یا داگـیر بكـەن وەك چـۆن ئێستایان داگیركردووە بەشی سێهەمیان ئەو كەسانەن و ئەو میللەتانەن وەك تورك كە هەزاران جۆرە پۆڵ و پارەی سەرفكردوە كرێ گرتەی گرتووە لە مێژوونووسان بـۆ ئــەوی مێــژوی كــورد بشــێوێنن بگــۆرن، چونكــە بــەوونكردنی شــوێنەوار و لاپـەرەكانی مێـژوو كـورد تـا رەوایـی بـدەن بـەخۆیان لەسـەر خــاكێكی خــاوەنی نەبووینـە یـاهی كـورد یـان رەوایـی بدەنـە داگـیركردنی خۆیـان كـە لەنیوەراسـتی ئاسیاوە هاتنە خـوارووی لەناوچـەكانی كـورد جێنشـین بـوون داگیریـان كـرد. بۆیـە هـەركاتێ سـەرچاوەكانی هیچیــان نــەدا بەدەســتەوە وەك یــەك لاكەرەوەیــەكی ناوەرۆك و ناو گەران بەدوای راستیەكانی بەپیرۆز و كوردایەتی دەزانین.




نەخشەی سۆمەرو سەردەمی گوتیەكان كە ١٢٥ ساڵی خایاند لە ناوچەكەدا



گۆدیا گاوه کاوەی گوتی ( سەرو جەمەدانی چیایی سارد )
کە دەستوری گوتییەکان بوو

# گوتیەکانی کورد لەناوچەی سۆمەردا

دوای ئەوەی بەهۆی گەران بەدوای جەژنی نەورۆز و کاوە و رووداوەکە بەمێژوو دا شوربومەوە.. هەتا گەیشتمە سەردەمی هخامنشی‌یەکان کە هەموویان یادی نەورۆزیان دەکردەوە.. دواتر کەوتمە نێو هۆزەکانی میدی و گوتی و لولو و هۆری و هتد سەیرم کرد هیچ بەڵگەیەکی وام بەدەست نەکەوت. کەبوونی نەورۆزیان رووداوەکە بسەلمێنیٚ گەرامەوە سەر سۆمەر و بابل دوای ئەوەی سەرە داوی ئەوەم کەوتە دەست کەوا ئەژدیهاك خەڵکی ناوچەی بابل بووە[٢١] لەنێو وێنەکانی سۆمەریەکان یان سۆمەر لەسەردەمی گوتیەکاندا... یان سەردەمی گوتیەکان لەوولاتی سۆمەردا – وێنەی ئەژدیهاکی سی سەرو مێشك خواردن گەنج و یاد و جەژنی دار چاندنم کەوتە بەرچاو. کەواتە لەکاوەو نەورۆز نزیك بوومەوە. چوینە جیهانی وێنەکان و توژینەوە و حەلکردنی رەمز و سمبولەکان. بەپێی بۆ چوونی ئەفسانە و چیرۆکەکانی کورد و ئاریایی کە سامیەکان هەتا ئێستاش زۆر دورن لەتێگەیشتنی میتولوژیای کورد و ئاری. بۆیی نووسەرەکانیان هەمیشە راستیەکانیان نەپێکاوە، یان روویان لیٚ وەرگێراوە، ئەو نووسینانەش کە بێگانە نووسیویەتی ئەوان دەسکاریان کردووە لەکاتی وەرگێرانا بۆیێ بەچرای گومانەوە دووبارە بەبێ گوێدان بەوەی چی دەڵێن وێنەکانمان بەدیدی کورد و ئاریاییانە خوێندەوە ئەنجامی سەیرمان کەوتە دەست. ئێمە لەسەرەتادا زانیمان ئەو گروپە بیابیانە یان دەشتاییانە کە هێرشیان بۆناو چیاکان دەهێنا سودیان لەپەرت و بلاوی و ئاگا لەیەکتر نەبوونی ئەم هۆزانە وەردەگرت کە دۆلێك ئاگای لەدۆلێك

---

(٢١) دیاکونوف – میدیا – ویرهان قانع ص ٦٣٨ (وولاتی ئەژی – دیهاك بەبابل دائەنا)

نەبوو، هاتووچۆ سەخت بوو لەنێوانیاندا – بۆیێ یەكسەر نەیاندە توانی بەرەنگاری ئەو هێزە پڕ چەك و ڕێكخراو و زۆرە ببنەوە كەلەناكاو دەهاتن بۆ تالآن و بخۆو برو (دیل) بردن كەسەردەمی كویلیەتی بوو پێویستیان بەكویلە بوو بۆ كارەكانیان[٢٢] كە دەنگ و باس بلاو دەبووەوە ئینجا هۆزە چیاییەكان كۆدەبوونەوەو یەكتریان دەگرت و هێرشیان دەهێنایە سەر قەلاّ و شارەكانیان تەفرو تونایان دەكردن وەك چۆن ڕەفتاریان لەگەلّ بابل و ئاشوور ئەكەدا كرد ڕەوانەی بیابانیان كردەوە سەرەرای ئەمەش هەتا ئێستاش كورد و چیاییەكان بەكیویی و درندە و نەزان دەزانن چونكە بەوولاتی خۆیان رازین و هێرشیان بۆ سەر بیابانی ووشك نەبردووە؟ ئەوانیش لەنێو دول و چیاكان ئەنفالیان دەكەن و وێنەی سەركەوتنیان لەسەر شاخەكان نەخش دەكەن بەسەركەوتنیشی دەزانن نەك داگیركردن و ئەنفال، تەنیا چونكە عەشتار و بەردە بوت و بتەكانی ئەوانیان نەپەرستووە ئاین لەدوای ئاینیشیان بۆ هەمان مەبەست داهێناوە تا لەم وولاتە جێنشین بن وەك ئەژدیهاك كەناونیە رەمزی هەموو ئەژدیها و درندەو مرۆڤ خۆر و مرۆڤ كوژێكە ئەژدیهاك (زوهاك) (زوحاك) فۆنەتێكی عەرەبەكانە بۆ ووشەی (ئەژدیهاك) بەهەر مانایێك و ناوێكی تایبەتی هەبووە لەوانە كۆنەكان بەلاّم ئەم وێنە چ لەسەر شێوەی ماری سێ سەر یان مرۆڤێك سێ سەری هەبێ یان مرۆڤێكی بەدەسەلات دوومار لەسەر شان هەبێ بەسەری خۆیەوە دەكاتە سێ سەر كەخواردن دەخوا سەری یەكەمیان مرۆڤ دەكوژێ بۆ هەر سێ سەر. یان ئەژدیهای حەوت سەر ئەمانە هەمووی لەلای چیاییەكان بوونە سمبولی ئەو

(٢٢) جگە لەمەش بەخۆیان بۆ كاسبی و جێنشبوون و ئاسنگەری گەرۆك دەچوونە ناوچەكە بەبێ ئەوەی پەیوەندیان لەگەلّ چیادا بپچرێ سەرەرای گەرمیان و كویستان كردنیان – بروانە دیاكونوف ص ١٨٣–و برهان قانع ٢– اللور والكورد الفیلیون – عبدالجلیل فیلی ص٢٠–٢٤، هەروەها نەژادی كورد – ئول فیلجیڤزكی – ترجمه رشاد میران ص٣٢–٣٤.

داگیرکەرانەی لە بیابانەوە دەهاتن وەکو مار بۆ دەم ئاوەکان و بەخەلکیان وەدەدا یان دەیان کوشت لەوانەش ئارم سن یان (نرام سن) دوو قۆچی هەبوو بەدوو مار تەشبیە دەکرا دواتر دیارە حاکمەکانی سامی ئەو بلندایەیی سەرشانیان هەبووە وەکو دوو مار وەك لەوێنەکەی حامورابی و خواوەندەکانیانەوە دیارە– ئەوان بەتیشکی دەزانی بەلام دووسەری مارە لەلای چیایەکان لەسەر شانی ئەو خواوەندانەی کە بابلی دەیان پەرستن. (بروانە وێنەی حامورابی و خواوەندەکەی کاتی یاسای لێ وەردەگرێ وێنە ٣٧٣ (ص٣٦١) سۆمەر فنونهاو حضارتها اندری بارو دکتورعیسی و سەلیم طە تکریتی– یان وێنەی ٣٦٨ ص ٣٥٦ یان وێنە ٢٨٤ کە وێنەی ئەژدیهاك و ماری سەرشانی نیشان دەدا یان وێنە ٢١٣ (نرام سن) و دوقۆچی مارانەی سەرشانی– کەچۆن گوتیەکان دەکوژێ و لەژێر پێیان کەوتوون و هاتوو هاواریانە[٢٣] ئایا ئەو مارانە یان ئەو وێنانە – کەبەئاشکرا باسی ئەژدهاك و لەوێنەی ئەژدیهاکی مار لەسەر شانە .. کەواتە گوتیەکان – کەبە مانای گاوانیەکان یان گاوەکان (جاڤان) (کودی) یان (جود غود گود بەمانای گاو) دێت بەزمانی سۆماری بەمانای کاوە و هۆزەکەیە هاتوون تۆلە لە (نرام سن) و داگیرکەرەکانیان بکەنەوە و دیلەکانیان لە گاوانی و گاری پیشەیی و چەواساندنەوە و دیلیەتی رزگار بکەن بەهاوکاری کویلەکانی ناو (بین النهرین) کە گوتی بوون تکایە ئەوەی وێنەکان (نەبینیێ) لەم لێکۆلینەوەیەمان ناگا؟ وێنەکانیش زۆربەیان هی سەردەمی گوتیەکانن لەسۆمەر و سەردەمەکە (بین النهرین) دا. نەفەسی نووسینەکەشمان لەو چەند برگەیەدا نەفەسی مرۆڤێکی

---

(٢٣) ئەژدیهاکی دوومار لەسەر شان یان ئەژدیهای سێ سەریان خواوەندی وەك مار لەسەر شان هەموویان یەك ماناو مەدلولن. رەتکردنەوەی میتۆدو خواوەند و سەرکردەی بێگانەیە– کە خوێنرێژی و گوتی و لولو کوژی کردوە.

زاگروسی بوو کاتی سەیری وێنە و مەسەلەی (نرام سن)[٢٤] دەکات چۆن چیاییە بێ سوچەکان قەتل و عام دەکات لەگەڵ ژن و منداڵ ئەنفالکردن بۆ کویلاییەتی کەسەردەمی کویلایەتی بوو وەك زاناکان باسی لێوە دەکەن لەوێ وە گوتیەکان خۆ ئامادە دەکەن بۆ بەرپەرچ دانەوەی کەواتە گوتیەکان داگیرکەر نەبوون خەڵکی ناوچەکەبوون بەدیوی خواروو رۆژئاوای روباری سیروان دەهاتنە خوار کاتێ لەزستانی ساردی کیوەکان گاو ئاژەلەکانیان رزگار دەکرد بۆیی زۆر سروشتیە پێش هەموو میللەتانی دیکە ئەوان سوود لەو پێدەشتە چیاییانە وەرگرن کەلەتەك وولات و ناوچەکانیانە- بەلاّم رەوانیە ئەوانە بەدرندە بزانن لەکاتی سەرکەوتن و تۆلەساندندا بەلاّم بەکویلەیان بزانن و بەزەییان پێ نەیێتەوە لەکاتی لەژێر پێی (نرام سن) دەبیندرێن و شانازی بە (نرام سن) دەکەن کە پاڵەوانی ژن و منداڵ کوژە بەلاّم نووسەری واش هەیە سەردەمی گوتیەکان بە سەردەم و وولاتی پێشکەوتوو دەزانی کە کاتێ لەلایەن نوێنەریان وولاتی سومەریان بەرێوە دەبرد بووە هۆی دروستبوونی (سۆمەر یەتازەکان) لە ٢٢٨٥-٢٠١٦)پ.ز.[(٢٥)] لەو سەر دەمەش ناوی دووشاری سۆمەری (لگش و ئور) دەوری خۆیان بینیوە ئەویش بەبەدیارکەوتنی گودا- گاوە یەك مانان بەکوردی بەسۆمەری وەك باسمان کرد (غود - گود) بەمانا (الثور)[(٢٦)] گا دێت کەبەفارسی و کوردی رەسەن (گاو) ی گاوی پێ دەلێن هەمان گاوانی کاوانی دروست دەکا. کەدیارە هەلقەی نێوان سۆمەریەکان و گوتی بووە کە زاوای یەکێ لە مەلیکەکانی سۆمەبووە بەلاّم

---

(٢٤) دیاکونوف بە (ئارام سن) ناوەکەی نووسیوە کەچی لە سومر فنونها و حضارتها بە (نرام سن) نوسراوە - دیارە ئێمەش بەدوو جۆرمان نووسیوە.

(٢٥) سومر فنونها و حضارتها اندری بارو ص ٢٥١.

(٢٦) غود- گود - بەسۆمەری بە مانای (گاو)دێت - بەکوردی (گا) ص ٧١ یوسف الحورانی البنیة الذهنیة الحضاریة مەبەست گوتیەکە ناوەکە بووە گاوانی (گا) (گ) کەبەفارسی و کوردی حرفی (گاف)ی پێ دەلێن بووە بەجاف یان (گاڤان) کەگاوانیە

(گـودی) کوردیـا بـەرای مـن دوای لێکۆلینـەوە تـەنیا لەقەبـە (نـەك نـاو) مەبەسـتی گوتی‌یە گودی راستیش نیە کە گوتیەکان هیچ نـەزان بووبـن کـە دیـارە یـەك ئـاین بوون لە سەرەتادا لەگەڵ سۆمەریەکان کە (ئوتو) (ئەتاو) هەتاویان دەپەرست بـە جیاوازی پیرۆزی(گا) لەلای گوتیـەکان، وەك دیـاکونوف دەڵێ (گوتیـەکان هـەوڵیان داوە هونەری سەربەخۆیان هەبێت[٢٧] بەسۆمەری (ئوتو) بەهەتاویان دەگوت بەلاَم لەو سەردەمەی کە گوتیەکان حوکمـی ناوچـەی بـابل سـۆمەریان دەکـرد هونـەری (سۆمەری گوتـی) پێشکەوت و ئەستێرەی بابل کوژاوە بوو. یەکێ لەهونەرە هـەرە بەرزەکانی ئەو سەردەمە (زەقورە) زاگورە – بـوو کـە وەك زاگـرووس پیتـی (س) پاشگری یونانیە وەك باخوس، ڤینوس یان (کورە) کەبـەزمانی سـۆمەری بـەمانای چیا دێت[٢٨]. کەدوای ئەوان کاسی(کیشیە) چیاییـەکانیش دروسـتیان کـرد پاشـان (نەبوخـەز نوسسـەر)یش بـۆ کچـە شـۆخی کـوردی میـدی (ئـامیتیس) باخچـەی هەلوارسراوی دروست کرد تا بتوانێ لەم سۆمارە(زم ئار) (زمستان ئار) یان گەرمە سـیرەدا بـژی. کەبەڵگـەی یادکردنـەوەو دروسـتکردن جـۆرە چیایێکـە کـە یەکـەم تیشکی خۆری پێدە کەوێ جێگا خواپەرسـتی و بلنـدی پەرسـتی بـووە، یـان وەك هاورێ باخەوان دەڵێ (زەقورە) جیگا خوداوەندبووە یا جێگای تەختی دانیشـتن و فـەرمان رەوایـی[٢٩] بـەلای سـۆمەریەکانەوە. بـەلاَم بـەرای مـن بەکاریگـەری گوتیەکانەوە بوو، کەناوچەکەیان حوکم دەکرد چونکە سەردەمی پێشـتر بـەمانای لەسەردەمی سـۆمەریەکانی پێش گوتیـەکان ئـەم زەقورانـەیان دروسـت نـەدەکرد بۆیان دروست نەکردبوو کەبە (ق) تۆماریان کردووە. هەمان نـاوی (زاگروسـە) کـە پیتی (س) وەك عبدالله ئەیوبیان لەنەورۆز درکردستاندا دەلی ئەم (س) یۆنانیـەکان

(٢٧) دیاکونوف – میدیا – و. برهان قانع.

(٢٨) هاوری باخەوان کوردستان نیشتمانی یەکەمین سۆمەریەکان بوو لا ١٠١–١٠٢.

(٢٩) هەمان سەرچاوە ص ١٠٣.

زیادیان کردوە. بەمانای ناوەکە لەرەسەندا (زاگـرە)[٣٠] ووشـە ناوەکـە لـە زاگـر – زاگور – زەگورا وە نزیکە.. کە وەك زانیمان (کور) بە سۆمەریەیانی چیـا کـەدیارە (گـرد) لـەوەوە هـاتووە یـان نـاوی (چیـای کـورەك – خـوا کـورك) کەواتـە زاگـورا (زەگورە) (زەقـورە) لێـك جنسـی (کـور)ن بەهـەر حـاڵ ئێمـە لەهـەر بـەندێك یـان فەسلێکی ئەم لێکۆلینەوەیە بەتێری باسی لایەنێك لەلایەنەکان دەکـەین. جگـە لـە ئامەژەکردنەکانی خێرا کە بۆی هەیە خوێنەر نەگەیشـبێتە قەناعـەت تـا هەلقـەکان یـەکتر نەگرنـەوە. گوتیـەکان پـاش ١٢٥ سـاڵ حوکـم هــەندێکیان گەرانــەوە نێــو کێوەکان هەندێکیان لەشوێنە کە جێنشی بووە شان بەشانی دیلە گوتیەکانی ئازاد کراوو زاگروسیەکان یان ئەوانەی خەریکی پیشەکاری بوون لەناوچەکە. وتمان(٢١) مەلیکی گوتی حوکمیان دەکرد کە لەگەڵ (٢١)ی نــەورۆز یـەکدی گـرە. دوای ئـەم قوناغـەش (ملـوك الطوائـف) دەسـت پـێ دەکـا[٣١] لەهـەر شـوێنێك و دەولــەتێکی بچووك دادەمەزرێ تا سەر هـەلدانی کاشـیەکانی زاگـروس کـە لەهـەمان ناوچـەی نزیك گوتیەکان دەست بەسەر (بین النهرین) سۆمەرو بابل دادەگرنـەوە بـۆ مـاوەی ٦٠٠ شەش سەد سال حوکمی ناوچەکە دەکـەن دوای ئـەوانیش ئیلامیـە لوریـەکان بەمە ناوچەکە دبێتە پارچەیەك لەدانیشتوانی زاگروسـیەکان و سـۆمەریەکان لـەنێو ئاریە کوردە زاگروسیەکان دەتوێنەوە دەبنە بەشێك لەکورد کە کـورد دەبـێ ئەمـە بزانـێ خـۆی بـووە خـاوەنی شارسـتانیەکەیان وەك خـۆی خـاوەنی ناوچەکـە بـوو بەگشتی لەئیراق وە بگرە کە لاووتی سۆمەر بـوو کـە (ئـور) و(ئـاروك) بـوو تـا دوا سنووری ئورارتویی و میدیەکان لەباکورا.

---

(٣٠) بروانە کتیبی نەورۆز درکردستان عبیداللە ایوبیان.

(٣١) رشید یاسەمی لە ص١٠٨ کتابی کورد و پێوستگی نژادی دەلی (کـورد لەنـەژادی گوتیانـە بـە ڕای ئێمەش کە جودیە کەشتی نوح لەسەر چیای جـودی هاتـە خـوار ژیـانی دووبـارە کـردەوە. کەئـەو شوێنە چیای زاگروسی کوردستان (کەواتە کورد کونترین میللەتی سەر زەویە).

وە بۆ ئەوەی بەچەند دێڕێك لەسەردەمی لاوازی گوتیەکان بگەین یان سەردەمی ئاوابونیان مێژوو ئەم وێنانە تۆمار دەکات. دیاکونوف دەڵێ:- (لەخوار شاری هەولێر کەپێیان دەگوت ئوربیلوم یان ئاربیلوم دەولەتی شیمورم پەیدابووە لەنزیك زابی خواروو لەخوارووی ئەویش ناوچەی هارشی هەبوو لەشوێنی (توز خورماتلو) بووە لە رۆژهەلاتی کەرکوکی ئێستاش ولایەتی کیماش هەبووە..هتد وەلەهەر شوێنێك و ولایەتێك سەربەخۆی راگەیاند. ئێمە بۆ ئەوەی زێتر لەناوچەکە بگەین ناوچەکانی (موهنجو- دار) خارایی کە خاوەنی فەرهەنگی (هیندی)یان بوون کیشوەری (گوتیوم) و (ئور) ی بەیەك دەبەستەوە بە دەراوی (دیالەدا) تێ دەپەرێ هەروەها ئەمەش بزانین لەشکر کەشی سومەر و ئەکەد بۆ گرتن و کۆکردنەوەی دیل بووە[٣٢].

زاناکن بەلایانەوە گرینگ بوو کاتێ پەیکەرێکی بەردینی مرۆڤێکیان دۆزیەوە لەرووی نەژادیەوە لەمرۆڤی چیاکانی زاگروس دەچوو[٣٣] رەشید یاسمی دەڵێ: (بابلیەکان دەڵێن پرچووررووی کیژانی گوتی گەش بووە)[٣٤] بەمانای رەش نەبووە ئێمەش شەرەفی ئەوەمان پێ براو سەربردەو وێنەی زوحاك (ئەژدیهاك) و کاوە و گوتیەکان لەهونەری ناوچەی سومەر لەسەردەمی گوتیەکان بدۆزینەوە وەك ماناو مەدلول. لەم بەینە ووتەی ئول. فیلچیڤسکی مان دێتەوە بیر کە دەڵێ (لەدواتردا دەبینین تا چ رادەیەك دانیشتوانی نیشتەجێی میسۆبۆتامیای سەروو ناوچە چیاییەکانی دەوروبەری بەشداریان لەدروستبونی میللەتی کورد کردووە)[٣٥].

تێبینی:

---

(٣٢) دیاکونوف میدیا ص ١٨٢ وبرهان قانع.

(٣٣) دیاکونوف هەمان سەرچاوە.

(٣٤) رشید یاسمی - کرد و پیوستی نژادی و تاریخی ص ٣١ ووشەی (ماموتی) سۆمەری بۆ ئەوە بەکارهاتووە کەلە (مو +روت)ی کوردیەوە نزیکە

(٣٥) نەژادی کورد- ئول فیلچڤیسکی - ص ٣٣ د. رشاد میران.

ئـەم بەشـە سـەرەتای لێکۆڵینەوەکەمـە خوێنـەر لـە کۆتـاییدا هەسـت بـە گۆرانکاری دەکا کە قەناعەت و کەرستەی دیکەم بووەتە بنەمای راستی بەڵام وەك قۆناغی یەکەم دەسـکاریم نـەکرد. سروشـتی هـەنگاوەکان و کاکڵـە بوونـی راسـتی پێوەدیاربێت چۆن پێ بەپێ بەرەو راستی رۆیشتین.



کاریگەری مار لە سەر ئۆڵی کوردە ئێزیدیەکان- لالش

# پەیدا بونی ناوی کورد و پەیوەندی بەکاوەوە دیالیکتیکی مێژووەوە

وەك چۆن بۆ دروستبوونی دەریاچەیەك چەندین سەرچاوەی ئاو و جۆگەو روبار بەشداری تێدا دەکات ئاواش دروستبوونی هەر کۆمەلگایەك یان نەتەوەیەك، هەر ئاواش پێش ئەوەی ناوی کورد پەیدا بێت کۆمەلێك ناوی هۆز و تیرە و گروپ و ناوچە و هەرێمیان لەبەر دەست بوو وەك رەگی درەستبوونی گەلی کورد هەر ئەوانەش لەمێژوو دەوری کاریگەریان هەبووە بۆ دروستبوونی سنووری جوغرافی و زمان و کلتور و سیما نەتەوەییەکانی گەلی کورد، کە ئێستا پاشماوەکانیان بەشێکن لەگەڵی کورد. بۆ لێکۆلینەوە لەم مەسەلەیە تەنیا رێگا کلاسیکیەکەمان نەگرتە بەر، وەك چۆن هەندێ رۆژهەلات ناس وپسپۆران رەفتار دەکەن[٣٦] بەڵکو هەولمان دا لایەن و رێگای تریش شان بەشانی ئەم رێگایانە بگرینە بەر بۆ بەرجەستەکردنی ناوو مێژووەکەی. تا ئەنجامەکەی زێتر مەنتیقیانە بێت. بچێتە نێو خانەی زانستیەوە و بتوانین بریاری لەسەر بدەین. وەك لایەنی شیێ کردنەوەی زمانەوانی و گەران بەدوای رەگی ووشە و ناوەکان و پشت بەستن بەسەرچاوەو پاشماوەکانی مێژوویی و شوێنەواری لەتەك بارو دۆخی سەردەمەکانی دەوروبەر و زمانە کانیان و هزر و تایبەتمەندی زمانی ئەو میللەتانەی مێژووەکەیان نووسیوەتەوە هەروەها چۆنیەتی شێوانکاری بەئەنقەست و نا ئەنقەستی ناوی شوێنەکان.

---

(٣٦) کردنیاش = بەوولاتی بابلیان دەگوت ص ٩٨ ئاشور پانیبال سیرتە و منجزاتە الاب سهیل قاشا.

ووشە بەسنووری جوگراغی ئەو کاتە بەپێی قۆناغەکان. ئێمە لەسەرەتادا چەند ئەفسانەیەکمان لەبەردەست بوو، کە گوایە کورد لەنەوەی ئەوەی زێتر بووە جێگای سەرنج راکێشان چیرۆکی ئەفسانەی (کاوەی ئاسنگەرە) کە دەڵێ کاتی ئەژدیهاك دوو گەنجی دەهێنا مێشکیان دەرخواردی مارەکان بدا... (ئاریایل)ی وەزیری گەنجێکی دەشاردەوە و دەیناردە نێو چیا لەجیاتی مێشکی ئەو گەنجە مێشکی ئاژەلێکی تێکەڵ دەکرد ئەو گەنجە رزگار کراوانەی نێو چیا کەخەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێو کردن بوون(٣٧). کۆمەلێك دروستبوو ناویان نا (کورد) کورد لەم رۆژەوە دروستبووە. هەر ئەوانەی هاریکاری کاوەیان کرد تا تۆڵە لەئەژدیهاك بکەنەوە و پاشان بیکوژن و رزگاریان بێت(٣٨) ئەمە زێتر جێگای سەرسامیان بوو کاتێ زانیمان ئەو رووداوە دەگەرێتەوە بۆ چوار هەزار و دووسەد ساڵ بەر لەئێستا کەسەرەتای پەیدابوونی پیشەو کارەکانی سەرەتایی و چاندن و کشتوکاڵە. لە قۆناغی کۆچەری لێکتر جیا دەبێتەوە ئەمەش لەوولاتی نێو دوورو باردا (بین النهرین) دیجلە و فورات و چیاکی زاگروس. کە چاکترین شوێن بوو بۆ مێژوونوسان تا بیکەنە نمونەی لێکۆلینەوەکانیان بۆیی سەرەتای گۆرانکاری لە قۆناغەکانی دروستبوونی کۆمەلگا و نەتەوە. سەیرتر لەوە کێ ووتی (ئەژدیهاك) خەڵکی بابل بووە مەبەستم ئەو کەسەی کەبوو

زانی ئەژدیهاك خەڵکی بابل بووە(٣٩) کە ئەمەش وای لێ کردم بەدوای رووداوەکە بگەرێم کەلەناوچەی بابل بووە، هەر لەوێشەوەگەنجەگان رەوانەی

---

(٣٧) منصور مخدوم.. اهمیت کردستان در ادوار تاریخی ایران تا افشاریه ص١٥ص١٦ص١٧

(٣٨) رشید یاسمی (کردو پیوستگی نژادی و تاریخی ص ١١٥ کەلێرە دا لەجیاتی ئەژدیهاك ناوی (پیور ئاسف) دهێنێ. هەروەها بۆ چیرۆکەکە بروانە برهان قاطع ص١٣٩ص١٤٠ یان بروانە فرهنگی طلائي ص٤٦٢.

(٣٩) دیاکونوف – میدیا ص٦٣٨، و. برهان قانع.

چیاكانی زاگروس (كوردستان) كراون و ناویان نراوه گورد و كوردیش كەلەم پێك ﻫﺎتەیە پەیدابووە، سەیر تر لەوەدایە كاتی لەئەنجامی لێكۆلینەوە گەیشتمە ئەو تەناعەتەی كە راستیەكانی مێژوویی لەگەلّ ئەفسانەكە یەكتر دەگرنەوە. كەلە ئایندە باسی لیّوە دەكەین ئەویش دروستبوونی گەلی كوردە، لەو قۆناغەی كە گوتیەكان تێیدا دەژیان، قۆناغی جێنیشبون و دروستبوونی كارە پیشەییەكان لە پەیوەندایەتی كۆچەری لێكتر دەبوونەوە مەسەلەكەش لێرەدا ماناو مەدلول و روحیەت و سەنتەری راستیەكەیە نەك تەفاسیل و بابەتە زانستیەكە بەگشتی وەك ئەوەی زاناكانی ئەنترۆپولۆژیا باسی لیّوە دەكەن چونكە بۆ نموونە تەنانەت ووشەی كوردستان ووشەیەكی تازەیە لەسەدەی شەشەمی كۆچی دوانزەی زاین پەیدابووە كاتێ (سنجر) شای سەلجوقی بەشی رۆژئاوای (هەرێمی جبال) ناونا كوردستان[٤٠]. بەرامبەر بەدەولەتی ئەیوبی كوردی كەهەموو كورد بەشداری تێدا دەكرد سنجرشا كوردێكی نەكردە سەركردەی كوردستان بەلّكو ناوێك بوو بۆ ناوچەیەكی بچوك ئێستاش تەنیا بەم شوێنە لە كوردستانی ئیران دەگوترێ ئوستانی كوردستان كەناوچەی (سنەیە) (سنندج)[٤١] بۆیێ كە باسی دروستبوونی دەكەین دەبێ باسی پێشكەوتن و پەیوەندی كۆمەلایەتی دەوری خەلّكی نیشتەجێ میسوبوتامیای سەرەوە بكەین كە لە كشتوكال جیا دەبێتەوە، بەتایبەتی پەیدابوونی پسپۆری گۆزەو گلێنە دروستكردن و ئەوەی گرینگە وەكو چایلد دەلّی:

(پەیدابوونی ئاسنگەری گەرۆك)ە[٤٢] بۆ ئەوەی بۆ بابەتی ئێمە گرینگە ئەوەیە بۆ گوزەو گلینە دروستكردن پسپۆرەكان لەنێو خەلّكی نیشتەجێ دا

---

(٤٠) لسترنگ – بلدان الخلافة الشرقية ص٢٢٧.

(٤١) سنندج – سنە دژ = بەرای من لەمانای قەلای سوونەكان دێت سوونە + دژ (قەلاّت).

(٤٢) نەژادی كورد – رەوتی مێژووی دورستبوونی میللەتی كورد وەرگیرانی رشاد میران ص٣٢.

بەدوای كار دەگەران و سەریان هەڵدا و لەنێو دانیشتوانی كۆچەریدا گەشەیان سەند چونكە پێشتر پیشەكاری نەبوو، لەرۆژانی ئیمرۆكەشدا پیشەكاری سەر بەكۆمەڵگای نیشتەجێیە نەك كۆچەری لەگەشە سەندی كشتوكالیشدا كشتوكال و بەراوو باخچەوانی پەیدابوو، پەیوەندی بەجیا بوونەوەی كشتوكالی لەئاژەڵ بەخێوكردنەوە هەیە. بەشێوەیەكی تر كشتوكالی لەم شوێنەدا لە لەگەڵ ئاژەل بەخیوكردندا گەشەی سەند و زاراوەی (جوتیارە ئاژەڵ بەخێو كەرەكان) لەلایەن (چایلد) بۆ دانیشتوانی چەرخی (نیولیتی) بەكاری هێناوە نمونەكەشی كاولگەی (تل حسونە) یەكە لەدەوروبەری موصل ی ئێستا دایە. رەنگبێ بگرێ بۆ كارە و خەلكانیش بەكار ببری كە كیسنوفون دوای چەند هەزار ساڵێك باسیان دەكات كاردۆخیەكانیش لەبنار شاخ دەژیان باخچەوانی ترێ و ئاژەڵ وكار كردنیان پێكەوە دەكرد، پیشەی پێشكەوتووی جۆر بەجۆریان هەبوو، لەماڵەكانیاندا شەر كەرەكانی كسینوفون. (ئامێری و تفاق برونزی زۆریان دۆزییەوە)) كەواتە ئەو سەردەمە نزیكە لەسەردەمی جێنشیبون و رەوەندی بەجێ هێشتن و پەیدابوونی پیشەكاری كەبەمانای دروستبونی كۆمەلگاو نەتەوە لەوانەش نەتەوەی كورد، یان راستتریش مانای ناوی (كورد) یان راستی بەدەستەوە دان كە كورد لەكردەوە و كردار و (كرد) موزارع و كشتوكاڵ و كردارە پیشەكاریەكانەوە هاتووە- پالپشتی ئەو بۆچوونەمان دەكا كەساڵەهایە ووشەی كورد و كرمانجمان شێ كردۆتەوە تەنیا بەمەسەلە زمانەوانیەكە بەرووتی ئێستا لەگەڵ هەمان سەردەمی دروستبوونی كورد دەگونجێ وەك ئەفسانەی كاوە لەراستی سەرەمی كاوە لە وولاتی سۆمار (سۆمەر). بەمانا گەیشتنەوەیەكی لێكدانەوە زمانیە وانیەكەو ئەفسانەی ئەژدیهاك و كاوەو راستیەكانی ئەركولوجی كاوە لەناوچەی (بابل و سۆمەر)دا كە ئەم سێ خاڵە لەهیچ شوێنێكی دیكەی ئەم جیهانە وا بەیەك ناگەنەوە... ئەگەر بنەمای راستی نەبێ یان راستی دۆزینەوە. پالپشتی ئەم بۆچوونەمان دەكا كەوا كورد لە

(گورد) گوردان – گردان – بەخاوەن كردنـــی (خـاك) وە هـاتوە لـەو كاتـەی كەخاوەنی نەبووە هەر كەسەو پارچەیەكی خاكی گرداوە بۆ (پاوان)ی ئـاژەڵ یـان بۆ دێهات دروستكردن یـان كشـتوكال دواتـر ووشـەكە لەسـەر زمـان سـوك بـووە و سـواوە بـووە بـە (كـورد) هـەروەكو چـۆن (گـار) لەگـەردان و جولانـەوە هـاتووە دەبینین یان بەگركەوتن – گـەران و سوران. بـاگوردان گـەریدە. چونكـە گـەریدە جیایـە لـە گـەڵ گـوردان – كەلـە (گونـد) و جێنشـبون نـاوەند– راوەندەیـە بەپێچەوانەی لەسەر شێوەی (سـەماوەند) (زەمـاوەند) (گۆڤـەند) بەئاشـكرا گونـد دروستبوون مانای جێنشبون دێت كەوەك وتمـان (گـەه +وەنـد) وەنـد پاشـگرێكە بەمانای خۆبەستنەوە دێت بەكارێك لەسەر شێوەی (بەند).. پا (بەند)(بوون) دێت بەكارێك لەكارەكانەە (گاه) مانای دیارە جێگایە. شـوێنە. ئـارە. كەواتـە گونـد – گاهوەند پابەندبوونە بەشوێن. رەوەنـد (راەوەنـد) پابـەند بوونـە بـەرێگا و هـاتوو چۆكردنی لەنێوان زستان هەوار و هاوینەهەوار. یان كوێستان (كوەسـتان) و ئـاران – یـان گەرمەسـار (گەرمەسێر) ئـەم لێكدانەوەیـەش بـۆ كـورد لەگـەڵ وشـەی (كاردوخی) نامۆنیە كە بۆی هەیە (كوردك) لە(كار+دوخ) ەوە هاتبێ (كـار) مانـای دیارە (دۆخ) دۆخی جاران بەمانای شوێنی جاران دێت كە ئەو كاتە (كاردۆخ)ی بـە مانای جێنشیبون و كار لەجێوە كـردن دێـت كـە كشـتوكال و كـاری پیشـەییەكانە هەمان مانای گوڕدان و (گردمانجـەهی) (كرمـانج)دێـت لەبـەر ئـەوەی رێـك هـەموو لقەكان و بۆچوونەكان یەك رەگن و یەكرەنگی پێشان دەدەن و لەیەكتر نـامۆنین و هاورەسەن و هارمۆنین لەزمان و مێژوودا.




**دووماری سومبولی ( ننكشزیدا - اژدیهاك ) كە پەیوەندی لەگەڵ ( گۆدیا - كاوە )وە هەیە**

# ووشەی کورد و کرمانج
# لە ووردبوونەوەکانی ئێمەدا

ئێمە زۆر باسی ئەوەمان کردووە کە (کرد) بەفارسی بەمانای (مزرعە) دێت شوێنێکی خوشکراوو دەورە دراو بۆ کشتوکاڵ کردن کورد لە گوردەوە هاتووە – بەبیرکردنەوەیەکی تازە کەمەبەستمان گوردانە) نەك گورد بەتەنیا بەمانای ئازاو پالەوانی کلاسیکی چونکە ئازاو پالەوانیەتەکە لە گوردانی شوێنەوە دێت هەروەها پارێزگاری کردنی شوێنەکە. کەواتە گردانی شوێنی چۆل و بێ خاوەن و کەلەو کاتەی هێشتا هیچ سنورێك لەجیهان نەبوو هیچ شوێنێك خاوەنی نەبووە کە کورد بۆ خۆی خاکی (گرداوە) بۆیی بەپێی ئەم زاراوەیە( (کورد) کۆنترین جێنیشنی ناوچەکەیە) بەڵکو ئاری رەسەنی سەرەکیە – خەلکانی دیکە دەبنە لقی ئاری بەهۆی کوردەوە کەواتە کورد کونترین و رەسەنترین سەرچاوەی ئاریانە. چونکە تەنیا لەزمانی کوردیدا ئار = بەمانای شوێن دێت بووەتە پاشگرو پێشگری زۆربەی ناوی شار و دێهات و چیاکانی. وەك (هاوئار) هەوار یان (شار) شاهانە +ئار– یان (شاە +ئار) شوێنی شاە لەهەمان کاتدا دەبێتە ناوی مەلیك لەسەر شێوەی (شاهی ئار) کە دیارە سۆمەریەکان هەمان مەبەست زاراوەی (شار) یان بۆ مەلیك مالك خاوەن بەکارهێناوە. یان ووشە (هاوار هاوار) بەمانای هاوئارینە بمگەنێ یان ووشە (ئاری) کەلەهەمووی گرینگ ترە بەمانای هاوئار دێت (خەڵکی ئاری ئێمەیە) ئار = شوێن نیشتمان دێت وەك زەرزا + ئاری زەرزاری – یان ئار گوش – ئار بل– ئاربیل – ئارماوان ئاری سیدەکان – ئارمەندان – ئاردەلان – (ئارابخا) سوم

ئار – ئیراق –(ئار واق) ئێران (ئاریان) یان بـەهار لـە (بـەە+ئـار) هـاتووە یـان (چ لەئاری دانیە) بەمانای هیچ لەم شـوێنە دانیـە ئەمـەش هـەمووی بەڵگـەی ئاریـەتی کورد و رەسەنایەتی دەسەلمێنێ کە تا ئێستا تاکە زمانێکی ئاریە ووشـەی (ئـێرە) بەمانای ئەم شوێنە بەکار دەهێنێ وەك (وەرە ئێرە) خەڵکی ئێرەیە ئەمەش رەگـی ووشەی (ئار)ەکەیە کەهی (ئاری)یە بەلاَم دەبینین لەزمانی فارسی دا (گاە) جێگـا لەجیاتی (ئێرە) بە کار دێت (بیا ئینجا) بیا = وەرە – ئینجا = بەمانای ئێرە دێـت ئەمەو زاراوەمان یەکجار زۆرە بۆ سەلماندنی ئەم دۆزینەوەیە[٤٣] ئەوەی لێرەدا (لە ئـێرەدا) مەبەسـتمان بـوو لەسـەر (کـورد) کـوردەواری ووتمـان بـەلاَم زاراوە (کرمانج)ماوەکە هەمان جمکی ووشـە و زاراوەیکوردە – بـابزانین چـۆن ووشـەی کرمانج هەمان مانای ·کورد) دەداتەوە خۆ ئەگەر لێکتر نامۆ بـوون چ لـەمانا یـان رەگەزی زمانەوانی ئەوا بۆ چوونەکانی پێشوومان هەلدەوەشێنێتەوە ئێمـەش ئـەو کاتە بەزانستیانەی نازانین بەدوای راستیەکەی دەگەراین بەلاَم ئەگەر ووشـەی یـان زاراوەی (کرمـانج) یـەك بنەمالـە بـوو لەگـەلّ سـەرجەم رەگـەزە زمانـەوانی و مێژوویەکان ئەوا پەیوەندیەکان و راستیەکان دەبنە بناغەی دۆزینەوەی زۆر راستی دیکـەو جێگـای متمانـە. چونکـە هـەر لـێرەدا ووشـەی کرمـانج لـەمانای کـوردو جێنشیبون و کشتوکال و گوند لێکمان نزیـك دەکاتـەوە و قۆناغـەکانی گۆرانکـاری بەیەك دەگەنەوە ووشەی (کرمانج) لە (کر+مان+جە) پێك دێت.

کرد ووتمان لەکردەوە و گردان هاتووە کەواتە ووشەکە دەبێتـە (کـرد+مـان +جە) بەمانای (گـردار کـردن+ لەشـوێنی مانـەوە (مانەجـە) جێگـای مانـەوە نـەك کردارکـردن رەوەندایـەتی و کۆچـەری – لـەزۆر شـوێن کەسـەرەتای لێکـتر جیابوونەوەی گەریدەیی و گۆردەیی‌یە کرمانج ناوێکە رێك بـەمانای جێنمشـبوون و

(٤٣) بۆزیدە زانیاری بروانە ئارو سەدو یەك دۆزینەوە لەزمانی و مێژوودا گۆفاری هەولێر – ژمارە (١١) عبدالخالق سەرسام.

کارە پیشەیی‌یەکان و گوندایەتی دێت کەبەشانازیەوە ناوی کـوردە کـە کینایـە بـۆ یەکەم جێنیشیبوون و یەکەم گردانی خاك لەلایـەن کـوردەوە کەئەمـەش داهێنـانی یەکەمی ئاریەتی و نیشـتمان پێك وەنانـە– تەنانـەت (نشـیتمان)یـش وەك وتمـان بەمانای نشیتن +مان دێت بەمانای (شوێنی مانەوە) نیشتن و جێنشیبون و مانەوە دێت شوێنی (دانیشتن و مانەوە) نیشـتەجێ بـوون. بەپێچەوانـەی رەوەندایـەتی و ئەوە کونەکانی کوردە کەواتە لێرەدا من دەمـەوێ هیـچ گومـانێك نەهێلمـەوە– بـۆ دۆزینـەوەی راسـتیەکان. یـان دەسـت لەسـەر راسـتی دانـان. کەئـــەم کـارەش وا بەئاسانی نەکەوتە دەست کەئێسـتا بەچـەند دێرێك باسـی لێوە دەکـەین.. بـەڵکو چـەندین ساڵە لەبـەر دەسـتمانە لێکۆلینـەوەی لەســـەر دەکـــەین بـەلام بلاومــان نەدەکردەوە نەوەك تووشـی هەلەیـەکی زانسـتیانەی نـا منطقـی و مێژوویـی بـەبێ زانینی فۆنەتیك و هەموو شێوە زمانەکانی کوردی و فارسی زمانەکانی دەورو بەرو میتودیان شارەزابێت کەماندووبوونێك و تەمەنێکی دەوێ تا مرۆڤ تووشی هەڵـەی گەورە نەکات کە کورد تێیدا زەرەمەندبێت ئەم دۆزینەوانەش قۆناغ لەدوای قۆنـاغ وەك زنجیرە پابەندی یەکتربوون هەر لەزمانی کوردی نەزانین بوو زۆر جاران زانای گەورەی وەکو ئو. ل ڤیلچڤسکی و دیـاکونوف و ق– کـودۆش مینورسـکی توشـی هەڵـە کـردووە. دەسـەلاتی ئـەوەیان نـەبووە بـوە هـۆی هـەندێ راسـتی سـەرەکی بەرجەستە بکەن. هەندێ هەلقەی مێژووی کوردیش بەپچر پچراوی گومان لێکراوی بمێنێتەوە و دوژمانیش شێوانکاری تێدا بکەن. سوپاس بۆ ئەو زاناو مامۆستایانەی سوودم لێ وەرگرتوون وەك بەردەباز بۆ گەیشتن بەراستیەکان. ئەم لاپـەرە تازانەی کە بۆ گەلە خۆشەویستەکەم و راستی تۆمار دەکـەم بەتایبـەتی دزینـەوەی رەگ و پاشماوەی (گوتیەکان) بەهۆی سەربردەی کاوەی ئاسنگرەوە. ئاسانکاری دروست دەکا بۆ دۆزینەوەی هەموو هەلقەکانی دیکەی مێژووەکەمان وەك چۆن دۆزینەوەی زێدی باپـیرانی سلاحەدین لـە (دویـن)ی هـەولێر مێـژووی هــەموو هـۆز و تــیرەو

ناوچەکەی ئاشکرا کرد و لە گۆڤاری هەولێرو شوێنی دیکەو بەکتێب بڵاوەمان کردەوە. لێرەش دەڵێم ماوەیەك بوو خەریکی پاشماوەی (ماننا‌کان) بووم و هەموو بۆ چونەکانی خۆم لەم زوانە بلاو دەکەمەوە هەروەها راستیەکانی (هەکاریەکان)و بێت گارا پەیوەندی لەگەڵ (بیت کاری) و (چیای گارا) کەیەك مانایە مەبەست لە هۆزەکانی سەرووی چیای گارایە. کە ئێستا ناوی شوێنی کوردەکانی تورکیایە کاتی خۆی بەناوچەی گاراش هەمان ناوی هەبووە، لەسەر دەمی سەلاحەدین وپێشتریش ئاشوریەکان. کەلەگەڵ ناوچەی گاردۆخی - کاردۆخی و گارد و گورد و کورد گونجاوە.... هتد بۆیێ بۆ هەربابەتێك بەشێکمان تەرخانکرد لەم لێکۆلینەوەیە.. لەکۆتایی ئەم پەرگرافە دەڵێین لەو کاتانەی کە کورد لە گروپی جیا جیاو هۆزی جیاجیای کۆچەر پێك هاتبوو ئەو هۆز و گروپانە هەریەکە و لەسەردەمێك دەولەتەکانیان بەناوی خۆیان کردووە - وەك (ماد) و گوتی کاردوخی لولو ... هتد کە زۆرینە بەڵکو هەموو کورد کۆچەربوون بەلاّم دواتر کە وورده وورده جێنشیبون و خاکیان (گردا) و دەستیان بەکشتوکال و و گوند دروستکردن کرد. خەریکی کردمانجەیی بوون ئەم ناوە شموولی هەموو ئەو کەسانەی کرد بەگشتی کەلەنێو ئەو هۆزانە جێنشیبون و نیشتمانیان پێك وەنا تا بەناوی (کورد) یەکتریان گرتەوە یان ناوە جیاجیاکان چونە ژێر باڵی یەك ناوەوە کە (کوردە) بەمە گەلی کورد دروستبوو گەلی کود نەشونمای کرد چووە نیو شارستاینەتی مێژوو زمانی هاوبەشو کەلتوری جێنشی دروستکردن لەگەڵ سنووردانان بۆ خاك و مولکداری و پارێزگاری کردنی، کەئەمەش شێوەیەکە لەدەولەت دروستکردن. لەمێژوودا. سەرەتاکەشی دەگەرێتەوە سەردەمی سۆمەریەکان وەك کە زێتر لە ٤٠٠٠ سال بەر لەئێستاش کە بەلگەمان بەدەستەوەیە بەلام ئەمە نابێتە سنوور دانان بۆ وازهێنان لە کۆچەری کە ئێستاش هۆزمان ماوە هەر کۆچەرە وناوی تایبەتی خۆی هەیە لەدەرئەنجامدا لەچیرۆکی

کاوەو دیالیکیتە کـی مێژووییدا نـاوی (کـورد) لەسـەردەمی گوتیـەکان پـەیدابووە ئەمەش هەندێ بیروڕای دیکە:-

ڕەشید یاسمی لە کتێبەکەیدا کورد و نژادی پەیوستگی لا ٨٨ دەڵێ:

ناوی کورد Karada لە تابلۆیەکی سۆمەریدا نووسراوە[٤٤].

لەلاپەرە ص ٣٦ هەمان کتێبـدا دەڵێ نـاوی کـورد لەسـەر دەمـی سـوبارتو بەشێوەی Kada هاتووە

لەلاپەرە ص٨٩ هەمان سەرچاوە دەڵێ:

بەشێوەی زمانی ئـارامی بـەکوردیان دەگـوت (بێـت قـردو) Beth karda بـەئارامی بـە شـوێنی کوردیـان گووتـوە، ئێسـتاپێی دەڵێـن (جزیـرە ئــبن عمــر) Gazartad Kardu گزر تا دو قردو[*] ئەرمەنیەکان بەکوردیان گووتوە (کـردوخ) بلاذری و طبری (بقردی) قـردای شـوێنی کوردانیـان تۆمـار کـردوە، منیـش دەلێـم چەندین گونـد لەناوچـەی هـەولێر هەیـە بـەناوی (بـاقردە) لـە ڕۆژئـاوای خـوارووی هەولێر لەدەشتی مخمور و قەراج و نیوان زاب و شاری هەولێر. بـاقردە لـە بـاگردە (بانەکوردە) وە نزیکە لە (کارتـاوی)[٤٥] کـە دەبێتـە (گـارداوی) هـەروەها وشـەی (گارا) کوردەکانی (گارا) یان (بێت گارا) کە لە نوسـوینەکانی ئاشـووریدا هـاتووە. لە لاپەڕە ٩٠ هەمان سەرچاوە هاتووە دەڵێ: یەکەم گوند کە دوای (توفـان) نـاوی هاتووە (گوندی بقردی)یە[٤٦].

گز نوقون بە (کوردك) ناوی کورد دەبـا Gyrti بـەلام ئـەم ناوانـە لەهـەر سـەردەمێك دا هـاتبێ.. ئێمــەی لەگــەران و بــەدوا داچوونــدا نەوەســتاند ئێمــە

---

(٤٤) کوردو نژادی پیوستگی لا ٨٨ ڕشید یاسمی.

( * ) ئەم ناوە پاڵپشتی ناوی (جیٚ زیرە) دەکا کە کوردیە چونکە پێش هاتنی عەرەبەکانە.

(٤٥) دائرە المعارف الاسلامیە، و. لیوا روکن محمد نجم الدین النقشبندی، ل٤٨-٥٠.

(٤٦) کوردو نژادی پیوستگی لا ٩٠ ڕشید یاسمی.

گەڕاینــەوە ســەر شــێ کردنــەوەی زمانــەوانی ووشــەی کــوردو پــەیوەندی بــەمانا و مێژووەوە. بــە کورتــی زۆربــەی ســەرچاوەکان (کــورد) لەگــەڵ (گــورد)[٤٧] پابــەند دەکــەن، هــەندێ لەوانــە کــە دەڵێــن کــورد لــە کاردۆخیــیەوە هــاتووە رێك لەگــەڵ بۆچوونەکانی ئێمەدا دەگونجێ – چونکە کاردۆخییەکانی گزنیفۆن بەشەڕ دەهــاتن (گوندی) بوون کۆچەر نەبوون وەك باسیان دەکا کە دەچێتە گوندەکانیان سەیری کەرەستەی ماڵییان دەکا سەرەرای ئەوەش زاراوەی (کــاردۆخی) مانــای (گــورد) و (گوڕدان) و جێنیش بوون دەسەلمێنێ، وەك کاتێ کە پێشتر شێمان کردەوە (گــار + دۆخ) گار = بەمانای کارکردن و گڕدان دێت دۆخ = بــەمانای دۆخــی جاران دۆخ بە مانای شوێن دێت کەواتە هەمان مانای (کورد + مــان + جــە–جێگــا) دەداتــەوە کە دەکاتە کارکردن لە دۆخی خۆی لە شوێنی خۆی لە سنووری خۆی، کە ئەمەش بەڵگەی شارستانییەت و جێنیش بوونی کوردە وە گوندایەتییە بۆچوونەکەی نــاوی کورد بەهێزتر دەکات. ئیتر نووسەرە کوردە ساویلکەکان ئەم هەموو مێژوو و ناو و بەڵگانــەی جێنیشــبوون و کۆنــی کــورد لــە ناوچەکــەدا بــەقوربانی دوســەد ســاڵەی مێژووی ئەکەد وماوەیەکی کەمی مێژووی (بابل) دەکەن، کەماوەیەکی زۆر کەمە لە نێو هەزاران ساڵەی مێژووی کورد لەناوچەکەدا.

---

(٤٧) دائرة المعارف الاسلامية، و. لیوا روکن محمد نجم الدين النقشبندي، ل٥٠.

# ئارییان و هۆزەکانی کورد لەناوچەی سۆمەر و (بابل کردنیاش) (بەدرێژایی مێژوو)

ئێمە پێش ئەوەی باسی ساسانیەکان و دەوری شبانکارە وگاوانی بکەین لەنێوان (نهرین) دەمانەوێ بزانین پێشتر رەفتارو هەڵس و کەوتیان چۆن بووە لەهەمان ناوچەکەدا.

١- لولوەکان - ئارام سن کە بەئینقلابێك وولاتی سۆمەری خستە ژێر دەست خۆی لە ئەکەدەوە هاتە وولاتی لولوەکان قەتل و عامی کردن ئەنفالی ژن و مندالەکانیشی کردن بروانە مەسەللەکەی کە بەشانازیەوە باسی ئەنفالی ناوچەی شارەزوری لولوەکان دەکات.

٢- گوتیەکان لەتۆلەی ئەم هێرشە لەسالانی ٢٢٨٥-٢٠١٦ پ.ز ناوچەی سۆمەر رزگار دەکەن شارستانیەتی گەورەی سۆمەر دوای ئەمە دەست پێ دەکا کەلەم نوسراوەدا بەدرێژایی باسی لێوە دەکەین.

٣- (کیشی) کاشی یان کاسیەکان و بابل کە ناوچەی جینیشبونیان کرمنشاە و پشتکوی ئێستا بووە تا لێواری دجلە ص١٩ [٤٨] اللور الکورد کەسامیەکان پێیان دەگوتن کاشی، کیشی، کوشو زاناو شوێنەوار ناسەکانیشی پێیان گووتوە کاسی، کاسای، کاسیت ص ٢١ لە ص٤١

(٤٨) الکورد الفیلیون جلیل فیلی ص١٩ یان امین زکی بك ص٩٤-٩٥.

کتێبەکەی رشید یاسمی (کورد پیوستکی نژادی) [٤٩] داهاتووە کاتێ کاشیەکان نەیانتوانی (بابل) بگرن. بەشێوەیەکی لەسەرخۆ خۆیان خزاندە نێو شاری بابل تا کاری کشتوکاڵ و کاری سەربەخۆ بکەن هەروەها نهێنیەکانی شاری (بابلیان) ئاشکرا بکەن لەگەڵ ئەو رێگایانەی دەچێتە نێو بابلەوە لەساڵی ١٧٤١ پ.ز سەرمەك (گاندیش) بەهاوکاری گوشی و لولوەکان شاری بابلیان گرت، حاکمی بابلیان کەناوی (سامسو ویتانا) بوو لەناو بردوو ص ٤١ رشید یاسمی.

کاشیەکان نزیکەی شەش سەد ساڵ حوکمی بابلیان کردووە لەشوێنەوارەکانیان، هۆزی جافیش لەهەمان شوێن کاشیەکان لەگەڵ هەندێ هۆزی دیکە ناوچەی بابلیان لەکۆندا عیلامیەکان و بابل و کەشوێنی گاوانیەکان بوو

عیلامیەکان لەسەردەمی شوتروك ناخونتە و پاشی کۆتایی حوکمی کاشییەکان، توانیان بابل بگرن و هەیکەلی مردوك بگوزانەوە هەروەها هەیکەلی حمورابی بۆ (سوسە) [٥٠]

واتە لێرەدا عیلامیەکانیش توانیان بخزنە نیو بابل و دەوروبەری بەختیاری خوزستان ئێستا بەهەمان شوێن عیلامیەکان دەلێن تا بەرەو لێوارەکانی خوارووی دیجلە = یان بەمانایەکی دیکە پاشماوەکانی ئەوانن ص ٣٢ اللور الیلیون الکرد – جلیل فیلی.

لێرەدا ئێمە گەرووردبینەوە لێواری دیجلە و فورات تەواوکەری پێ دەشتەکانی چیای زاگروسە کە خەلکەکەی بەزستانان لەکێوەکان دەهاتنە خوار و ئاژەلەکانیان لەبەفرو سوقمی زستان رزگار دەکرد بۆیێ ئەم شوێنە (ئاران)و زستان هەواریان بوو یا (زم ئار) کە زۆر نزیکە لە (سوم ئار)ەوە. ئەوەی

---

(٤٩) رشید یاسمی، کوردو پێویستی نژادی لا ٢١و لا٤١.

(٥٠) اللور– الكورد الفيليون– جليل فيلي ص٣٢.

ـەبەستمانە لێرەوە لە (تاریخ الشرق الادنـی القدیـم) دا هـاتووە شـاكانی ساسـانی خەلكی ناوچەی عیلام و بابل بوون لـەهۆزەكانی ئـەوین وەك بۆمـان روندەبێتـەوە هەمیشە ناوچەیەكی هاتنە خواروەی هێزەكانی كاشـی و عیـلام بـووە، ئاشكراشـە ـوپای سـەرەكی تیسفون و پایتـەختیان هـەر لـەم هۆزانـەی دەوروبـەر بـووە، كەبەمانای (گاەبانی) دێت وەك مەرەزبان تەخت و تاج و خاك پاراستنە.

٤- میدیا و بـابل: مێـژوو نووسـی بـابلی دەڵـێ: مادەكـان زۆر لەكۆنـەوە لـە بـابل هەبوینە ٢٤٤ حوكمیان كردووە[٥١].

٥- هخامشیەكان: كورشی لەسالی ٥٣٨ پ.ز بـابلی گـرت و جووەكـانی نـاردەوە نەلەستان و پـارەی بـۆ كۆكردنـەوە پەرسـتگاكانیان چـاك بكەنـەوە رێـزی لـەئولی بابلیەكان بگرن[٥٢].

داریوش بابل و ئەكباتان و (سوسە)ی كرد پاتیەخت قمبیزی كورە گەورەی كورش لەقەبی (بابل)ی وەرگرت كورەكەی دیكەی ولایەتەكانی رۆژهەلاتی پێدرا.

قمبیز كوری كورشی كورشی یەكـەم خـاتون ماندانـای كچـی ئەسـتیا گزیـێ خواسـت. كۆرشـی دووەمـی لێ لـەدایك بـوو كەبـەم خزمایەتیـە توانیـان لەگـەڵ میدیەكان حوكمی ئیران و جیـهانی كۆن بكـەن[٥٣]. ئـەو هۆزانـەی زاگـروس چـەند خوداوەندیان دەپەرست ئەویش (میترا) و(ڤارونا) و (ئەندرا) بوو. كەواتە ئەوانەش وەك ئاری بابلیان لەژێر دەست بووە و لێی جینش بوینە وەك بابلی و جوەكانیـان ناردۆتەوە خۆیان بوونەتە زۆرینە كە كـورد و هۆزەكانیشـی لەگـەڵ هخامنیشـەكان بەشداری حوكم بوون. كاوە كە ئاسنگەر بووە - مانای چەكی تیروكەوان كەرسـتە جەنگیەكانی دروستكردووە ئەمەش گرینگە بۆ شورشكردن پر چەك كردنـی هـۆز و

(٥١) حسن پیرنیا- عباس اقبال- تاریخ ایران ص٤٨ فارسی.

(٥٢) سامی سعید- رضا هاشمی- تاریخ الشرق الادنی القدیم ص١١٤، ص٩٦، ص٩٧.

(٥٣) امین زكی بك- تاریخ كرد و كردستان ص١٠٧.

کەسو کاری خۆی لەنێوان کۆمەڵگای ئەکەد و سۆمەردا. شورشەکەی شورشی کویلەکان بووە شورشی گوتیەکان دژ بە ئەژدیهاکی سێ سەر کەلەلای سۆمەریەکان حەوت سەرشیان هەبووە.




٦ ـ الشرق الادنى تحت حكم الكشيين والعيلاميين

## نەخشەی سەردەمی کیشی و عیلامیەکانی باپیرانی کورد

# پاشماوەی منناکان و شوێنی هۆزەکانی

ئێمە لێرەدا شوێنی منناکان دەسنیشان دەکەین تاکو شوێنی گوتیەکان و پاشماوەکانیان ئاشکرا بیّ لەلامان کۆن و ئێستادا کە دەکەوێتە خواروی شوێنی منناکان.

منناکان وەك میدیەکان، گوتیەکان، کاردۆخیەکان-فیدراسیایەکی هۆزانی کورد بوون لەناوچەو دەوروبەرو خواروی دەریاچەی((ارومی)) ئورمی(ئار+ما) جێنیشبون. ئار=شوێن میّ-ما= مان بەمانای(ما) مانەوەدێت. کەهەمان مانای هۆزی(مننا) کانە بەمانای ئەوانەی مانەتەوە ناچنەکۆچەری کە ئاشکرایە ئەوانەی جێنیش بن شارستانیەت پێك دێنی وەك چۆن زەردەشت لەناوچەی منناکان سەری هەلّدا لەتەك شاری(ارومی) نەك(اورمی) کە راست نیە جێگۆڕکێی(ور) کردووە. بە هەر حالّ ئەو هۆزانە لە کوێستانەکان دادەنیشتن و شوێنیان فێنك بووکە بۆ هاوین و زستان دەگونجیّ بۆیێ کۆچەریان نەکرد یان هەر زوو وازیان لە کۆچەری هێناوە ئێمە گەر بە وردی سەیربکەین شوێنی منناکان-هەمان شوێنی مهاباد و مەراغە و بانە و مەنگورو مامش و خۆشناوەتین لە کوردستانی گەورە. بۆیێ ئەگەر سەیر دەکەین هۆزی کرمانجیشی لێیە کەواتە زۆربەی هۆزەکانی ناویان بە(م) دەست پیّ دەکا تەنیا خۆشناوو پیران نەبێت کە بەڕای من(پیران) لە چینی پیرانی زەردەشتیە وە هاتوە. گەورترین هۆزی پاشماوەی منناکان لە هەمان شوێن بە هەمان ناو هۆزی(مەنگورە) کە بەراو وردبونەوەی من

لە(مان+گور) (مان + گە(جێگا+ ئار) هاتوو(مان) هەمان پاشماوەی ناوی(ماننا)یە لە مانەوە هاتووە کۆچەرنین یان خەلکی رەسەنی ناوچەکەن.(گور) کەور بە مانای جیا دێت یان(گور) گەورە بە مانای شوێنی سەرەکی وەك (گـورە اربـل)..هتـد کـە مێژوونوسان شارەزان یان وەك(گۆرە پان) کەواتە(مان گور) نزیکە لە (مان گـورد) گرِدانی شوێنی مانەوە بە مانای شوێنی مانناکـان یـان پاشمـاوەی مانناکـان دێـت وەك (تورکمان) ئەو (تورکانەی مانەتەوە) لە ناوچەکە بە پێچەوانەی (تـورك) یـان گوندەکانی خۆشناوەتی مـاوەران=مـاو+ئـاران ئەوانـەی لـە ئـاران (زسـتان هـەوار مانەتـەوە) بروانـە هەمبانـە بۆرینـە ((ئـاران)) یـان (ئـار). یـان (مـان). یـان نـاوی گوندی((ئار ماوان) هەمان ناوە بە پێچەوانە ماناکەی دیارە ئار = شـوێن+مـاوان)) ئەوانـــەی مانەتـــەوە کەهـــەمان مانـــای (مانناکانـــە). هـــەورامان رەگـــی ووشەکە(ئورامان)ە کە لە(ئار مان) هاتووە ئاری مانەوە نەك شوێنی ئاگر کە(ئـازر بیجان) بە مانای شوێنی سەرهەلدانی ئاگری زەردەشتی دێت کـە لەرەسـەندا(ئـاتر پایگانە)،(ئاتر) بەمانای ئاگر. نەك(ئار) کە بـەمانای شـوێن دێـت بـەزمانی کـوردی وەك(چ لـە ئـارێ دانیـە) یـان(ئـاری) هـاو شـوێن(هـاو ئـار) هـەوار کـوردەواری = کوردەواری–(کوردو+ئاری) کە(وار) شوێنە وار–هەمان مانـای(ئـارە) وەك(گولـزار) گولز+ئار، نسا+ ئار= شوێنی سێبەر هتد. کەواتە تورکمان ئەوتورکمانەن مانەوە جێنیش بون. یان ئارمانج =ئار =(شوێن+مانجە)،(شوێن+ مان+جە) ئەو شـوێنەی دەمـەوی بیگـەمێ جێگـای مانەوەمـە(ئـار+مـان+جـە) جـە=جێگـای مانـەوە یـان کرمـانج= کەلـە هـەمان شـوێنی مانناکـان هەیـە یـان (ئارمـان) هـەوئارمان (هـەورامان)لـەخواروی شـوێنەکەیە بۆیـی کرمـانج لـە کردمانجـە وە هـاتوە کرد+مان+جە= ئەوکوردەی لـە شـوێنی خـۆی لـە جێگـای مانـەوە کـار دەکـا کـە دەکاتە(گوندی) گاە وەنـدی (گاەبـەند)ی بـەجێگاوە بـەند بـوو ، (کشـاوەرز)ی جۆتیاری دەکا هتـد..نـەك رەوەنـدی، لـە کۆتـاییدا بـە هـێزترین و وشـەو زاراوەی

بەڵگەدار دەخەینەبەر باس و لێکۆڵینەوەکە بە پاشگر (مان) کۆتـایی دێت ئـەویش ناوی (نیشتمان)ە کەلەنیشتن+ مان دێت بەواتای‌شوێنی نیشتەجێ بوون و مانـەوە کە وشەیەکی رەسەنی کوردەوارییە، کەواتە نیشتمان هیچ گومانێگ ناهێڵێتـەوە بـۆ راستی بـۆ چونەکـەمان. لەسـەر پاشـگرو پێشـگری (مـان) کـە لێکۆڵینەوەیـەکی تایبـەتیم لەبـەر دەسـتدایە. کەواتـە (ماننـا)کـان بـەمانای جێنیـش بـوە.. نیشتەمانەکان یەکەم گروپ و هۆزی نیشتەجێ بووە وازی لە کۆچەری هێناوە هـەر بۆیـەش (ئارمـان) هـەوئارمان (هـەورەمان)یـەکان هۆزێکـی گـەورەی کـوردن خـەریکی پیشەسازی و کەرسـتە دروسـتکەردن بوینـە کـە بەڵگـەی جێنشـبون و مانەوەیانە لە پێـش چـوار هـەزار سـاڵ بـەر لـە ئێسـتا نـاوی لـە مێـژوودا هـاتووە وەباسمان کردوە شان بەشانی ماننـاکان– یان هەر خۆیان بـە شـێکی لـەماننـاکان. ئەم چەند زانیاریە خێرایـە پێناسـەیەکی لێکولینەوەیـەکی تێروتەسـەلە لـە ئـایندە خواتەمەن بدا بڵاوی دەکەمەوە لێکولینەوەی دورو درێژی وەك گوتیـەکانی لەسـەر دەکەم کە شوێنیان سەروی گوتیەکان بوو..

مانی پەیامبەر و وێنەکێش کە ئاینەکـەی لـە زەردەشـتییەت و مەسـیحیەت پێك هاتبوو خەڵکی مەراغە و ماننا بوو لە ناوەکەی را دیارە مانی بـەرای ئێمـە بـە مانای خەڵکی ماننا دێت کە مەراغە یـەك لـە پایتەختـەکانی ئـەم شـوێنە بـووە لـە دواتردا.

بەڵگەی ئەوەی کە ماننـاکان جێنیش بووینە لە ل٢١٣ دیاکۆنۆف لەم دەقەدا دەڵێ:

((*ماننا زۆر لەبار بوو کە ئابوری تێیا پێش بکەوێ بـە مەرکـەزی ئـابووری و سیاسـی سەرانسـەری ناوچـە کوێسـتانییەکان رۆژهـەلاتی ئاشـوور دائـەنرا بۆیـە هەوڵیان دا دەوڵەتێك دروست بکەن تەنیا سەربەخانەدانەکان بێت بـەڵکو نوێنـەری هەموو چەوساوەو ئازادیخوازەکان بێت*)).

هــەروەها لــە لا٥٨٤ دکتــۆر ئــە. تیۆریــن لەوبڕوایەدایــە (مانیــا) Maniya نووسراوی بێستوون ١٤ لا٢٢٩-٢٢٨ هەروەها ٢٠٣) بە مانای خــەڵکی خــانوو واتــە خانەخوێی ناوبردووە ٥٨٤. لێرەدا هیچ گومــانێك لــەلای مــن نــامێنی کــە بۆچوونــە زمانەوانییەکەمان لەگەڵ ســەرچاوە یــەکدیگروو ڕەوانــە چونکــە (خــانوو خانــەدانی پابــەندە بــە جێنیــش بــوون و مانــەوەو کۆچــەری نــەکردن و شارســتانییەت و دێهاتنشینی). ئێمەش بۆ یەکەمجار لە مێژوو تۆماری دەکەین وەك بنەمای زمــان و نەتەوەی کورد.

لــە کۆتــاییدا بــەهێزترین ووشــەو زاراوەی بەڵگــەدار دەخەینــە بــەر بــاس ولێکۆڵینەوە کە بە پاشگری مان کۆتایی دێت ئەویش ناوی (**نیشــتمان**)ە، کــە بــە مانای (نیشتن + مان)، دێت کە بە واتــای شــوێنی نیشــتەجێ بــوون و مانــەوە کــە ووشەیەکی ڕەسەنی کوردەوارییە نەك (وڵات) کە لە ویلایــەت و والییــەوە هــاتووە. کەواتــە نیشــتمان هیــچ گومــانێك ناهێڵێتــەوە بــۆ بۆچوونەکــەمان لەســەر پاشــگرو پێشگری (مان) کە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتیم لەبەردەستدایە کەواتــە (ماننــا)کــان بەمانای جێنیشبووەکان، نیشتمانەکان یەکەم گرووپی هۆزی نیشتەجێبووە وازی لە کۆچەری هێناوە هەر بۆیەش (ئارمان) (هەوئارمان) (هەورەمان)ییەکان هۆزێکی گەورەی کوردن خەریکی پیشەسازی و کەرەستە دروست کردن بووینە بە درێژایــی مێژوو کە بەڵگەی جێنیــش بــوون و مانەوەیانــە لــەپێش ٤٠٠٠ هــەزار ســاڵ بــەر لــە ئێستا ناوی لە مێــژوودا هــاتووە وە لــە نووســینەکانماندا باســمــان کــردووە و شــان بەشانی بەڵگەکانی دیکە کە ماننا‌کانن یان هەر خۆیان بەشێکن لە ماننا‌کان.

# گوتی جودی گودیا

## (گوت)- (گود)

گوتیەکان[٥٤] بەچوارەمین کۆمەڵی هۆزەکانی ناوچەی زاگروس دادەنرێ. ـەنێو ناوەکانی میدی و لولو ،کاسی و هوری کاردوخی و ئیلامیدا کەهەمویان ئاری و رەگوبنەمای کوردن.لەبەر نەبوونی پیتی (گ) لەعەرەبیدا بە (جـودی) تۆماریـان کردووە.

گوتیەکان لەهەزارەی سێهەم و دووەمی پێش زایین ناویان بەدیار دەکەوێ. گوتی جودی بەو ناوچانەیان دەگوت کـە دەکەویتـە رۆژهـەلاتی و ژووری رۆژئـاوای ـولوبییەکان. گوتی بەو جۆرە هۆزانە گوتراوە کەدەکەوێتە سەروی رۆژهەلاتی بابل، ـەزارەی یەکەمی پێش زایین بەسەرەوە هەمو ئوراتوییەکان و خەلکی ماننـا و مـاد پیێیان دەگوتن (گوتـی)[٥٥] بـەلام هـەندێ جـار لەنووسـراوەکانی سـارگونی دووەم (مادەکـان) لـە (گوتیـەکان) جیـا کراونەتـەوە گوتیـەکان لەسـەدەی ٢٣پ.ز ـەسـەردەمی سـەلتەنەتی (ئـارام – سـوئن) پادشـای ئەکـەد کەناوچەیـەکی زۆری لـەژێر دەسـت بـوو لەگـەلّ گوتیـەکان جـەنگاوەو وەك لەوێنەکـەی دیـارە چـۆن

(٥٤) لەکتێبەکەی (خشتەکانی شمشارە) یورگین لێو. و. عەزیز گەردی لا ٥٣ بە (گوتها) هـاتووە. یـان لە دیاکونوف (میدیا) لا١٦٨ بە (ئوتویان، ئودیـان، ئودینـان، ئاتنیـان، یـان لـە لا١٧٢) بـە گودیا (کودەئا) هاتووە شێخ محمد مردوخ کردستانی بە (گودی)(جودی) لا٩٢-٩٣ کوردیا- کودیا.

(٥٥) بڕوانـە لا ٢٤٢ فیلجیفسـکی نـەژادی کـورد، و. رشـاد مـیران گوتـی گوتیـوم کـە چـۆن بـە میدییەکانیش دەگوترا (گوتی)، ئـەمین زەکـی دەڵێ: (ئەگـەر دیراسـەی نـاوی خێڵە کوردییـەکان بکـەی دڵنیـا دەبـین گـەلێ لـەو خێڵانـە لـە رابـردوودا دەوری باڵایـان هـەبووە، ئێسـتاکە تـەنیا بنەماڵەیەکی بچووکن هەمان سەرچاوە لا ٢٤٣، بـۆ سـەلماندنی نـاو زێدەزانیـاری بڕوانـە لا٥٦-٥٩ هەمان سەرچاوە.

دیهاتیەکان دەکوژێ و بەسەر چیاکان دەکەوێ خەڵك ئەنفال دەکا بۆ ئەوەی لەخوارووی ئیراقی کۆن بیانکاتە گاوان و شوان و کارکردە. بەلآم هەر بەدەستی گوتیەکان لەناوچووە (یاکوسون) سۆمەری ناسی و دانمارکی دەلیت کە (ئانریداوازیر) پێشەوای گوتیەکان توانیویەتی شاری (نیپور) پیرۆزی سۆمەریەکان حوکمرانی بکات لەگەڵ ناوچەی (بین النهرین) [٥٦].

ئەکەدیەکان کلاوی مسیان لەسەر بوو. کاتێ هێرشیان کردە ناوچە چیایەکانی زاگروس و (ئارام سن) دو قۆچی وەکو ماری لەسەری بەستبووەوە بەدیوی پشتەوە. ئەکەدیەکان سامی بوون بۆی هەیە لەو هۆزە سەرەتاییانەی عەرەبی ئەو کاتە بوبن کەلە جزیرەوە بەرەو لێواری رووبارو ئاوەکان دەهاتن. شوێنی ئەوان ووشك وبێ پیت و بێ ئاوو بوو.. هێرشی ئەکەدیەکان و بەدیل گرتنی گوتیەکان و گواستنەوەیان بۆ ناوچەی سەرووی (عەرعەر) یان بین النهرین ئەمە وای لە گوتیەکان کرد هۆزەکانیان کۆ بکەنەوە تۆلەی خۆیان لەئەکەدیەکان بکەنەوە. (هەر لەنێو دەولەت ناوچەی ئەکەد دا خەڵکانێك هەبوون یارمەتیان دەدا لەدژی ئەکەد) [٥٧] لێرەدا بۆمان روون دەبێتەوە خەلکانێك هەبووە یارمەتی گوتیەکانیان داوە. کە روون و ئاشکرایە ئەو خەلکانە گاوان و کاسبکار و ئاسنگەری گەرۆکی گوتن و بەدیل بردراوان بوینە یەك لەو خەڵکانە (گۆدیا) بووە

(٥٦) دیاکونوف– مید ل١٦٢.

(٥٧) هەمان سەرچاوە ل١٦٣ یان ل ٥١ (نەژادی کورد) نول. فیلیچفسکی کە دەڵێ ئەو کۆیلانەی شارەکانی نێوان (دووزێ) بە رەسەنی گوتی بوون. گوتییەکان بە (ئەژدەهای سەرشاخ و دوژمنی خواکان) و بەو کەسانەی پاشایەتی سۆمەرییان لەگەڵ خۆدا بردە سەرچیاکان) تاوانبار دەکرێن. کەواتە (کاوەش) یەك لەو گوتییانە بووە، کە لە بابل وناوچەکە بوون هەر ئەوانەش بوون شۆرشیان کرد گوتیان یارمەتییان دەدات یان بە پێچەوانەوە هەمان ئەفسانەی کاوەش بەم جۆرە گەنجەکانی نێو چیا کە کورد بوون هاتنەوە هانای کاوەی ئاسنگەر بۆ لەناو بردنی ئەژدیهاکانی مێشکی گەنجەکانی دەخوارد.

كە بەمە دەبێ (گودی) بەمانای گوتــی_جگـە لـە سۆمەریەكان كـە ئاسـاییە نـارە حەت بووبن بەداگیركردنی ناوچەكەیان لەلایـەن ئەكەدیەكانـەوە(٥٨) ئەوانـە هـەموو یەك بەرژەوەندیان هەبوو لەروخانی ئەكـەد و سـەركەوتنی گوتیـەكان لەسـەرەتادا كەدەبێ بەگوێرەی ئەوەی ئەژدیهاك خەلكی ناوچەكە بووە یان خواوەنـد كەواتـە كاوەشـی لـەو كەسـانە بووبـێ یارمــەتی گوتیـەكانی دابــێ دژی ئەژدیهاكــەكان. كەلـەداهاتوودا راسـتیەكان رون دەكرێنـەوە و هەلقـەكانی مێژوویـەكتر دەگرنـەوە. گوتیەكان وەك دیـاكونوف دەلێ بـۆ مـاوەی ١٢٥ سـالٚ ناوچـەی سـۆمەریان حوكـم كردووە. پاشــان تێكـەل خـەلكی ناوچەكـە بوینـە و گونجـاون هەندێكیشـان پـاش روخـانی دەسـەلاتیان گەراونەتـەوە ناوچەكـەیان پـاش ئـەوەی (٢١) بیسـتو یـەك مەلیك لە گوتیەكان حوكمی ناوچەكە دەكـات ئـەندری بـارو دەلێ ٢١ بیسـت ویـەك مەلیكی گوتی ناوچەكەی حوكم كردووە– لێرەدا سەرنجی خوێنەر بـۆ ژمـارەی ٢١ بیست و یەك رادەكشێم كە ژمارەی مەلیكی گوتیەكان دوای سەركەوتنیان كە ئـەم ژمارەیـە ٢١یـەكی ئازارمـان بـەبیر دێنێتـەوە كـە رۆژی نـەورۆزە گرینگـە دەبـێ چ پەیوەندییەكی هەبێ لەنیوانیان ئەوا لەگەلٚ دەهـا پـەیوەندیـەكانی دیكـە بزانـین چـی لەلامان دروست دەكەن بۆ مەسەلەی ٢١ پاشـای گوتییـان بروانـە دیـاكونوف ورانـدی بارو (سومر فنونها).

سەرنجی دیكەی میللـەتی كـورد رادەكێشـم كـە گوتیـەكوردەكانی ناوچـەی سۆمەر لەنێو سۆمەر و دواتر سۆمەریەكان لەنیو گوتی و هۆزەكانی دیكـەی كـورد توانەوە، كاریگــەری شارسـتانیەتی هـەردوولا لەسـەر یـەك. شارسـتانیەتی تـازەی دروسـتكرد كەبەمـە دەبـێ لـەبیری نەكـەین ئەمـە جێگـای شـانازی گــەلی كــوردە لەبەشداری بوونی شارســتانیەتی جیـهان بـەتێكرایی وەك سـەرەتاو ئـەلف و بـێی شارستانیەتی ئێستا. بۆیی (سەردەمی گوتیەكان و داگیركردنی ناوچەی سـۆمەر و

(٥٨) سومر فنونها وحضارتها اندري بارو ص٢٥٠.

بابل وه هۆی دروستبوونی سەردەمی زێرینی شارتانیەتی سۆمەره لەسەردەمی گوتیەکاندا) بەمە دەتوانین بلێین سەردەمی شارستانیەتی گوتی و سۆمەری هاوبەشه (بڕوانه لا ٦٢ نەژادی کورد).







چەکوشی پیرۆزی ( خواوەندی ئینلیل ) لەدەست جەنگاوەرێکی سۆمەریدا
ئەم چەکوشەو پیستەی گای لەبەر گۆدیا. وا تێگەیشتوون کە کاوه- گودیا ئاسنگەره

# کوردە گوتیەکان و ناوچەی سۆمەر و بابل
## (لەگەڵ پەیوەندی نێوان گاوەو گودیا گاف :God Cow

کە بەمە گوتی– گودی وتمان غودی– بەمانای گا پەرست دێت. کە ئوسولی هیندیەکان وکوردی هیندۆ ئەوروپییە) ئێمە کە باسی ووشەی زاراوەی کوردو کرمانجان کردهەروەها ماناو پێك هاتەکەی، کەدووناوی سەردەمی جێنیشبوون و گوندنشینە و وازهێنانە لە کۆچەری و کەئەمەش سەرەتای دروستبوونی ناو نەتەوەی کوردە. کەئەویش کۆمەڵێك بنەمای رۆشنبیریە وەك زمان و کەلتوری نەریتە تایبەتمەندیەکان. کەلەیەك نزیك بوونەوەو بەرژەوەندی گۆرێنەوەو هاوپەیماننتی و بۆ پارێزگاری کردن لەخاك و کشتوکاڵ و بژێوی ژیان– ئەمانەش بوونە بنەمای رێکخستنی کۆمەڵ و دانانی قەوارەی دەولەت میرنشینی و سنوور دانان.

گوتیەکان هۆزێك بوون، یان چەندین هۆزی هاوپەیمان و هاوبیرو بروا و زمان. لەو هۆزە گەرۆکانەی رەوەند بوون کە کویستان و گەرمیانیان دەکرد لەنێوان چیای زاگرۆس و لێواری دیجلە و فورات((بین النهرین))کە خوارووی ئیراقی ئێستا دەگرێتەوە– لەوانەش شوانی و گاوانی وەك باسی لێوە دەکەین وباسمان کردووە گوتی (گودی)بەمانای گاوانی دێت. کەووشەکە (گا) هاتووە بەفارسی (گاوە)ەیە.کە (گاوە)ش کاسبکارێکی یان گاوانێکی گوتی بووە لەناوچەی (بابل و سۆمەردا)خەریکی ئاسنگەری بووە. وێنەی ئاسنگەری و چەکوچ لەسەر دانیش لەوسەردەمە، وێنەی کراوە[٥٩] وەك باوە.

---

(٥٩) بروانە سومر اندری بارو سەردەمی سێهەمی سۆمەرییەکان و وێنەکان.

گود+ی گوت+ی. (گاوانی)— — (گاوە) (كاوە) بەمانەی ئازاو پالەوان و گاو مانگا بە خێوكەر دێت . God بەئینگلیزی بەمانای خواوەندو Cow. مانگا دێت كەپەیوەندی بە گای خواوەندەوە هەیە كەگایەكە سەركی وەك مرۆڤە دروستكراوە لەلای گودیا پاراستزابوو وێنەی هەیە لە هەمان سەرچاوە كەواتە گوتی گودی گاپەرست پەیوەندی بەهاو رەگەزەی خۆی كەگوتیەكان هەر هەبووە بووە تە سەركردەی شۆرشی كویلەو گاوانیو جوتیارانی ناوچەی سۆمەر بە هاریكاری گوتیەكان پاشان حوكم كردنی ناوچەیكە بۆماوەی (١٢٥)ساڵ لەلایەن گوتیەكانەوە ئەمەش كۆمەلێك بەلگەی دەوێ بۆ سەلماندنی ئەم فەرەزیە و بۆ چەنەمان. كە هەربەشێكی ئەم نوسینەمان باسی لێی وەدەكەین. یاباسمان لێوە كردووە كە لەلای خوێنەر وێنەیەكی دروستكردبێ. چونكە ئەو وێنانەی دەخەینە بەردەست كەبەهی سومەریەكان لە قەلەم داوە.

*بەلام بەكاریگەری راستەوخۆی حوكمی گوتیەكانەوە پابەندە چونكە پێپێشتر سۆمەرەكان— ئەم وێنانەیان نەبووە. لە سەردەمی یەكەم و دووەمی پێش هاتنی گوتییەكان كەبەرای ئێمە بەشێكە لەمیتودو هزری تایبەتمەندی گوتیەكان[٦٠] كەبۆ ماوەی سەدەیەك زیاتر ناوچەی سۆمەرو بابلیان حوكم كردووە و ماونەتەوە كەبەداخەوە چەندین ساڵە ئەم وێنانە كەوێنەی ئەژدیهایەكی سێ سەرن پەیوەندی بەماری سەرشانیەوە هەیە هەستی پێ نەكراوە. بەهەر حال راستی دۆزینەوە لە هەموو گرینگیەك گرینگ ترە. لەلای ئێمە مەبەستیشمان لاپەرەكانی مێژووی گوتیەكانە كەتێكەل بەشارستانیەتی سۆمەریەكان دەبی. كەماناو مەدلولێكی گەورەی هەیە بۆ بوونی(ا) سۆمەریەكان و گوتیەكان— لەنێوان یەكترا توانەوە. بوون بە گودیایی— گاوەیی گاوانی. تا لەسەردەمەكانی ساسانی و هاتنی ئیسلامی هەست بەبوونی و قەوارەیان دەكرێ لەنێوان دوو رووباردا. (بڕن*

---

(٦٠) غود گود (گودیا) بروانە(غود).

*النهرين) پاشان کاری کردە سـەر قولایـی گوتیـەکانیش. کـە پاشماوەیـان (گـاو)ە کاینیـەکانی (گـا) (گـاف)گافـانی و مانـەوەی ناوەکـە پـاش گۆڕانکـاری. کـورد لـە مێـژووی کۆنـدا، کەبیانیـەکان بابـەخیان پێنـەداوە هـەروەها مێـژوو نووسـە ئێراقیەکانیش تەنیا طوتیان بەداطیر کەرو کێ وێی لەقەلەم داوە. بەناهــەق کــەزۆر لەشارستانیەتی سۆمەریەکان قەرزاری ئەوانەن. هاتنی ئەوان قۆناغێکی تــازەی بــۆ سۆمەریەکان دروستکرد کەئێی دەلێن طوتیەکان و ذیانەوەی ســـۆمەری نــوێ. طوتیەکان و ذیانەوەی سۆمەری نوێ. لە ٢٢٨٥- ٢٠١٦ ش.ز*[٦١] جگـە لەمـەش بوونی کورد لەنێوان (بين النهرين) دا دەسەلمێن هەتا هاتنی عەرەبە موسلمانەکان و داگیر کردنی ناوچەکەو دەرکردنی گاوانیـەکان کەهـەر ئـەوانیش بـوون چـیرۆك و ئەفسانەی ناوی کاوەیان بەدرێژی مێژوو پاراستووە و نەوە بە نەوە تا سـەردەمی ئێسـتا هــەروەها ئـالآی کـاوە و سمبولــەکانی کــە خۆیــان زۆرینــەی ســوپای دەوڵەتەکانی یەك لەدوای یەکی ناوچەکە بوون تاسـەردەمی ساسـانی و سـەرەتای دەولەتی عەباسی[٦٢](٢) ئەم شوێنە کەسـۆمەریو کوردی گوتیگـاوانی لیٚ جێنـش بوو ئێستاش عەرەبی لیٚجێنیشە. چونکە گاوانیەکان پاشماوەی گوتیـەکان بـوون. دیاکونوف دەلێ ((ناوی گوتی لەهـەزارەی سێهەم و دووەمـی پێـش زایـن بـەدیار کەوتووە پیٚ دەچیٚ ئەم زارەوەیە. بەو هۆزە جۆربەجۆرانە گوترابـیٚ کـە لـە ژوورو رۆژهـەلاتی بـابلدا ژیـاون))[٦٣] ئێمـە گوتیـەکان لەسـەدەی بیسـت و سـێهەمی پ ز لەسـەردەمی سـەلتەنەتی (نـارام سـوئن) پادشـای ئەکـەد کەلـەو رۆژگـارەدا سـەرا سەری (بين النهرين) کە وولاتی "ئوروك" ئیراك خواروی ئیراقی ئێستا وتاکێوەکانی

---

(٦١) یان بروانە لا ٣١ نەژادی کورد. ڤیلچیفسکی، و. رەشاد میران. یان سومر فنونها وحضارتها.

(٦٢) سومر فنونها و حضارتها، اندری بارو تقديم اندری مالرو و.د.عيسى سليمان و. سليم طه التكريت (النهضة السومرية) (٢) بروانە گاوان القبيله الكرديه المنسيه. مصطفى جواديان بلاذری و بەشـێك لەم نووسینەمان.

(٦٣) میدیا- دیاکونوف-گوتیەکان لاپەرە (١٦٢).

حوکم دەکرد[٦٤] لەکۆتایی سەلتەنەتی هەتا هەتایی لەناودەچی وەك چۆن ئاشوریەکان کەداگیرکەربوون بەدەستی (میدیایەکانی) چیایی هەتا هەتایێ لەناو دەچن، بەمە سۆمەریو گوتییەکان پێکەوە لەدەست (نرام سن) (ئارام سوئن) رزگاریان دەبێ. کە ئەنفالی چیاکانی دەکرد بۆ (کۆیلە) کۆکردنەوەو بەکارهێنانیان لەکاری رۆژانەی (بین النهرین)...– "زمانی گوتی زمانێکی سەربەخۆو خاوەن رێزمان بووە پەیوەندی شێوە زمانی لەگەل زمانەکانی سەرانسەری زاگروسدا هەبووە وەك زمانی عیلامی، کاسی، لولویی، رەنگبێ کاسیەکانیش[٦٥] کوردە گوتیەکان وەك لەمەسەلەی (نرام سین) ی ئەکەدی دا بەدیار دەکەوێ دیارە زۆر بەئازار بوون هەمیشە. قەتل عام دەکران لەنێو گوندو دێهاتەکانیان. چونکە لەوێنەکەدا سوپایەکی رێکخراو بەدی ناکەی بەرامبەر بەسوپای پرچەك و رێك و پێك و ئامادەی بۆ کوشتنی چیا نشینەکان کەلەوسەردەمەدا گوتی لولویان پێ دەگوت. لەچیای زاگرۆز. کەئەمەش بۆ تالآن بردن بەدیل بردنی ژن و منداڵ بوو لەلایەن دەوڵەتێکی (کوێلایەتی) کەدەیان ویست سیستەمێکی ئاودێری بەکگرتووی بەدەسەلات پێکی (نرام سن) بهێن[٦٦] هێرشی گوتیەکان بەرپەرچ دانەوەی ئەم جۆرە هێرشانەی ئەکەدیەکان بوو بۆ لەناو بردنی ئەژدیها کە سێ سەرەکانیان– "بروانە وێنەی (مەسەللەی نرام سن) و دوقۆچەکەی وەك دوو مارە لەپشت سەریەوە کەخۆی بە خواوەندەکەی دووقۆچیان یان دووماری لەسەر شانە" ئەم سێسەریە نمونەی ئەژدیهاکی سێ سەری لەلای گوتیەکان درووستکردووە کەدەبێ لەناوی ببەن کەجێگای ئازار بوون بۆیان. پاشان هەر ئەم

(٦٤) بروانە ئارو سەدیەك دۆزینەوە لەزمان و مێژوودا– گۆڤاری هەولێر (١١) یان بەشێکی تایبەت لەم نووسینە.

(٦٥) میدیا – دیاکونوف ص ١٦٨/ص٣٢٩

(٦٦) دیاکونوف– میاص١٦٢، یان ل٤٠، ٥١، ٥٧، ٥٨، ڤیلجیسکی، (نەژادی کورد).

وێنانە بەروونیو ئاشکرایی بەرجەستە کران. وێنەکان بەشێوەی خواوەندی یان ئەژدیهاکی سێ سەر ویان خواوەندی ئەژدیها دوومار لەسەر شان دروستکران، بروانە وێنەی خواوەندی بابل و ماری سەرشانی ئەمەش لەسەردەمی گوتیەکان لەسۆمەرو ناوچەی بابلدا بروانە وێنەکانی مەسەلەی کودیا ص٢٨٤ سۆمەرص٣٥٦ خواوەندی ننو[٦٧] ئەگەر چی دیاکونوف دەلی- هێرشی گوتیەکان بووە هۆی ویرانبوونی ناوچەی (بین النهرین) بەلام بەرای ئێمە بەم شێوە نەبووە کەباسی لێ وەدەکەن هێرش گوتیەکان هێرشی ئازادیخوازانەیە- چونکە بەرپەرچ دانەوەی هێرشی (نرام سن) دوو قۆچ لەسەر شان بوو لە مێژوو نووسەکان دەپرسم بۆ بە درندەیان لەقەلەم دەدەن، وەکو کوردی ئێستاکەو ئەنفالکردنییەتی گوتیەکان لەناوچەی سۆمەرو بابل بەشێوەیەکی ناراستەوخۆش بەهۆی (گودیا) کانی سۆمەر ناوچەکەیان حوکم دەکرد[٦٨] وەك چۆن لە ئەفسانەی (گاوە) داهاتووە دوای شۆرشی کاوە خۆی نەکرد بەحاکم بەلکو حوکمی دایە دەست- (فەریدون) کەلەوسەردەمەدا مەبەستی حاکمەکانی گوتی یان بوو - چونکە گوتیەکان لەناوچەی سۆمەر جێنیشبوون. بفەرموون بەبێ ئەوەی دیاکونوف هەستی بەئەفسانەکەی کردبێ لەلاپەرە(٦٣٨)ی هەمان سەرچاوەکەی(میدیا) دەلێ: وولاتی ئەژیدهاك" ناوچەی بابل بووە[٦٩] بەمانای کاوەش خەلکی هەمان ناوچە بووە کەواتە کورد لەم ناوچەیە هەبوینەو جێنیشبوینە وە(گودیا) یان (کودەئا) خەرج و باجی گوتیەکان بووەبەماناکەی (گا)وە دێت. بەسۆمەری (گوتی) (گودی) بووە کەئەمەش هەمان شوێنی (گاوە)یە کە حوکمی بۆ سەرکردەی گوتیەکان کردوە- یان پاشایەکی سەرەکی خۆی هەردوو ناو یەك ماناو یەك چیرۆکی

---

(٦٧) سومر فنونها وحضارتها ص٢٨٤ ص٢٥٦ اندری بارو.

(٦٨) دیاکونون- میدیا ص ١٧٢ برهان قانع.

(٦٩) دیاکونون- میدیا ص ٦٣٨ ترجمە برهان قانع.

هاوبەشیان هەیە. كەواتە یەكن بێگومان. كە ئێمە زێتر باسی لێوە دەكەین. كاتێ دێنە سەر وێنەی ئەژدیهای ماری سەرشانی پەیكەركانی (كودیا) كەراو بۆ چوونێكی تازەمان لە خوێندنەوەی وێنەكانی دۆزیوەتەوە بەووردی باسی دەكەین. ئەمەش چەند خاڵێكی خێراو بە كورتی.

١. (گاوە) و (گودیا)دوو ناو نزیك لەیەك بەمانای (گاو)بە كوردی سۆمەری و فارسی وهیندی دێت بەعەرەبی (الثور) كە لەو سەردەمە(گا) پیرۆز بووە بە پلەی خواوەندەكە لەگەڵ ((*God*) ناوی خودا بە ئینگلیزیەوە یەك ماناو وێنە و فۆنەتیك دەگرێتەوە[٧٠] كەواتە شەرێكی نێوان (گودی) گاپەرەست و ئەژدیها پەرستە سامیەكانە. كە ماریان لسەر شان بووە یان هێمای دوومار.

٢. لەبەر ئەوەی وێنەی ئەژدیهایەك هی سەردەمی (گودیایە) كەواتە كاوە و گودیا هی یەك سەردەم و یەك ناون لەبەر بەتەنیا هەبوونی ناوی (كودیا)بەتەنیا دیارە گۆرانكاری بەسەردا هاتووە.

٣. هەردوو ناو كاوە كودیا حوكمی یان ناراستەوخۆ بوو بە واتای حوكمیان بۆ یەكێكی دیكە بەجێ هیشبوو ئەگەر چی حكمو باڵادەستی هەر خۆی خاوەن بوو خاوەن فەلسەفەی ئاشتی و ژیان بوون.

٤. (كاوە) و(گودیا)هەردوكیان ئەژدیها كوژ بوون[٧١] كاوەش وەك ئەفسانە و وەك واقیعی گودیا یەك سەردەم و شوێنە.

٥. هەردووكیان لە سەردەمی گوتی سۆمەری و تۆمار كردن و دروستكردنی وێنەی ئەژدیهان نەلەبەر ئەوەش ناوی كاوە یاناوێكی نزیك لەناوی كاوە لە هیچ سەردەمێكی دیكە لەمێژوودا تۆمار نەكراوە، نەورۆزیش پێش هەخامنشیەكان هەر هەبووە كە بەچەندین سەدە لە پێش زایین بووە كەواتە روداوو ناوەكە نزیك لەیەك

---

(٧٠) هەمان سەرچاوەی ص ١٧٢

(٧١) سومر اسطورة وملحمة، ص١١٦، د. فاضل عبدالواحد.

سەردەمن یان هەر یەك سەردەمن لە هیچ سەردەمێکیش دووبارە نەبووینەوە بەم هەموو بەڵگە زەقانەی پێکەوە هاوبەشیان، چونکە دوو کەس لەو سەردەمەش نیە ناویان گودیا بێ کەواتە هەردووکیان یەك کەسن کە کاوەیە گەرچی چیرۆکە وەك خۆی نەماوەتەوە تا ئێستاکە.

٦. ئەژدیها خەلکی (بابل)بووە کەواتە(کاوەش)خەلکی هەمان شوێن کودیاش خەلکی هەمان شوێن و سەردەم.

٧. ئەگەر وێنەی ئەژدیها هی سەردەمی کودیا (گوتیا) نەبوایە گوتیش گاوانی پاشان (گاڤ) یان کاوە (گا) (گودیا) شوێنێکی دیاری کراوی هەبوایە لەمێژوودا. یان گاوانیەکان شوێنیان هەمان شوێن نەبوایە بەمانای (حلە) بابل شوێنی کاوە کودیا و ئاماژەش نەبوایەکە کە ئەژدیهاك خەڵکی ناوچەی بابلە نەمان دەتوانی بلێین کاوە و گودیا یەك کەسن و گوتین (گوت)(گودی) (کوتیا) (گودیا) (غودی) (جودی) هەمان مانای نەبەخشیبوایە ئەوا گومانێکمان لەلا پەیدا دەبوو، بۆ دلنیایی Cowبەانگلیزی هەمان مانایە(گاو) (گا)( God) بەمانای خواوەندە بەانگلیزی بەسۆمەریش (گود) (غود) (الثور الآهیه) ـ گای ئاسمان .

بۆیە پەیکەرەکانی (کودیا) پەیکەری گوتیەکانن یان گاودیاکان لەناوچەی سۆمر یان (بین النهرین) کەناوچەکەیان حوکم کردووە نەك وەك دەڵێن هەموو پەیکەری یەك کەس بن جۆرە ها جل و بەرگ و کلاویان لەسەرەکە لەوکاتە جل و بەرگ بەشێك بوو لەکەسایەتی ئاینی و نەتەوەیی بەهیچ شیوەیەك نەدەگۆڕدرا لەم خاڵە لێکۆڵینەوەیەکی ووردم کردووە. بە بەڵگەی ئەوەی (گودیا) لەمناڵیەوە حاکم نەبووە. خانەدانێکی لەنەوەی پاشایان نەبووە تاوێنەی بۆ بکری وەبۆ کەسیش نەکراوە لەمێژوودا- وەبەگەورەییش دەسەلاتی وەرگرتووە کەزاوای مەلیکی سۆمەریان بووە بەڵگەی خزمایەتی نێوان گوتی و سۆمەری دەسەلمێنی. دووبارە

گاوە. و گودا دەکاتەوە یەك کەس کلاوی خواوەندی لەسەر نەناوە کلاوی گوتی لەسەرە.

بۆیێ ووشەی گوتی لە گوت + ی پێك دێت کە وشەکە لەرەسەندا (گوت) هەر گود (غود)بەسۆمەری بووەتە گود +ی غود +یا گودیا غودیا هەمان ووشەی (جودی)جودیە. کەمەبەستەکەش گاوەو گاوانی و گا بەخێوکەرەکانە کەدیارە لەسەرەتا دا سواری گا دەبوون میدیەکان سواری ئەسپ بۆ یەکەم جار لە مێژوو شارێکیش هەیە لە خواروو ئێراق. بە ناوی کوت.

وەلەکاتی وێنەکان شیدەکەیتەوە بەراوردکاری دەکەین زێتر ئەم لایەنەمان بۆ روون دەبێتەوە. بەتایبەتی لەپەیکەرە بچوکەکانی کودیا- بەسەرکۆتی یان جەمەدانی لەسەر یان بە منالێ لەمەسەلەی کودیاو یان لەکاتی بردنی گەنجەکان بۆ ئەوەی مارەکانی سەرشانی ئەژدیهاك مێشکیان بخوات کەگەنجی (گوتین) (گوتی) (کودی)زۆر بەلگەی دیکەش لەکات و شوێنی خۆیدا کەباسی لێ وەدەکەین.

٩. ژمارەی پادشاکانی گوتی لە ناوچەی سۆمەردا کەوا (٢١) پادشایە[٧٢] رێك کەوتنی لەگەلێ (٢١)ی ئازار و نەورۆز کەلەوکاتەدا هیچ سەرچاوەیەك نیە سالنامە هەبوبێ. بەلام ماناوەکی بیرەوەری (٢١)پادشا گونجێندراوە لەگەل ٢١ مانگی ئازار لەدواتردا لەبەر گرینگی ئەم ژمارەی حاکمانی گوتیە لەناوچەی سۆمەرو بابلدا یان (بین النهرین)تێکەل بوونیان بەسۆمەرو توانەوەی سۆمەریەکان بەخۆیان و زمانەکەیانەوە لەنێو زمانی کوردی گوتیدا - کەزمانی ئێستای کوردەکانی نزیك ناوچەکەیانە - کەزمانی سۆمەریش نزیکترین زمانی ئەم شێوە زمانە کوردیەی ناوەراستە نەك شێوەکانی دیکەی زمانی کوردی یان فارسی.

---

(٧٢) سومر فنون وحضارتها ص٢٥٢. یان میدیا.

١٠- گوتیەکان کەبەکۆمەلە زمانی ناوچەیی و خۆجێـی دادەنریّبەلگەیـەکی ـیکەی رەسەنایەتی و رەگی قـولی گـەلی کـوردە لەناوچەکـەو- کاریگـەری تێکـەل بوونـی لەگـەل سـۆمەریەکان[٧٣]. کەبـەر لـە چـوار هـەزارو دووسـەد سـالْ بـەر لـــە ئێستایە (١) کە تۆمارکردنی ئـەم سـەرکەوتنە دژی یەکـەم پەرینـەوەو لـەناوبردنی خواوەنـدو ئـاین و پادشـاکانی سـامیەکان وەك چـۆن بەلـەناو بردنـی ئاشـوریەکان سـالّی نویـی کـوردی دەسـت پـیّ دەکـا ئـاواش رزگـار بوونـی یەکـەمی کـــورد لــە ئەژدیهاکەکانی مار لەسەر شانی بابلی وئەکەدیـەکان دەسـت پـیّ دەکـات لەلایـەن سـۆمەری و گوتیـەکاندا. یـان (گودیـەکانی) (گـود) God کەواتـە(گـاوە) (گـود) بەمانای خواوەنددێکـی لەبـەر ئیسـلامەتی گۆرانکـاری بەسـەرداهێنراوە پەرسـت، لایەنی ئاینە کۆنەکەی لادراوە تەنیا پالّەوانیەتی ماوە.

١١. پەیوەندی نێوان ئاینەکانی رۆژهەلات و هیندستان لە پـیرۆزی گـاو مانگـا و بـەکارهێنانی پیسـتەکەی بـۆ لەبـەر کردنـی وەك (کـودی) (گودیـەکان)گوتیـــەکان لەبەریان دەکـرد یـان سـۆمەریەکان لەسـەردەمی گوتیـەکاندا بەلگـەی پـەیوەندی سۆمەریەکانە بەئارایەکانەوە شان بەشانی پەیوەندیەکانی دیکە، لەگەلْ چۆنیەتی دەستی راست لەسەر چەپ دانان لە کاتی نوێژ کردن[٧٤].

١٢. کۆبوونەوەی هـــەموو بەلّگـەکان لەیـەك شـوێن و شـوێنەواردا بـە یـەك نـاوو لەیـەك کـاتدا راسـتی دۆزینەوەکـە دەسـەلمێنی بەرامبـەر بەنـەبوونی ئـەم کۆمەلـە بەلگەیە لەکات شوێنی دیکەدا لەم جیهانە گەورەیـە بـەدرێژیی مێژووسـەردەمەکان هەمووی کەلەلای مێژوو نووسان ئاشکرایە.

١٣. پـەیدا بوونـی (زەقـورە)(زاگـورا) کەلاســایی کردنـەوەی چیایـە شـوێنی پاراستنە .لە تۆفان) لافاو بۆ کاتی رزگار بوون کەناوەکە لە(زاگرۆ) سەوە هاتووە.

---

(٧٣) هەزار مێرد سالی (٣) ژمارە (١٢)ص٤٦.

(٧٤) سومر فنوننها وحضارتها ص٢١٥.

کەلەسەردەمی گوتیەکان دروستکران و داهێنران. چونکە هەمیشە (بین النهرین) ساڵانە دەترسان چونکە لافاوی لێ هەڵدەستا- ئەم ئایتە پیرۆزەی قورانیش. کەباسی پاپۆرەکەی (نوح) دەکا دەفەرموێ (واستوت علی الجودی) مەبەستی چیای (جودی) یە کەدەکاتە چیای گوتیەکان چونکە لەبەر نەبوونی (گ) لە زمانی عەرەبیدا (گ)بە (ج)دەنووسرێ سەیری (گودیا)چۆن (غودیا)- (جودیا)بە (گوتی)بەمانای (جودی)دێت. وەك ئاشکراشە چیایی گوتیەکان چیاکانی بلندی زاگرۆسە کە شوێنی گوتیەکانە. هەمان پاشاشما دوەکەشیان (گاوە)- (گاوانی)- (گا)یە کەپیتی (گ)بەفارسی و کوردی پێ ی دەگوترێ"گاف" (جاف)ە ئێستا لەهەمان شوێنی گاوا نرود و گوتی و جێنیشن لە سەرووی ڕۆژهەڵاتی ناوچەی بابل سۆمەردا. کەکاتی خۆی سەلماندمان گاوانیەکان هەروەها لەنێوان دوو ڕووباری دیجلەو فورات و ناوچەی (حلە) و بابلیش دەژیان هەتا هاتنی ئیسلامی عەرەب و تەعریب کردنی ناوچەکەیان لە(بین النهرین) کە ئیراقی کۆن و خوارووی ئیراقی ئێستایە. هەربۆیەش لە دەرئەنجامدا گەیشتە ئەو قەناعەتا (گودیا) تەنیا ناونیە لە قەبە وەك کیسری وەك کاوە وەك قەسیرە وەك فەرعەون وەك (جابان) چونکە بەلکو لەقەبە بەرای من گوتی (کودیە)کان کە حوکمی ناوچەی سۆمەریان دەکرد یان کاسبکارو گاوان بوون لە سەرەتادا- وەك (گودیا)ی حاکم. گودیای وەرزێر- گودیای منالْ (گودیای) ئافرەت گودیای پیاوی ئاین کە هەمووی بەمانای گوتی حاکم گوتی مندال- گوتیەکانی ناوچەی سۆمەر دێت نەك ناوێك بە ناوی گودیا بە تەنیا - کەبەهەلە ئەم پەیکەرانەیان هەمووی بە پەیکەری گودیا تێگەیشتوون- ئەگینا چۆن گودیا لەشێوەی مندالێك ئەژدیها بۆ سەر بڕینی دەباو سەری خوراوە لەلایە مارەکەی سەرشانی کەدەمی کردۆتەوە <u>سەری گودیا بچوکەکە تێك چووە وەك خورابێ هەمان جل و بەرگ گوتیەکانی لەبەرە کەپیستەی گایە سەرکۆتە داس و لقە دارێکی لە دەستە کەبەمانای</u>

وەرزێرو كاسبكار دێت كە كویلەكە توند دەستی گیراوە ترسی پێوە دیارە ئەم وێنەیە دەخەمەپێش چاوی هەموو هونەر مەندوو مێژوو نووسانی جیهان لیّ ووردبنەوە چۆن حاكمی شار دەستی توند دەگیریّ و مارسەری دەخوا سمبولی وەرزیری و كشتوكال و داسی هەڵدەگریّ وورێك لەگەلّ دوومارەكەی سەرشانی ئەژدیهان دەدات بەدەستەوە[٧٥].

جگە لەم بەڵگانەش هەموو وێنەكانی ئاهەنگ گیران و دهۆل و زورنا لێدان و ئاهەنگی دارچاندن چۆن یەكێك یان پادشایەك بەجل و بەرگی كوتی لە پێش خواوەند شتلە نەمام دەچێنی و بە ئاوی پیرۆز ئاوی دەدا[٧٦] كە ئەمەش پیرۆزی خاك و ئاوو ئاگرو بایەلەلای گوتیە ئاریەكانی كوردەوە. سەرەرای ئەمانەش هەمووی (گودیا) (گاوە) (گوتی) (گودی) بەیەك ماناو مەدلەل ناوی ئاین و پەیام بەری ئاینێك بووە — — پیّیان گوتراوە (گودی) (گودیایی) گوتی گوتیایە وەك باسمان كردووە لەم نوویسنەدا — كە ئەو (گودیا) سۆمەری گوتیە هاوبەش هەمان (گاو)ی (گوتی) كوردە. كەلەپاش مردنی پلەی خواوەندی درایی كە خاوەن فەلسەفەو ئاینی تایبەتی سۆمەر گوتیەكان بووە هەربۆیەش ناوەكە لەناوچەكە ماوەتەوە وەك گاوەیی گاوانی جابانی (بين النهرين) دواتر جاف كەناوەكە هەتا ئێستاش ماوەتەوە بەبیّ ئەوەی قولایی راستیەكانمان لیّ دیارو روونبیّ كە ئەم ناوەش (گاو) گاوی (كاوە) سمبولی ئاین و لەناو بردنی ئەژدیهاكە سیّ سەرەكانی ئاینی ناوچەی بابل و ئەكەدیەكانە. وەك وێنەكان خۆیان دەدوێن دوور لەشیّ كردنەوەی نەزانانەی بێگانان كە دوورن لە سمبولو ئاین زانینی زەردەشتی و زاگروسیانە. دوورن لە فەلسەفەی مێژوو نووسینەوەو لە مێژوو گەیشتن كە بە شێوە(بونیەویانە)نەبیّ نانووسرێتەوە.

---

(٧٥) سومر فنون وحضارتها وێنەی ژمارە (٢٨٤) (ص٢٨٤) اندری بارد.

(٧٦) سومر فنونها وحضارتها ص ٢٨٢ ص٢٨٣ وێنەی ژمارە ٢٨١– ٢٨٢.



ئەژدیهاك دوماری
سەرشانی وچۆنیەتی
توند دەستگرتنی گودیای
گەنج سەیری مارەکەی لای
گودیا دەمی هەرشەی کردوو
تەوە ، بەلام مارەکەی دیکە
وانیە - مێژونوسان بۆ
هەڵە لێکیان داوەتەوە .
قۆچەکانی سەری ئەژدیهاك
مانای خواوەندیەتی و پاشاییە
بروانە وێنەکە بەتەواو کراوی .



مەزارێکی ئێزیدیان دوجوت قۆچی لەپێشەوە دراوە
کارێگەری سمبولی قۆچەو خواوەندایەتی یە .

## گوتیەكانی یان گوتی گاوەیی (گاوەیانی) جابانی ئاینێكی كۆنی كوردبووە.

دوای ئەوەی زانیمان (گـای سـەرك مـرۆڤ)هـێزی چاكـە دژ بەخراپـە لـەلای سۆمەریانی سەردەمی گوتیەكان دوای ئەوەی لەلێكۆلینەوەكەم بوومەوە. هەستم كرد كەكاتێ "گودیا"بەخواوەند دادەنێن- لەدوای مردنی چونكە خەلكەكە هێنـدە بە گودیـا موعجـب بـووە و كاریگـەری هـەبووە لەسـەریان كەبـەم جـۆرە رەفتـاری لەگەلدا بكەن لەدوای مـردن بیپەرسـتن لـەكاتێكدا وەك پەیامبـەرێك یـان پیـاوێكی ئاینی بێ هەواو نەفس لەسەر خاك هەلسووكەوتی كردووە- بـەلام لەهـەمان كـاتدا (گاو)بوو پالەوان بووە (گۆد) "خاوەنی سێ بتی گای پەرسـتن بووەكـە سـەركیان مـرۆڤ و لاشـەیان گـابووە"(١) ئەمانـە هـەمووی وانیشـان دەدا كـە گـودا (كـاوە) بەخاوەن نامەو بیرو هزرێكی تایبەتی بووە كەلە گوتیەكانی پێشوی بـۆ ماوەتـەوە بەلام زاوای سۆمەریان بووە[٧٧] هـەر بۆیـەش بـەپاش ماوەكـەیان كوتـووە كـاوانی گـاوانی- كـاوەیی گـاوی(گـا) (گـاف) ئەمـەش لێكۆلینەوەیـەكی تایبـەتی دەوێ لەدەرفەتێكا لەم نووسینەدا باسی لێـوە دەكـەین- بۆیـێ نـاوی گوتـی بـەرای مـن لەگاوی گاودیا- گاوتیا- گوتیا- (جودی)گودیەوە هاتووە یایەك رەگەز كەهـەموو لەدەوری گاو گا پەرسـتی و پـیرۆزی گـا دەخولێتـەوە كەئەمـەش بەلگـەی پابـەند بوونی گوتیەكانە بە ئاینەكانی هیندی كە ئێسـتاكەش هـەمان ئـاین لـە هیندسـتان ماوەتـەوەو هـەروەها لـە(چـین) لـەلای تبتبـەكان و رەفتـاری تایبـەتیان بەرامبـەر (بەگا) كەدلسۆزی بۆی چونكە سەرچاوەی جۆت كاسبی شیرو خواردنیان بـووە - بەلكو لەهیندستان لە زۆر شوێن بەدایكی خۆیان دەزانن- مەسەلە كە تەنیا گاوانی و گا بەخێوكردن نەبووە - هی ئەم گایەی گودیاش دوای هەشتسەد سـالێ دەبێتـە

---

(٧٧) سومر فنونها وحضارتها- اندری بارو- بەشی معجم الأعلام.

ڕەمزێکی ئاشوریان بەواتای ئەوانیش بەم ئاینە کاریگەر دەبن بۆ بەڵگەی ئەوە (گوتیوم) ناوی خواوەندەکەیان بوو وەك خواوەندی (عەشتارو خواوەندی سن ) بە گوێرەی ئەم دەقەی کە دەڵێ: (... ئەو کەسەی ئەم نووسینە لابەرێت ... . با خواوەندی (گوتیۆم و ئیشتار و سن بیناغەی هەڵکەنن نەوەکەی لەناو بەرن)) بڕوانە مێژووی دێرینی کوردستان – فاضل قەرەداغی لا. ١٧٩–١٩٠. لەبەشی زەردەشتیشدا باسی ئاینی (گاڤی) جاڤانیش دەکەین

* گلگامش: کاتێ ((گامێشی ئاسمانی)) دەکوژێ – مانای کێشەی نێوان مارو– گایە، بەبەڵگەی ئەوەی کە گلگامش لە ژێر دەریا دەست بۆ ((گوڵی ژیانی نەمری)) دەبا بیخوا (مار)ەکە پێشی ئەو دەیخوا کە بەهەقی خۆی دەزانێ مانای ئەوەیە خوانوەندایەتی و نەمری بۆ مار دەمینێتەوە. مردنیش بۆ (گا) لەسەردەمی یەکەمی سۆمەریەکان، بەڵام لە سەردەمی گوتیەکان ((گودیەکان)) پیرۆزی ((گا)) پەرە دەسەنێ بەرامبەر بە کوشتنی ئەژدیهاك و ماری سەر شانی.

لە چیرۆکی ((کاوە–گۆدیا)). وەك لە وێنەکان.. ڕەنگ دەداتەوە. بەڵگەیەکی دیکەی بۆچوونەکەمانە. مارەکانی سەر شانی (ننکشزیدا–ئەژدیهاك) قۆچدارن بەڵگەیەکی دیکەی خواوەندایەتی مارەکانە.

# کاریگەری گاو (گا) لەسەر سمبولی میدییەکان و هەخامەنشی وساسانیاندا

(١) – ئێمە لە کاتی لێکولینەوەکەماندا یەکەم جار هەستمان بە پیرۆزی‌یان گرنگیگی پەیکەری(گاو) کرد کە بەزمانی هیندی و فارسی هەرپیێی دەلێن گاو بە کوردی(گا) بە سۆمەری(گود)(گۆ) کاتێ وتمان هەمان گاوەیە لە سەردەمی گوتیەکان(گودیا)ی پادشای سۆمەری سەر بە گوتیان پەیکەرەکەی گای وەك بتێك لەلای خۆی دانابو کە(٤٢٠٠) چوار هەزارو دو سەد سالْ بەر لە ئێستا بوە. وەك وتمان دوای هەشت سەد سالْ کاریگەری لەسەر ئاشور بە دیار دەکەوێ نەك هەر هێندە بەڵکو کاریگەری لەسەر ناوچەکە بە گشتی لەوانەش(میدیەکان) بۆ بەلگەش(جامێك)ی سەردەمی مادەکانە یان پاشترە تا سەردەمی ساسانیان لە هەندێك شوێن بە ناوی((جام کلیمو))یە کە تائێستا ماوەتەوە لە(هرتسفلد–کۆمەلە شوێنەواری هنری بروس جلد ٤١[٧٨] وێنەی خواوەندێ بە دیار دەکەوێ کە لەسەر تەخت دانیشتوە مانگێك لە دەورەیدا کە لە زێرە چوار_(گا) ڕای دەکێشی، ئەوەی گرینگە ئەگەر بەوردی سەیری خواوەندەکە بکەیت دەبینین خواوەندەکە وەك(بودا) دانیشتووە کە(کاریگەری بوزیەکانی بەسەروە دیارە)، بەلام دوو قۆچی‌گای لەسەر شانە کە کاریگەری ئەکەدی و سۆمەریە، بەلام مانای ئەم دوو قۆچەی کە لەسەر شانیەتی پلەی خواوەندایەتیە لەو سەردەمەدا هەڵی گرتوە. هەر بۆیەش کاتێ(نرام سن) ئەم دوو قۆچەی کە هەلگرتووە داوای خواوەندی کردنە یان خۆ بە خواوەند زانینە سۆمەریەکانیش خواوەندەکانیان قۆچی گایان

(٧٨) ایران در زمان ساسانیان ص ٢٥٤.

لەسەر دەنا، بەلأم(مار لەسەر شان) رەمزی خواوەندی كوشتن و برین و مردوەكان و ژێر زەمینە[٧٩] رەمزی ئەنفا ل كردنە كە لە چیاكان خەلكیان ئەنفال دەكرد.

بۆیی بەهۆی ئەم وێنەیەی بە ناوی(جام كلیمو)یە بۆمان رون دەبێتەوە كەوا لەم سەرو شوێنە زەردەشتی نەبون هەر لەژێر كاریگەری(گوتی و گودیا-كاوە) دەژیان كە شەپۆلی هـزری(دۆلّی سندی) [٨٠] بەسەروە دیارە كەرەگی هیندیە كەئەمەش هەمان ئاینی گوتیەكانە كە لە نێوان هەر چوار روبـاردا بـلأو ببـوەوە ئەویش روبارەكانی چیاكانی زاگرۆسە(كارون و كەرخەو، دیجلەو، فوراتە) كە هـەر چواریان لە چیاكانی زاگروسەوە هەلّدە قولێن. جگە لە ئەستێرەی هەشت پـەری كە لەسەر دوپێچكەی گالیسكەكە دیارە(سۆمەریە) هەروەها چەكوشی پیرۆز لە پشت خواوەندی مادەكانەوە دیارە بەقیتی دانراوە كە ئەم چەكوشە لـەلای سۆمەریەكان پیرۆز بوو. كە داهێنانێكی تازە بووە لە لایان. جگە لەم جەژنە چەژنی مانگی(دذو) كە باسی فەریدون دەكا سواری(گا) دەبێ هەر كەسێ لەم كاتەدابیبینی بوایە دوعای قەبول دەبو. كە ئەمە پلەی خواوەندیە تیەكەیە ئەمانە هـەمووی كاریگەری(گودیا)،(گاوە)و ئاینەكەی گوتیەكان و سۆمەریان بوە لە ناوچەی سۆمەردا بەسەر دوای خۆیـان جكـە لەمەش هەندی زاراوەمان بەر چاو دەكەوێ كە زمانی گاوانیەكان لە سەردەمی ساسانیان كە دەلّی(وهارجشن))،(عید بهار) بە فارسی ئەمەش دەقەكەیە لە ص٢٥٢ ئیران در زمان ساسانیان(دراول ماه

(٧٩) وەك ننجیزیدا بروانە لا٣٠٨ اثر الكتاب البابلیة في المدونات التوراتیة.

(٨٠) زۆر سەیرە كاتێ یاقوت لا٤٠٥ جـ٢ باسی خەلكی (خوزستان و كەرخە وكارون دەكا كەلەتەك ناوچەی سۆمەرە دەلّێ (زمانی خەلكەكەی نەعبرانیە نە سریانیە و نەعەرەبیە و نەفارسیە- (زمانی خوزی)یان هەبوە رەنگیان زەردو باریك و وردن ردێنیان كەمە پیاوی گەورەیان كەمە ئەمە بەرای من وەك خەلكی (چین) یان مەبەستمان دۆلّی سندو سنوری چینە كەرەگەزی زەردیان بەسەر وەدیارە. یاقوت دەلّێ بەخەلّكی ولاتی (جروم) دەچن بەرای من ئەوانە پاشماوەی دانیشتوانی كۆن بوینە))

ذر عید)،(وهار جشن) یعنی(عید بهار) بود. در عهد خسروان(یعنی در زمانی كه تقویم ها مختل شدەبود اول اذر مانه با ئاغاز فصل بهار مصادف مشید. در ازمنه ئیسلامی این عیدرا(( خروج الكوسج میگفتند)) هەر لە لاپەرە(٢٥٠) هەمان سەرچاوە[٨١] دەڵی: (جەژنی نەورۆز لە سەردەمی ساسانیان(نوگ روز) بووە لە پاش جەژنی فەرور دیگان هاتووە.

لە رۆژی یەكەمین مانگی(دذو) جەژنی(خرم روز) بوو شاهنشاه جلكی سپی ئەبەر دەكرد دەهاتە نێو خەلك نانیانی لەگەڵ دەخوارد. ووشەی(گاوا) ناوی ئەو جەژنەیە دەگەرێتەوە بۆ فەریدون پادشای ئەفسانەیی كە لە رۆژی شانزەدا سواری(گا) یەك دەبێت كە(نورانیە قۆچەكانی زێرو پێیەكانی زیوبووە) هەر كەسێك لەو كاتە ئەمەی بدیبوایە دوعای قەبول دەبوو. لە لاپەرە(٢٥٥) هەمان سەرچاوەی دەڵێ هەر لەم شەوە لە كێوی گەورە گایەكی سپی پەیدا دەبوو ئەگەر ساڵ هاتبوایە هاوارێكی لێ هەلدەستا ئەگەر نا داوای فریاكەوتنی دەكرد ئەمانە هەمووی كاریگەری(گاو) گاوە و گایەكانی گودیای گاوە پێشاندەدا كە ئاینی گوتی و كاریگەری لەسەر ناوچەكان پێشاندەدا. لەسەردەمی ساسانی پێشووتردا.

بەلام بۆ مەسەلەی كاریگەر گا لەسەر هزری هەخامەنشییان ئەوا گەورەترین نموونە و بەڵگەمان دۆزینەوەی پەیكەری گای پاڵكەوتووە لە شوێنەوارەكانیان هەمان گا كە وەك پاشماوەی پەیكەری (گا)ی گودیایە[٨٢] كە باسی لێوە دەكەین لەم كتێبەماندا. كە بەرای من كاریگەری میدییەكانە لەسەر هەخامنیشەكان ماوەتەوە یان سۆمەری راستەوخۆ.

---

(٨١) ایران در زمان ساسانیان كریست سن وەرگێری بۆ فارسی رشید یاسمی ص٢٥٠.

(٨٢) بروانە سومر فنونها ص٦٢، دۆزینەوەكەی دیلافواو ژنەكەی لە(سووسە) لەساڵی١٨٨٤–١٨٨٦ز.



جام کلیمو- هرتسفلد-هنری پرۆس-ایران درزمانی ساسانیان لا
پاشا-دوو قۆچی لەسەر شانە مانای خواوەندایەتی یە، چەکوچی لە شێوەی سۆمەری لەتەکە، گالیسکەکە (عارەبانەی گاراکێش) لەشێوەی سەرکە گایە قۆچی لەشێوەی مانگ و گا رای دەکێشێ رەگی سۆمەری و جەژنی کاویانی و نەورۆزی پێوە دیارە، وەك هەڵقەو بەڵگەی حاشاهەڵنەگرە.

روز [illegible] داشت و فعلا تلغظ آنها
[illegible] مرکب است، که جزء نخستین
[illegible] فریدون (فریدون) پادشاه داستانی

**سەیری ووشەی (گاو) بکە کە مەبەستی (گا) یان (کاوە)یە وەك بەڵگەیەك کە ئێمەش کاوە بە گاوە تێگەیشتووین جیاوازی لە نێوانیاندا نی‌یە.**

# پەیوەندی نێوان هەخامنشیان وبابل و نەورۆز

ئەم ناونیشانەمان زۆر بەلاوە گرنگە چونکە نزیکترین سەردەمە لەسەردەمی گوتیەکان لەولاتی سۆمەردا، کە بەئاشکرا لەلایان ناوی نەورۆز هاتووە لەکاتێکدا ئێمە بەدوای بچوکترین بەڵگە دەگەرێین بۆ پەیوەندی نێوان نەورۆز کاوە و بابل و سۆمەر کەلەنەورۆز در کوردستاندا عبیداللە ئەیوبیان دەلی ( هەموو سالێك لەنەورۆز دا پادشای هەخامنشی دەچووە بابل پەرستگای (مردۆك) دەستی خواوەندی مردۆکی دەگرت وەك جەژنانە. زۆر سەیرە ئەمە نهێنی پەیوەندی نێوان سەرهەلدانی نەورۆز و (بابل)ە کە دیارە سەرچاوەی نەورۆز وەك ئاماژە پێکراو بەدەها خالْ سەلمێندرا ئەویش رزگارکردنی ناوچەی بابل و سۆمەر بووە لەدەست ستەمیو ئەکەدیەکان کە مێشکی گەنجی کویلەی کوردیان دەرخواردی ماری سەرشانی خواوەندەکانیان دەدا.

یان چۆن گەنجەکانی گوتیان یان کوردییان دەکوشتن لە ئەفسانەی نێوان (بین النهرین)دا کە زستان هەوارو شوێنی گوتیەکان بووە لەپێش سۆمەریەکانیش وەك د.سپایزەر باسیکردووە ئاماژەمان پێکردووە ئەگەر چی ئەم بیرورایە زۆر دوای گوتیەکان بووە بەلاّم مانای نەپچرانی پەیوەندی کورد و ئاری پێ دەکا، کەواتە بەرای ئێمە سالی کوردی لەیەکی نەورۆز بەزرگارکردنی ناوچەکە دەست پێ دەکا هەر دیاریشە ئاگر لەسەردەمی هخامنشیان ئیزافەی سەر جەژنی نەورۆز کراوە ئەگینا سەرە سال کە چاندنی گەنم و نویێ بووەنەوەوەیە وەك لە وێنەکانی سۆمەریەکان را دیارە (بروانە نەورۆز و کردستان لەسەردەمی

خامنشیان) بەشی (ئاگر) لەهەمان سەرچاوە باسی کردووە کە ئاگر چۆن ئیزافەی نەورۆز کرا، لەنیوە دووەمی هەزاری یەکەمی پ.ز.

ئەم پەیوەندیەش: بەگەورەترین بەڵگە دەزانم کەوا روداوی نەورۆز و مەراسیمەکانی دەگەڕێتەوە پێش هەخمانیشەکان و بابل هیچ پەیوەندیەکی بەسەردەمی هەخامەنشیەکانەوە نیە.. وەك هەندێ کەس پینەو پەرۆی لێ دەکا لەم سەردەمە گوایە فەرەیدون فارس و کاوە جاش و بەچاوی سەردەمی ئێستا سەیری سەربردەکانی مێژووی کۆن هەیە تا مرۆڤ لە نهێنیەکانی بگات. جگە لەوەش .. بەدۆزینەوەی ماری سەر شانی خواوەندی بابل و مێشك دەرخواردان و مەراسیمەکانی جەژنی سەری ساڵ و دار چاندن و گودیان گوتی هەموو چیرۆکەکانی دوای خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە. خۆی دەبێتە سەرچاوەو بنەما- وەك لەم لێکۆلینەوەیەدا گەیشتینە ئەم ئەنجامە.



ماری ((ئوروبوس))ی کلك لە دەم کە بە دایکی یەکەمی جیهان دەژمێردرێ لەلای سۆمەریەکان و پەیوەندی لەگەڵ (ئەژدیهاك)
سەرچاوە-متون سومر- خزعل ماجدی ص٦٩

# نەژادی ساسانیەكان
# كوردی گاوانی و شبانكارەن

رەشید یاسمی دەڵی بەزۆرترین ئیحتمال ساسانیەكان كورد نەژادن(٨٣) پاشان لەزاری ئاراتس ەوە دەڵی (ئەو تایفانەی كە دانیشتوانی بارسن وەك هخامنشی و مەجوسی و كورتی و مەردەكانی)

یەك لەو تایفانەی كە كوردن و كەلەپارسن – تایفەی شبانكارەن پاشان دەڵی ئەوانە خەریكی شوانكارەیی و بەخێوكردنی ئاژەڵ بوون[٨٤] منیش دەڵێم ئێستا لەنێو هۆزی جافدا تیرەیەكەیان هەیە پییان دەڵێن (شوانكارە)و هۆزكێكیش هەیە لەناوچەی كەركوك بەناوی (شوان) و شیخ بزێنی.

هەر لە ل١٦٨ (مجمع الانساب) دەڵی (شبانكارە لە ئەسباط ئەردەشێرن. پاشان دەڵێ شبانكارە لەساسانیەكانن یەك لەو هۆزانە شبانكارە (رم البازنجان)راستیەكەی – زم البازنجان–ە تایفەیەكی كوردن كە هەمان بازرنگن كە مەسعودی باسیان دەكا(٨٥). ئۆل ڤیلیجفسكی لە نەژادی كورد باسی (شوانكارەكان) دەكا دەڵێ: زمانیان لە زمانی هیندی نزیكتر بووە لەوەی نزیك بێ لە زمانە ئێرانیەكان.

---

٨٣ ص ١٦٥ كورد نەژادی ئەوا رشید باسی.

٨٤ هەمان سەرچاوەی پێشوو

٨٥ كوردەكانی پارس پێنج (رم) بوون (رم جیلویە) رم الدیوان، رم اللوالجان رم الكاریان ، رم البازنجان) هەمان سەرچاوە بەلام راستییەكەی (زم)ە ئێستاش لە هەولێر كوردەكان بە هۆبەی رەشماڵان دەڵێن (زۆمی فلانەكەس یان فلانە خێڵ) كە لە زەمین) و زستان ئارەوە نزیكە تەنانەت (كۆهجر) (كۆچەر) كوردیە.

پاشان دەڵێ کە ئەردەشیر بەدیار کەوت لەشاری اسطخر لەدەست سەرۆکی تایفەی بازرنگیان کە بە (کوجهر) ناوداربوو لە (گوپانان)و (دارابگرد) دادەنیشت پاشان دەلێ ووشەی گوپانان لەلای طبری بە (جوبانان) تۆمارکراوە[٨٦]. دارابگرد شوێنێکە لەشوێنەکانی (شبانکارەکان).. کەلەرەچەلەکی تایفەیەکن بەناوی (جوپانان) کەباپیرانی شبانکارەکانن.

پاشان دەلێ کەلە هەمووی گرینگ ترە (باپیری ئەردەشیر کە(ساسانە)لە تایفەی (جوبانان) (شبانکارە)یە دایکی (پاپل) خوشکی یەکێك کەلە تایفەی کرد بازرنگی‌یە[٨٧]. بۆ پالپشتی ئەمەش نامەیەکی ئەردوانی پێنجەمی ئەشکانی بۆ ئەردەشیری نووسیوە دەڵێ: (ئەی کوردی لەنێو چادرەکانی کوردان بەخێو کراو کێ رێگای پێ داوی ئەو تاجە لەسەر بنێی)[٨٨].

پاشان دەڵێ: (کاتی بهرام جوبین رووبەرووی خەسرو بووە و پێی‌گوت (ئەی کوردی... لەنێو چادری کوردان گەورە بوی)[٨٩] کە ئاشکراشە بهرام جوبین کوردە سەیر کەن تەنانەت چوبین – جوبان لە (جابان)[٩٠] گاوانەوە هاتووە خوشکی ناوی (کوردیە)یە کەواتە لەم بۆچوونانە و ووتەی رەشید یاسمی بۆمان بەدیار دەکەوی کەوا گاوانیەکان و کورد حوکمی دەولەتی ساسانیەکان بەدەستەوە بووە. هەر ئەوانیش لە نێوان دوو روباردا (بين النهرين و ناوچەکانی کور دستان و

---

٨٦ هەمان سەرچاوە رەشید یاسمی.

٨٧ هەمان سەرچاوەر ص١٧١ یانهاونەتەوەیی قەومی کورد و ماد – جلیل گادانی لا ٢٧٥–٢٧٧

٨٨ هەمان سەرچاوە ص١٧١

(٨٩) هەمان سەرچاوە ص١٧٢ هەروەها طبری چاپ کمبرج ٢،ص١٣٨

* بروانە لا ١٨٩ ئول فلیچفسکی لا ١٨٩.

(٩٠) لە کتێبەکەی– کرستین سن– و. رەشید یاسمی ص١٧٠ هاتوە(لفظ) گوپانان محال (دار بگرد شمردە است در تاریخ طبری. وە (در کتاب الخراج– قدامة بن جعفر جوبانان ضبط شد) شوێنی جابان و ئەسلافی شوانکارەکانی.

ئێراقی کۆن ژیاون خاوەن خاك و دەوڵەت بوینە وەك لەداهاتووشدا قۆناغ بـەقۆناغ بۆمان روونتر دەبێتەوە.



لوح (١٤١) المسلة السوداء.

**کێلی لە بەردی رەش دروست کراو لەلای سامیە بیابانیەکان و چۆنیەتی کڕنۆش بردن بۆ خواوەند واتە مەلیکەکان دروشمی ئاشوری و رۆژیان لە سەر سەرە حوشتریش بەڵگەی بیابان. ئەم وێنەیە بەڵگەی کۆیلایەتی ئەو کاتە پێشان دەدات**

# گاوانیەکانی دانیشتوانی (بین النهرین) لە سوپای ساسانیدا لە کاتی گرتنی ناوچەکەدا لەلایەن عەرەبی موسلمانەوە

لەکاتی هاتنی عەرەبی موسلمان خوارووی ئێراق گاوانی کورد بوون لـەکاتی جەنگی گرتنی (سـواد العـراق) بـەمانای (بـین النـهرین) کەشـوێنی جابانـەکان بـوو گـەراین بزانـین نـاوی کەسـیان هـاتووە وەك سـەلماندنی بونیـان لەناوچەکـە لــەم سەردەمیدا زۆر ناوی کەسـایەتی گاوانـەکانمان پێـش چـاو دەکـەوێ بـۆ نمونـە لـە ص٢٤٠ بـلاذی دەڵێ (واتـی الیـس فخـرج الیــه جابـان عظیـم العجـم)[٩١] کەواتــە سەرکردە گەورەکەی گاوانیەکان لەو سەردەمدا لە (الیس) کەلە (بین النهرین) واتـا ناوچەی (اوروبابل) کوردی گاوانی بوون.

یان کە دەلی (لما صار بالعذیب بلغه ان جابان الاعجمي یتستر في جمـع کثـیر فلقیه فهزم جمعه) ص ٢٤٧ بلاذری کەواتە سەرك و هۆزی گاوانی لە مەیدان بـوون پارێزگاریان لە گوند و دیهاتەکان و خاکی خۆیان دەکرد کـە هـەزاران سـاڵ بـوو لێ جێنشیبوون یان ( وکان المشرکون زهاء مائة الفا و عشرون الفا ومعهم ثلاثون فیـلا ورایتهم العظیم التی تدعی (درفشیکابیان) ص٢٥٦[٩٢] کە ئالای جابانیەکانە گاوانی ئەو پاش دەگەڕێتەوە سەردەمی گوتیان... گاوویـان گـاوە کـاو ان وەك (عـن ابـی عمران الجوانی) کەواتــە درفشـی کـاوە (جابیـان) جابـان و ئـەم هـەموو سـەرکردە

---

٩١ الامام ابو الحسن البلاذری – فتوح البلدان ص٢٤٠ص٢٤٧ص٢٥٦ص٢٩٦ جابان الاعجمی.

٩٢ هەمان سەراوە درەفش کابیان –درەفشی (جابیان) جابـانی – گـاوانی (جـافی رەشـکان) بەبـهرام دەڵێن (وارام) وەك گاوانیەکان مێژوو – کاوە – ئالای کاوە.

جابانانە بەواتای گاوانیانە (ابن عمر الگاوانی) لەبیر نەكەین ئاڵای گاوانیان بـو ئـەو گاوانیانـەی حوكمـی دەوڵـەتی ساسـانیان دەكـرد ئالاكـەش بـەناوی ئـەوان بـون.. كـەناوی كاوەیـە، درەفشـی جابیـانی كابیـان لەپیسـتەی گـا بـوو كــە گوتیــەكان لەبەریان دەكرد كەبەمە بەدیار دەكەوێ تاكە لەقەبێكی زۆربەی سـەركردەكانە كـە دیارە لەگەڵ هۆزە گەورەو پڕ دەسەلاتەكەیان كە هـۆزی گاوانیـە هـێزی سـەربازی لەدەست بووە و كاریگەر بوینە، سەرەرای لە سوپای ساسانی دابوینە پارێزگاریان لەناوچەی خۆیان و گوندەكانیان كردوە لە بین النـهرین چونكـە نـاوی جابـانی لـە گرتنی موصل و ئازربیجان و همـدان و ناوچـەكانی دیكـە نابیندرێتـەوە كەبەڵگـەی هـەبونیان تـەنیا لەناوچـەی خۆیـان و بـەس كـەنێوان دوو روبـاری خـواروی عـێراق (ارض السواد)یان (بین النهرین) و بـەغدا جگـە لـەوەی یەكـەم كوردێك كەدەبێتـە موسلمان و ئەسحابەی پێغەمبەر (د.خ) ناوی (ابن جابان الكردی)[٩٣] یە لەسەر سنور نزیك بو ئەوەی زێتر كەدەبێتە بەڵگە خەڵكی ناوچەكە هەمووی كورد بوون زۆربەی خاكەكەیان لێ ساندرایەوە چەند نمونەیەك دهێنینەوە دەڵێ (اصفی عمر بن خطـاب من السواد من قتل فی الحرب وارض من هرب وكل ارض كسری وكل ارض لاهل بیتە وكل مفیض ماء كل دیریزید وكل صافیـە اصطفاهـا كسـری وە هـەروەها لەهـەمان لایەن دەڵێ ( وارض من قتل فی المعركە، وارض من هـرب قـال: ولم یـزل ذلـك ثابتـا حتی احرق الدیوان ایام الحجاج بن یوسـف فـاخذ كـل قـوم مایلیـهم)[٩٤] بـەم جـۆرە هەموو ناوچەكان دابەشـكرا وەدەسـت بەسـەر داگـیرا چـەند شـارێكیش دروسـتكرا لەوانە شـاری (ابلـە) كرایـە بصـرە شـاری (واسـط) كەربـەلاو نەجـەف و (حلـەش) دروسـتكرا – بـەلام لـەداهاتوودا باسـی (حلـە) دەكـەین كــە چـۆن (گاوانیــەكان)

٩٣ بروانە كتاب الاصحابة فی تمیز الصحابة وتفسیر المعانی دیل اية (١٦) صورة الفتح.

٩٤ الامام ابو الحسن البلاذری فتوح البلدان ص٢٦٨ص٢٨٩ص٢٩٢

بەشداریان لە دروستکردنی کرد[٩٥] منصور بەغداشی لە گوندەکانی بادوریا، قصربل و بهزبوق و (نهربین)[٩٦] دایە هەموو خزم وکەس و سەرکردە و سەرباز و سەحابە و کاتبەکانی ئەمە دوارەوشیّ دانیشتوانی (بین النهرین) بوو لەسەردەمی ساسانی تا هاتنی ئەسحابە و عەرەبەکان کە هەمویان جابانی کورد بوون. بەمانای کاوانی کاوەیی گوتی کورد.

گەر طبری و بلاذری و مروج الذهب بخوێنیتەوە، بۆت روون دەبێتەوە بەغداو لە تەکیا کەلواذی و دەوروبەری تا خوارەوەی عێراق کورد بوون، ناوی هۆزەکانیش هاتووە. لەم دەقانەش هەمان مەبەست بەدیار دەکەویّ (ل٣١٨) دائرة المعارف الاسلامية) ج٥ دەڵیّ (ابن بلخی خاوەنی فارسنامە دەڵیّ: کەوا کۆچەرەکانی (کوردان)ی فارس کاکلەی سپای ساسانیان بوون، هەموویان لە شەڕی فەتحی ئیسلامی کوژران). یان لە کتێبی (محاضرات بتاريخ الامم ج١ ص٣٢٩ دەڵیّ: (بعد نقض الصلح بين (الهرمزان) سادە فارس والاهواز استعان (بالاكراد) لمحاربه جيش عمر بن خطاب وتم القتال على جسر سوق الاهوان) وتم الفتح الى (تستر).یان ص٣٢٤ ج١ هەمان سەرچاوە دەڵیّ (وكان رأى عمر ان يقتصر ما ملكه من (سواد العراق) ومن قوله (رض) لوددت ان بين السواد وبين الجبل سدا لايخلصون الينا ولا نخلص اليهم من الريف السواد واني اثرت سلامة المسلمين على الانفال) ص٣٢٤. کەواتە خوارووی عێراق ئەنفال کراوەو بۆ یەکەم جار عەرەبی لیّ جێنیش دەبیّ کە بەدیاریش دەکەویّ پێشتر دانیشتوانی هەمووی کورد بووینە لە کاتی شەڕەکە بە ماڵو منداڵەوە هەڵاتوون بەرەو خوراسانو چیاکان، دواتر ئەوەی بووەتە موسلمان گەڕاوەتەوە لەوانەش زۆرینەی گاوانییەکان کە باسیان لێوە دەکەین. بە تایبەتی لەم پەرتووکەدا.

---

٩٥ بروانە (جاوان) القبيلة الكردية لمنسبية و مشاهر الجاوانين، د. مصطفى جواد مطبعة المجمع العلمى الكردي.

٩٦ نهربین (مەبەستی نهربان) دیارە (بین) بەشێوە زمانەکە تۆمار کراوە کە بانە وەك بنەسڵاوە لە بانی سراوە یان سەرئاوە هاتووە کە سەرچاوەی کارێزەکانی دەشتی هەولێرن لەو بانەوە لە تەك رێزە گردی بەیوەند بە (دێدەوانە) کە لە (دیدە بانە) وە هاتووە بە مانای (مرصد) شوێنی دیتن و چاودێری کە نزیك هەولێرە - هەروەها سەربەن - لەسەربانەوە هاتووە یان بەنی هەریر لە بانی هەریرەوە هاتووە شوێنی هۆزەبانەکانە.

# لە کاتی هاتنی عەرەبەکانی موسلمان دانیشتوانی(حیرە)ش هەمووی کورد بون.

لە لاپەرە(٤٦) کتێبەکەی (ئەحمەد عادل کەمال) بەناوی (القادسیة) رۆژانی گرتنی خواروی (دوزێی دیجلە و فورات) ناوچەی (حیرە) کە بەدیار دەکەوێ دانیشتوانی هەمووی کورد بوە لە رۆژی(١٦ سەفەر ١٥ ھ کۆچی ٢٩ ئازاری کردۆتەوە زاینی کە دانیشتوانی(حیرە) جەژنی نەورۆزیان یاد کردۆتەوە خەرێکی ئاهەنگی ژن هێنانێکی گەورە بووینە کە ئەویش لە کتێبی **طبری**– ٤٩٢/٣ س. ش. س وەرگرتوە دەڵێ کاتێ عەرەبە موسڵمانەکان(٣٠) سی سواریان هەڵبژاردبوو وەك تیپێك بۆ کەمین دانانەوە و دەسکەوت وەدەست هێنان بە هۆی جاسوسەکانیانەوە هەستیان بەم ئاهەنگە کردبوو کە لە کاتی جەژنی (نەورۆز) بوو جەژنی بەهار.. لەو کاتە لە(حیرە) کە خوشکی (ئازاد مەرد)ی کوڕی ئازادبە (ئازاد بەگ)[(٩٧)] (مەرزی) مەرزبانی (حیرە) دەگوزراوە یان بە بوك دەچوو(وەك نەریتی کوردەواری) کۆمەڵێك سوار لە پێشەوە دەرۆیشتن لە پێش هەمویانەوە شێرزادی کوڕی ئازاد بەگ برای زاوا وەهەر وەها برای ئازاد مەرد(بۆ پاراستنی کەژاوەی بوك و زاوا. لە دەست دز و جەردەی خشڵ و زێڕی بوك وەك ئێستاش ئەم نەریتە ماوە) دەڵێ پاش ئەوەی سوارەکان تێپەڕیی پێشڕەوەکانی پێشەوەی موسڵمانان هێرشیان کرد و پشتی(شێرزاد) یان شکاند و دەستیان بەسەر خشڵو ماڵی بوکێ داگرت و هەروەها بوك و زاواو(٣٠) سی ئافرەتیان لە کچ و ژنان و

---

(٩٧) ئێستاش جافەکان وهەندێ هۆزی کورد بە سەرکردەکەیان دەڵێن بەگ بە = بەگ یەك ماناو سەرچاوەن بە مانای سەرۆك، بە فارسی مانای گرنگ و گەورەو پیرۆز.

خەڵکی دیهاتەکان گرت لەگەڵ (١٠٠) سەد کەس لە ئاهەنگ گێڕان و ماڵێکی زۆر کە بەژمار نەدەهات بە تەکبیرو بە دەنگی گەورە و ئەڵلاهور ئەکبەر هێنایانەوە لای (سعد بن ابی وەقاس) سەعدیش لەولآمدا ووتی:

((اقسم باللە لقد کبرتم تکبیرە قوم عرفت فیهم العزە)) ص٤٩ هەمان سەرچاوە کە لەهەموو مێژووی کورد روی نەداوە رێگری لە کەژاوەی بوکوزاوا و تالآنکردنی بکریٚ ئەمەیە جیاوازی عەقڵێکی بیابانیەك رەنگ نێوان عەقڵی زاگرۆسیە رەنگاو رەنگەکانی چاوتێر. باشە ئەگەر رۆژ ئاوای فورات کە(حیرە) بو حیرەش وەك باسمان کرد بەزمانی ئارامی بە مانای شوێنی چادر نشینەکان دێت.ئەگەر ئەم شوێنە بەم جۆرە لە ناوەکانیان رادیارە کوردن. کە(ئازاد) و (شێرزاد)ە تەنانەت لە نێو فارسەکانیش ئەم ناوانە نیە بڵێن ئارین یان فارس بوون. کە واتە ناوە و سنوری هەموو شوێنی ولآتی ئیراقی خواروی ئێستا یان(ئور) (ئاروا‌ك) (سۆمەرو بابل) هەمووی کورد بوو تا دەگاتە میسل-میثبالو[٩٨] "موسل" کە بەمانای(جەزیرە) جەزیرە(خوارەوە٢) دێت بەزمانی ئارامی-بۆزێدە زانیاری بروانە ئەم باسە لە گۆڤاری (خازر) هاوینی ٢٠٠٤. کە خەڵکی دانیشتوانی هەمووی کورد بوون کەواتە ئیراق لە بەسراوە تا لێوارەکانی خواروی فوراتیش بە رۆژ ئاواوە کورد بووە.. ئەگەر(بلاذری) و(طبری) بخوێنیتەوە بەوردوی زمانی کوردی بزانی لە ناوی دێهات و دانیشتوانی هیچ گومانێکت لەوەدا نامینیٚ بۆیی مرۆڤی کورد دەبیٚ ئەم راستیە مێژوییە بزانیٚ هەر چەند شۆڤێنیەکانیش ئەمەیان پیٚ ناخۆش بێت ئەمە هەقیقەتێکە مێژوو تۆماری کردوە-وە بە تایبەتی مێژوونووسانی موسڵمانی سەردەمەکە. کەواتە ئیراقی ئێستا سەرتاپای کوردنشین بوە. ئەگەر چی لێرەو لەویٚ هەندیٚ کەمایەتی فارس و ئاشوری و مەندائی و کلدانی ژیاون کە ئێستاش قەبارەو شوێنەکانیان دیارە کە لە ٥٪ دانیشتوان

(٩٨) مێژووی موسڵ، (موصل ف العهدين) یان گۆڤاری خازری ناوبراو، لێکۆڵینەوەیەکی دانەر، ژمارە(٦) ٢٠٠٤.

تێپەری نەدەكرد. ئەوەی ئێمە مەبەستمانە شۆڤێینەت نیە تەنیا راستیە و بەس تا لێكۆڵینەوەكەمان سیمای زانستیانەی ون نەكات و هەمیشە بەڵگەدار بێت.

١-حیرە: لە شوێنی كەربەلاو نەجەفی ئێستا بە كە دەكەوێتە رۆژ ئاوای روباری فورات، بەرامبەر بە(بابل) كە ئەو كاتە كەلاوە بوو(حیرە) بەزمانی ئارامی بە مانای شوێنی چادر نشینەكان دێت.

٢-ووشەی(جەزیرە) كوردی فارسی‌یە بە مانای(جەە زێرە)،(جەە ژێرە) لەبەر نەبونی پیتی (ژ) لە عەرەبیدا بە (جزری) ، (جەزەری) تۆمار كراوە عەرەبەكانیش وەك هەموو ووشەیەك كەبەرامبەری ووشەیەكی نریكیان بۆ دەگونجاند لە زمانی عەرەبی كردیان بە(جزیرە) كە هیچ مانەیەكی میثبالو جەەزێرە نا بەخشێ (جەزیرە) بەعەرەبی دورگەیە كە دورگە نیە لە نێو دەریادا بەڵگەشم بۆ ئەمە ئەوەی خوارەوەیە یان بروانە(الخازن) ژمارە٦. هەروەها ئاشوور و ئاقور بە مانای باشوور و باكوور دێت كە باسی لێوەكراوە لەم پەڕاوە.

١-میسل-میثبالو- كە عەرەبەكان كردیان بە(موصل) لە مانای(ئارامی) الارض الواطئة (جەزێرە) دێت بە كوردی (جێ ژێر)ە بەرامبەر بە جیێی بڵند كە زۆزان وچیاكانە كە كۆچەرەكان سەرێ و خوارییان دەكرد لە كاتی كۆچی هاوین و زستاننان.

٢-ئاشور-ئاقور:-كە دوو ووشەیە : ئاشور ناوی شارێك نزیك موصلی ئێستا بوو ئاشوور-ئاقور بە خورارێ و سەریێ سەرووی نێوان دیجلە و فوراتیان دەگووت بەواتای چیاكان و دەشتایی. كە هەمان رەگی دوو ووشەی كوردین (باشور-باكور) خوارێ -سەرێ زستان هەوار هاوین - هەوار كوێستان گەرمیان دێت١- (باكور) كە(ق) لەگەل(ك) جێگۆركێ دەكا لە لای عەرب و كورد كەلا. قلعة خندق(كەندەك) كەواتە باكور =ئاقور ٢-ئاشور بەمانای شوێنی(شۆر) شۆربونەوە خوارەوە دێت بەڵگەشمان بۆ ئەمە ئەوەیە((ئاشور ووشەیەكە نەسۆمەریە نە

سامیه)) وەك الاب سهیل قاشا لە ص ٢٩٧ باسی دەكا ئامارەمان پێكردووە كەواتە كوردیە كە كورد تاكە گەلێكی رەسەنی ناوچەكەیە ئەویش زمانی كوردیە رەگەكەش لە كوردی ماوەتەوە باكور–باشور وە بەهەمان مانای میسل–میثبالو–جەزێرە هەرسێ ناو یەك مانان بە كوردی جەهـ زێرەیە وەك زیرزەمین زێراب، عەرەبەكان ووشەكەیان بەسێ مانا شێواندوە (بتی شاری ئاشوور بە ناوی شارەكە كراوە) هەروەها (ئاشوریەكان) نیسبەت بە شارەكە لەگەڵ بتەكەیان، وەك بوتی (بابل) (بل) بەناوی شارەكە كراوە كە شارەكە یەكەم جار دروست دەكرێ نەك بووت لەلای نەزانەكانی ئاخر زەمان.

# هۆزی گاوانی لە خوارووی ئێراق لەسەردەمی عەباسییاندا

ئەم هۆزەی کەلە(بین النهرین) لەهەمان شوێنی سومەر و بابل و گوتیەکان هەر هەبوون و هۆزی کاوەی ئاسنگەرن. ئەمە کورتەی کتێبی– جاوان (جابان) القبیلە الكردیە المنسیە و مشاهیر الجاوانین ی دکتور موستەفا جەوادە...

جاوان–(گاوان) لەبەر نەبوونی پیتی (گ) ی کوردی لەزمانی عەرەبیدا بەشێوەی (جاوان) نووسراوە بەریزو خوالیخوشبووی . دانەر ئەڵێ (جاوان) گاوان) هۆزێکی کوردی زۆر کۆنە بەناوبانگترین هۆزە لە مێژوودا، هەروەها پایە بلندترین هۆز و بەرێزترینیانە بەکار دارترین هۆز بوو لەکاری سیاسەت و جەنگ لەعیراق. وە چاکترین هۆزە لەکاریگەریان لەسەر ئەدەبی عەرەبی بەتایبەت شیعرکە حەزیان لێ بوو بانگهێشتەیان بۆ دەکرد. بەڵام هیچ توێژەرێك لەمێژووی کوردان باسی نەکردوون و گرینگیان پێ نەداون تا وای لێ هاتووە لەبیر بکرین. یان ونبن ئەو لەمێژووی عیراقیدا هۆزی (گاوان) (جاوان) دەرێکی گرینگ و ترسناکیان هەبوو لەمێژووی عیراق و ئسیلام. کەپرە لەشکۆداری و کەرامەت و کەلەمێژووی عیراقدا دەبێ بخوێندرێ بەتایبەتی مێژووی کورد پشتگوێ خستنی کوفر و کەچی و ناتەواویە لەهەقیقەتی مێژوو شەرەفخانی بەتلیسی باسی نەکردون لەشەرفنامە کەچی بەشێکە لەمێژووی کورد، هەروەها فضل وللا ئەل عومەری لە مسالك ئەل (ئەبصار) خوالیخۆشبوو ئەمین زکی لەکتێبەکەی لەگەڵ ناوی چەند هۆزێکی دیکە بە (جوانی) باسی کردووە (مروج) بە (جاوان) مەسعودی بە ولد بن ربیعەی بن نزار لەقەلەمی داون لەگەڵ هۆزەکانی دیکەی کورد، بەڵام ئەمە دورە لەراستی

بـەڵكو سـتەم لەراسـتی دەكـرێ، كوردەكـان شـانازی بەخۆیانـەوە دەكـەن كەلەرەچەلەكی عەرەب نین هەمان سەرچاوە .

ئـەوەی بەلامانـەوە گرینگـە (جاوانیـە) هـۆزی (جـاوان) لـەنیوەی سـەدەی چوارەمی كۆچی بەناو بانگترین هـۆزی كـورد بـوون، لەسـەدەی شەشـەمی كۆچـی عیماد ئەل ئیسفەهانی لەباسی هـەندێ ئـەمیرەكانی دەڵێ (ئـەبو شـجاع عاسـم بـن ئەبی نـەجم ئـەل كـوردی لـەناودارانی و پیـاو مـاقولانی جاوانیـە)[99]. یـان (فـەیروز ئابادی دەلی جاوان هۆزێكـی كـوردن لـە (حلـە)ی مـەزید لـەئیراق جێنیشـن لەوانـە فەقیە محمەدین عەلی جاوانی سەبكی دەڵێ (ابو سعید ئەل جاوانی ئـەل حلـی ئـەل ئیراقی وە جاوان هۆزێكی كوردە لە حلە[100] (جێنشین بون دەبێ بزانین لە (حلە) لە گەرەكێ كەتا ئێستاش بەگەرەكی كوردەكان ناودارە) لەرۆژی دامـەزراندنی (حلـە) وەتا ئێستا كـە حلـە لـەكۆتایی سـەدەی پێنجـەمی كۆچـی سـەیف ئـەل دولـە بـن دبیس– بن مزید ئەل ئەسەدی مەزیدی دروستی كردوە) كە پێشتر لە خوارتـر لـە رووباری نیل ی خوارووی ئیراق پێشتریش خەڵكی جەزیرەی عەرەبی بـوون لەگـەڵ هاتنی ئیسلام هاتنە ناوچەكە. وەك بۆمـان روونبووەتـەوە كـە هـەزاران سـاڵ بـوو گاوانیەكان هەر لەم شـوێنە ژیـاون لەسـەردەمی سۆمەریەكانەوە.. شارەكەشـیان بەكـەرپوچی بـابل دروسـتكردووە وەك چـۆن بـەغدای كـۆن بەكـەرپوچی ئـەیوانی كیسری و تیسفون دروستكرد.

مستەفا جواد دەڵـێ: (جاوالیەكان بەدامەزرێنەری حلە دەژمێردرێن)

**كە دانیشتووانی رەسـەن كەلەسەدەی پێنجـەمی كۆچـی دامـەزراوە هـەر لەكۆنەوە گەرەكی كوردەكان (محلە الاكراد) بەناوی ئەوانەوە كراوە)**

ئیبن بطوطة لەوەسفی حلەدا دەلێ:

99 خەریدە الفصر: نسخەی پاریس ٣٢٢٧ ورقە (١٥٢–٣)

100 طبقات السبلی (٨٨/٤)

(خەلکی شاری حلە هەموویان دوانزە ئیمامین دوو تایفەن یەکیان بە (کورد) ناسراون ئەوەی تریان بە (جامعین) فتنە وناکۆکی هەردەم لەنێوانیاندایە) [١٠١] دکتور مستەفا جەواد بەردەوام دەبێ و دەڵێ: هۆزی گاوانی کورد هەر لە شاری (حلە) و دەوروبەری نەبوون. بەڵکو هەتا هۆر و زەنگاوەکانیش پەرت بوبون بەلای (واسط) و (بطائح). بەلام ئەمانە شوێنی رەسەنیان لەکوێیە (مەسعودی لەسەدەی چوارەمی کۆچی دەڵی بێ گومان ئەوانە لەهۆزەکانی چیاو بانە ساردەکانی ئەگەر بەدوای شوێنی هاتنە خوارەوەیان بروین. کەلە چیاوە بۆ دەشتایی هاتوون. بەدەم سیروان و لەلایی رێگای خوراسانەوەیە ئیمرۆ پێی دەلێن (پارێزگای دیالی) (کەرو بارەکە لەقولایی جێگای ئەوانەوە دێ) ناوی (ورام) ناودارترین ناوە بەکاری دەهێنن دوای ئەوەی لەگەڵ عەرەب هاموشۆیان بوو ئینجا ناوی عەرەبیان بەکار هێنا [١٠٢]. (کەواتە شوێنیان بەلای شارەزوورو سەرەوەتر دەباتەوە ... ئەمەشیان وەك بۆمان رۆنبووەوە کەلە مێژووی دور و درێژیان باسمان کرد لەسەردەمی سۆمەر وگوتیەکانی کوردەوە کە گاوانیەکان ٤٢٠٠ چوار هەزارو دوو سەد ساڵ بەر لەوە هاتوونەتە ناوچەکە و لێی ژیاون بەلکو پێشتریش کەناویان گوتی بوو دیارە لەگەڵ سۆمەریەکان گاوانیان کردوە. پاشان سەردەمی ساسانیان و هاتنی عەرەبی موسلمان و عەباسیان. کەواتە ئاگای لەمانە نەبووە.

هەر لە (بین النهرين) دابون کەواتە خەڵکی دانیشتووی رەسەن بوون بەهەزاران ساڵ بەر لەئێستاوە بەلام ناوچەی سەرهەلدانیان یان مەرکەز و پایتەجخت وسەنتەریان کە گوتین هەر لەشوێنی گوتیەکان بووە. کە هەمان

(١٠١) رحلة ابن بطوطة (١٣٨/١) مطبعة التقدم.

١٠٢ هەمان سەرچاوە ص١٢، ناوی مەلیکێکی گوتیش لەسومر ناوی (ارارام) بووە، انجيل سومر خزعل، ص٢٢٩، کە دواتر زانیمان کە نزیکە لە وارام.

شوێنی جافە کانە ئێستا کەناوچەی (جوانرو)[١٠٣]یە (گاوانروود) دەوروبەری رووباری گاوانەکان و زستان هەواریشیان) کە هەمان شوێنی (گوتیەکان) کەدەکەوتنە سەرووی رۆژهەلاتی ناوچەی سۆمەریەکان کەلە گەرمیان وخوارووی ئێراقی ئێستا دابوون. (گاوان روود) شوێنی جافەکان هەمان شوێنی گوتیەکان بوو کە پەرتبوو بوون بەهەر چوار لای کە ئێستاکەش لە رۆژئاوای سنەو سەقزەوە دەست پێ دەکا هەتا ناوچەی کفری و لەوێوەش هەتا زێی سیروان کاتی خۆشی هەتا خوارووی ئێراق ناوچەی کەر گەرایەو کوت و خوارەوەتر لەنێو زەنگاوە گاو لەکانی بین النهرنین هەتا دوا کۆتایی عەباسیان و دواتریش هەر هەبوون – پاشان دیارە وورده وورده گاوانیەکانی خوارووی ئێراق ئەوەی ماوەتەوە تعریب بووە بەلام (جافەکان)[١٠٤] کە پاشماوەی ئەوانن وەك گەورەترین هۆز لە کوردستانی ئێرواق و ئێران پارێزگاری خۆیان کردووە کە پاشماوەی گوتیەکانن تائێستا مەسەلەکە تەنیا ناوەکەنیە مێژووەکەو سەرچاوە بەهەمان ناوە ماوەتەوە کە نکۆلیٚ و گومانی لیٚ ناکریٚ بلێین گاوانەکان خۆشناون یان زەرارییین یان حەمیدی .. کە عارد و ئاسمان بەهەموو شێوەیەکی جوغرافی و مێژوویی زمانەوانی لێکدورن لەرووداوەکان و سەردەمی سۆمەریەکان لێك دوورن لەناو ماناکان بۆیی راستی بەخۆی هاوار دەکا. وەك دکتور حسام الدين علی غالب نەقشبەندی دەلیٚ (جاوان – معربە عن (گاوان) الكرديه راعی البقر)[١٠٥].

گاوانیەکانی رۆژهەلاتی دجلە ئەو کاتە لە دەم رێگای خراسان و بلد (رۆز) و براز الروز، بە سەرۆکایەتی ئەبو دلف ئەلقاسم بن محمد ئەل جاوانی کۆمەلێك سەلجوقی لەسالی ٤٣٥ کۆچی تێك شکاند بۆیی پیٚ دەچیٚ لەلیواری نهروانەوە

---

١٠٣ جوان رو ەفارسی جوان روود یانی گاوان روود روباری گاوانەکان– جابانەکان بروانە هامش ص ٧٩ العشائر الكردية– فؤاد حمه خورشید روود =رووبار. بروانە نەخشەی ئێران بەفارسی نووسراوە (جوان رود).

١٠٤ مینورێکی لەدائیرەی معارفی ئیسلامی دەلی (جاوان) رەچەلەکی هۆزی (جاف) ئێستان

١٠٥ کۆری زانیاری کورد ٢-٢-١٩٧٤ ص ٢٧٨

بەرۆژ هەلاتی بەغدا هەتا جرجرایا نزیك کوتی جێنشین بوون (ورام الکردی الجاوانی) کە ئەمیر ئەبو الفتح یان پێ دە گوت کەلەبەغدا مرد جەنازەکەیان بردەوە جرجرایان (گرگرایا) نزیك کوتی ئێستا لەوێ ناشتیان[١٠٦] (کە گۆرستانی باوك و باپیرانی بووە) ئێستاش بەگەکانی جاف بەهەمان شێوە بەدەها پشتیان لەیەك گورستان دەنێژن وەك (السعدیە) کەواتە قولایی گاوانەکان لەناوچەی کوت بووە کەئەمیرەکەیانی لێ بووە یان سەردەمێك پایتەختی بەرە بابێکیان بووە وەك حلە– برازروز (برازرود)

سیف الدولە صدقە خزم و کەسەکانی برواین بە ئەمیرەکانی گاوانی هەبوو زۆر ناوچەی لە (واسط) ناوچەکانی خواررووی دانەوەی لەوانە ئەمیر ئەبو نەجم) بەناوی (کراوە لەخواررووی ئێراق نیزك گوندی فارس لەسەر لێواری دجلە لەنێوان (واسط والمذار)[١٠٧] ئە ویش ئەبو نەجم وەرام بوو کە خواررووی واسط لەژێر دەسەلات و کۆنترۆلی دابوو کە رۆوباری (برجدا) و (سنیە) بەناودا تێپەر دەبێ. پاڵەوانێك بوویەوە ناوداربوو کە شێری لەلانەی دەکوشت بەخەنجەرەکەی تا مرد دەبێ (٥٠) پەنجا شێری کوشتبوو[١٠٨] ئەمەش (گودیا) سۆمەرمان بیر دەخاتەوە کە بەدەها وەژدیهای کوشتوە یان شیر کوژی لەسەردەمی گوتیەکان(*). لەناوچەی سۆمەر بروانە پەرستگای گودیا ناوی (پەنجا) بۆوژکێ شێرو ئەژدیهاکەکانی لێ دادەنا سولطان محمد ویستی کورد بەکوشت بدا زۆربەی وولاتی خواررووی ئێراق کەلەژێر دەستی (صدقە) و هاوپەیمانەکانی گاوانی دابوو

---

١٠٦ هەمان سەرچاوە– (کوت) بەرای ئێمە لە (گوت)لە(گوتی)یەوە هاتووە. شوێنی گوتیەکان و پاشماوەیان (گاوانی) بوە، وەك بەڵگەیەکی دیکەی بەیەك بەستنەوە.

١٠٧ جوان : تفسیرە تکردیە المنسبە ص٢١

١٠٨ هەمان سەرچاوە ص ٢١

*بروانە (گودیا) لە کتێبی سومر اسطورة وملحمة د. فاضل عبدالواحد علي.

دایە کوردێك بەناوی (سیاگیل)[١٠٩] زۆربەی ئەو کوردە جاوانیانەی لە (حلە)و ووڵاتەکانی دەوروبەری واسط تا ناوچەکانی فوراتی جێنش بوون[١١٠] زۆر جاران ئەو جاوانیانە پارێزگاریان لەشاری بەغدا کردوە کەلەو کاتەی وزیر عمید ئەل دەولە ئیبن جهیر کوردەکانی جاوانی و ئەمیرەکەیان ئەو کاتە ورام بن ئەبی فراس ئەل جاوانی بانگ دەکا پارێزگاری لەبەغدا بکەن دژی سەلجوقیەکان[١١١] یان تورك و مەمالیکە تورکەکان.

(تیسفونج) گوندێکی گەورەبوو بەرۆژهەلاتی دجلە بەرامبەر نعمانیە ئەمیر سیف ئەل دەولە ئەبو نەجم بدربن ورام ئەل کوردی ئەل جوانی و هۆزەکەی لێ دادەنیشت واتا بەرەبابەکەی[١١٢] دبیس مەلیکی عەرەب لەحلە پشت و پەنای گاوانیەکان بوو .. کاتێ لەگەلیان هاوپەیمان بوو[١١٣].

جاری وا هەبووە لەنێوان (دبیس) و جاوانیەکان و هەزبانیەکانی هەولێر هاوپەیمانەتی دروست بووە بۆ پارێزگاری کردنی بەغدا و خەلیفە دژی سەلجوقیەکان[١١٤] هەروەها لەگەڵ ئەیوبیەکان[١١٥] بەهەر حال بەداخەوە پاش ئەوەی جاوانیەکان لە بین النهرین فوراتی ناوەند خواروی ئێراقی ئێستا و ناوچەی ئێراقی کۆن شوێن سومەر و گوتیەکان دەورێکی گرینگیان بینیوە بەلآم دواتر وردە وردە هەندێکیان لەقەبی خۆیان بردەوە سەر عثمان بن عفان وەکو

١٠٩ هەمان سەرچاوە ص٢٣

١١٠ هەمان سەرچاوە ص٢٥

١١١ جاوان القبيلة الكردية المنسب د. مصطفى جواد ص١٩

١١٢ جاوان القبيلة الكردية المنسب ص٢١.

١١٣ جاوان القبيلة الكردية المنسب ص٢٣.

١١٤ جاوان القبيلة الكردية المنسب ٢٣ص٢٤ص٢٥.

١١٥ هەمان سەرجاوە ص٤٢

ئیبراهیم بن میکائیل ئەل کوردی کەبەشیخەکانی چیا دادەنرێت کورەکەی (قطب الدین) هاتبوە بەغدا نەسەبی خۆی بەدەست خۆی گۆری[١١٦].

لەو کاتەی ئیمارەتی گاوانی و دەولەتی ئەیوبی کوردی لەشام لەناو دەچێ بەدەستی هۆلاکۆ و هەندێ عەرەب و تورکەکان– ئەمجارەیان– کوردەکان خۆیان دەدەنە پالْ ناو و نەسەبی گەورە پیاوانی عەرەبی موسلمان بۆ ئەوەی بەهۆی پیرۆزی بنەمالەکە پیرۆزی خۆیان لەدەست ئەدەن و لەسەرکردە و بنەمالە د.مستەفا جواد دەلی (زۆر لە کوردەکان وازیان لەلەقەبی کوردی و گاوانی وەرامی هێنا یەك لەوانە ئیراهیم بن مالیك الاشتر وازی لەلەقەبی (ئەلکوردی هێنا تەنیا مالیکی نووسی وەك لە ئەل رەوەضات ٣٩٢ هاتووە زۆریان لەقەبی خۆیان بردە سەر عثمان بن عفان یان خالد بن ولید هەتا نزیك ببنەوە لەئەشرافی عەرەب شوێنە کۆمەلایەتیەکەشیان لەدەست نەدەن و دەسەلاتی ئەوانیان هەبێ ئیبن ئەل قوطی لەباسی ئیبراهیم میکائیل ئەل کوردی کەلە لاپەلاە (٤٠) بکە لە گاوان (جاوان) القبیله الکردیه المنسیه دکتور مصطفی جواد دەلێ (لە تلخیص معجم الالقاب ص/٢١٧ هاتووە دەلێ (فخرالدین ئەبو محمد ابراهیم ئبن میکائیل بن ئیسماعیل ئەل عوثمانی شیخ ئەل جبال (شیخی چیاکان) لە موشایخەکانی چیاو دەربەندە لەهیرەوەی حلوان (درتنگ) و (باوە) نەسەبی بەئەمیری ئیمانداران عوسمانی بن عەفانی ئەمەوی هەیە کورەکەی قطب ئەل دین چووە بەغدا نەسەبەکی بنوسی کە ئێستا لەدەستیەتی مەبەستی خاوەنی کتیبی معجم الالقاب ٢١٧/٤ کەوای نووسیوە.

ئەم کارەش زۆر کەسی گرتەوە وەك بەئیبن خلکان دەلێن بۆتۆش واناکەی ئەو دەلێ شتی وا ناکەم بروانە پێشەکی کتێبەکەی (وفیان الاعیان) کەباسی مێژووی ژیانی دەکرێ خۆی بەعەرەب نەنوسیوە هەروەها یەکی لەپاشایانی

---

١١٦ هەمان سەرچاوە ص٣٩ص٤.

ئەیوبی لەیەمەن خۆی دەکاتە نەوەی مروانی ئەمەوی مامەکەی ملك عادلی ئـەیوبی نامەی هێرشی بۆ دەنووسی پاشان کوردەکان دەی کوژن[١١٧] وارامیش اعلانی کرد کەلە نەوەی خەلیفە عوسمان بن عفان الاموی کەچی عەرەبەکان دەلێـن وانیـە[١١٨] زۆری دیکەش هـەر بـۆ ئـەوەی بـەرژەوەندی خۆیـان بپـارێزن لـەو کاتانـەی هـێزی سەربازی هۆزی گاوانی بەرەو لاوازی چوو ئەوانیش ویستیان خۆیان و ماڵ منالیان و بەرژەوەندیەکانیان لەنێو عەرەبەکان بپارێزن کە زۆربەیان شیعە بوون، گاوانیش سوننە. بەمە بەدیار دەکەوێ کەوا بەتەواوی دوای ئەم رووداوانە گاوانیەکان لـەنێو عەرەبەکانی فوراتی ناوەند بتوێنەوە و ببنە عـەرەب وولاتەکـەیان تعریـب بکـرێ و (بەلاّم لە (حلـە) گەرەکەکـەیان هـەر بـەناوی گـەرەکی کـوردان ماوەتـەوە ناویـان بەتەواوەتی لەمێژوودا نەهاتووە تـا میجەرسـون باسـی (جـاوان میرخـان سـەرۆکی هۆزی هەمەوەند دەکات لە کتابەکەی (بەرەو دوو رووبـار و کوردسـتان) کەلەسـالێ ١٩١٢ چاپکراوە بـەلاّم ناوبـانگی جاوانیـەکان دەنگـو باسـی مـێرینی و ئازایـەتی و هەروەها زانایی و لێ هاتوویان لەمەیدانی ئەدەب و علمو مەعریفەت هـار ماوەتـەوە و وون نابی. دانەر لێرەدا لە کتێبەکەی (جاوان القبيلـه الكرديـه المنسـيه- باسـی زۆر لـەو نـاو دارانـە دەکـات ئێمـەش نـەمان توانـی هـەموو ئـەوەی لەسـەر جابـان گاوانـەکان لـەمێژوو دا تۆمـار کـراوە لـێرەدا بینوسـینەوە چونکـە مەبەسـتی سەرەکیمان تەنیا سەلماندنی بوونی گاوانیەکان بوو لە فوراتی ناوەند لەسەردەمی عەباسیاندا و پێش هاتنی ئیسلام کەلە هەمان شوێنی خۆیان شوێنی مێژوویان کـە خۆ راگرو نەبەرد بون ئێستاش لە ناوچەکانی رۆژهەلاتی دجلە کوردێکی زۆری لێیە وەك پاشماوەی مێژووی پر لەسەروەری و زولم لێ کراوی کە ئەگـەر دلسـۆزیان بـۆ

---

(١١٧) بروانە صەلاحەددین ئەیوبی، من جدید ، عەبدول خالق سەرسام. بۆ زێدە زانیاری.

(١١٨) لەوانە عمادالدين بن محمد بن ابی فراس حسام الدين الكردی الجاوانی الوارامی ناوی خـۆی کـردە (عمـاد الدين بن جعفر ابی فراس النخعی الحلی الامير) ص٤٠ هەمان سەرچاوە.

ئاین نەبوایە لەنێوزمانی عەرەبیدا نەدەتوانەوە[119]. ئەم هەموو خاك و وولاتەشیان لەدەست نەدەدا ئەمەش بووە هۆیەك بۆ بەهێز كردنی نەیاران و دوژمنانیان و بەرژەوەندیەكانیان كەپێی بەپێ هەروەها هەلدەكشێن ونەتەوەو (هوزی كاوەش) پاشە كشێ دەكات بەرەو قولایی چیاكان و شاری كەركوكیشمان پێ رەوانابینن هاتن و گەیشتنە نزیكی پایتەخت و لێواری چیاكان ئەمە هەموو تەنیا لە ماوەی (١٤٠٠) ساڵ.

(١١٩) بۆ پاشماوەكانی دانیشتوانی ئێستای خواروی ئێراق بڕوانە (دراسە طبیعە المجتمع العراقی– د. علی الوردی ص ١٥١، ١٥٢، ١٥٥) هەندێ لەو دانیشتوانە بەرەچەڵەكی هیندی لەقەڵەم دەدات كە دیارە هیندۆ ئەورووپین.

# هۆزی جاف خەڵكی ناوچەی جاوان و خوارووی عێراق و پاشماوەی جابانەكان

لێكۆلینەوەیەكی زمانەوانی یە بۆ پاڵپشتی لێكۆلینـەوەی ئـەنترۆپۆلۆجی و مێژوویـی و ئـەركولوژی و پاشماوەكـان و راكـانی ڤیلچیڤسـكی لەسـەر – گوتــی و فدارسیای جافەكان.

كاوەو هۆزی جاف و جابانی كوردی

كابیان و كاویان و گاڤ یان (جافی گاوان روودی)

جاف – جاو – گاڤ – گاو – گاوان – گاڤانە – گابان – گودی – جود – جودی – گوت – گوتی – گاوە – گاوانی – كاوە – كاوانی هـەمو یـەك ماناومـەد لولن بەنووسینی كوردی و فارسی و عەرەبی[١٢٠] هەروەها بەزمانی سۆمەریش غود– گود– گودا[١٢١] بەهەمان مانا دێت كەبەمانای گاو گاوانیە – گاو – ا – ثور سمبـولی ئازایی و پالەوانی بووە لەگەڵ خواوەندی و پیرۆزی گا لەو سەردەمەیدا كەگلگامش تەنیا پالەوانیەتی لەوەدابووە كە توانیویەتی (گاو) گا لە زۆرانبازیدا ببــەزینی وەك گەلەگامێش – كە دیارە هەمان ووشە بەكوردی گامێش بەعەرەبی (جاموس) دێـت لەبـەر نـەبوونی پیتـی (گ) لەعــەرەبیدا بــە (ج) دەنووســری ئـەگینا (گــاموس) (گـاموش)ە گـامێش وەك ئاسـوری – ئاشـوری‌یە (س ) (ش) جێگورگـی دەكـا –

---

١٢٠ وەك ئاب. ئاو . ئـاڤ ، گـاڤ ، گـاو (ثـور) وەك : ئـاب، ئـاو ، ئـاڤ فارسـی ، سـۆرانی، بـادینی، عەرەبی.

١٢١ غود – گود – گـاوی بروانـە یوسـف الحورانـی – البنیـة الذهنیـة الحضاریـة في الشـرق المتوسـطی الاسبوی القدیم ص ٧١ دار النهر للنشر

گاباني – جاباني بابزانين چۆن جافەكان پاشماوەى گاوانيەكانن كەكاتي خۆی بەشێك بوون لە گوتيەكان پێشەكی مینورسكی بەبێ ئەوەی ئاگاداری هيچ مەسەلەيەك بێت كەمن لەهەموو شت ببومەوە كاتي بەبەرچاوم كەوت دەڵێ گاوانيەكان لەهۆزی جافن[١٢٢] من يەكسەر بە مينورسكي بروام نەكرد يان نەم خستە خانەی لێكۆلينەوەكەم چونكە گەورەترين هەڵەی دەرهەق بەزێدی باپيراني سەلاحەدين ئەيوبي كردبو كاتێ كە خەڵكي دوا سنووری ئازربيجانن بەلای رۆم[١٢٣] ئەو هەستا بەبێ بەڵگەو لێكۆلينەوە برديە ئەرمێنا ئەوەی پشتي پێ بەست نوشتسي هێنا بۆيي بەخۆم دەستم كرد بەلێكۆلينەوە – وەك ئەوەی هيچي نە وتبني وابوو بەلای منەوە – بەڵام دواتر رای ئەويش هاتە رێز بەڵگەكان تەنيا بو بە بەلگەيەك لە بەڵگەكانی نەك هەموو بەڵگەكان بە تێكەڵاوی.

٤– ئێمە زانيمان چۆن گاوانيەكان پاشماوەی گوتيەكانن لە (بين النهرين) يان (ارض السواد) يان ناوچەی سۆمەريەكان و بابل– كەسەدەيەك زێتر ژێر دەستي گودی – گوتيەكانی كورد بوون كاريگەری لەسەر دروستكردن.

٥– هەر لەو لێكۆلينەوانەدا جێگای گوتيەكان دەستنيشان كرابوو كەشمالی شرقی سۆمەرە هەمان ناوچەی جافەكانی ئێستايە بە كوردی (سەروی رۆژئاوا).

---

١٢٢كۆری زانياری كورد جلد (٢) قم (٤) سالی ١٩٧٤ لە دائرة المعارف ئيسلامی

١٢٣كە ئێستاهەمان (دوين)ی سنووری ئازربيجانی كۆن سەر بەشاری هەولێرە شوێنەوارەكانی ماوە بەڵگەی ئەمەدەدەن كە شوێنی هۆزە بان و رەوەند وئەو زاريانەی كە هۆزی سەلاحەدين ئەيوبی بوون بروانە صلاح الدين الايوبی من جديد عبدالخالق سەرسام.

٦- بەهەمان شێوە ئاماژە بەگاوانیـەکانیش کراوە باسمـان کـرد کـە چۆن کوردن و خەلکی هەمان شوێنی جافـەکانن لەرەسـەندا بەهـەمان نـاویش چونکە زۆربەی ناوەکانی قولایی کوردستان بەرەسەنی ماونەتەوە.

٧- ووشـەکان- مانـای نـاوی گـاو گـاوانی - جـاو - جـاف جاڤـانی جودی گودی گودا - یەك ماناو و یەك رەگـن کـە پـەیوەندیان بەبـەخێوکردنی گاو گامێشەوە هەبووە قۆچـی گایـان لەسـەر نـاوە[١٢٤]، وەك کـلاو وپیستـەی گایـان کردۆتـە جـل و بـەرگ، سۆمەریەکان پێشـتر پیستـەی مـەرو خۆریـان لەبـەرکردووە وەك لەوێنـەکاندا دیـارە کـەهی لــە ســەردەمی پێــش([١٢٥]) گوتیەکانن.

٨- جافەکان بەرەسەن خەڵکی (جوان روود) [١٢٦]ن (جوانـرو) خـاکی بـاوکو باپیرانیـان. کـەدزانین جـوان لــە (گــوان) (گــاوان) دەهــاتووە (روود) بەفارسی بەمانای رووبار دێت روباری گاوانان. کەواتە جـاف لـەگاوان روودە و هـاتوون کەواتـە ئـەوان گـاوانین مینورســکی ئــەمجارەیان راســت دەکـا بـۆ بەڵگەکەشـی نـازانم پشـتی بـەچی بەسـتوە کەواتــە جافــەکان گــاوانین یــان گاوانیەکان - جافن- ناوەکەش جاف جاڤانی بەهــەمان مانـا دێـت لـەکوردیدا لەبەر ناخۆشی ووشەی (جاو) لەسەر زمـاندا گـاو بـە (جـاو) فونـەتێك کـراوە. کەهـەمان وشـەی (گـاو) گاوەیـە (لەسـەرزبان سـوك بـووە بووەتـە (کـاوە) ی ئەژدیها[١٢٧] کوژ.

---

(١٢٤) وەك (شخصية ذو القرنين) یان (ذو الاكتاف) بەهەمان ماناو كاریگەری دو قۆچەکەدێت.

١٢٥ بروانە العشائر الكردية - فؤاد وحمة خورشيد - عشيره جاف ص٧٦

(١٢٦) بروانە گوتیەکان لەکتێبی (چیانشینەکانی زاگروس نوسینی هورمزی بیگلەری) چـاپی ٢ ص ٤٣ هەمان شوێنی جافەکانی ئێستایە لەگەڵ هۆزەکانی دیکەی کورد.

١٢٧ ئەژدیهاك (زوحاك) ناونیە بەلکو بەمانای درندە دێت زهاك كورتكـراوی (ئەژدیـهاك)ە ئەژدیـهاك- زحاك - زهاك.

٩- هۆزی جاف یەکێکە لەهۆزە هەرە گەورەکانی کورد کە زۆرتـیرە و بەرەباب و هۆزی دیکەی بەخۆیـە گرتـووە ئەمـەش بەڵگـەی ئەوەیـە کـە ئـەم هۆزە هاوپەیمانـەتی گـەورەو کـاری گـەورەی ئـەنجامداوە لـەمێژوودا بەمـەش سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێناوە - لەوانەش لەباوەشی گرتنی دەولـەتی ساسانی و دروستکردنی دەولەتی گوتی لە مێژوودا. کە ئەم مێـژووە نـاتوانرێ بدرێتە هیچ هۆزێکی دیکە خۆی نەبێ یان تـەنیا لـەم هـۆزە دەوەشـێتەوە کـە زیاتر لە (٦٠) شەست هۆزن جگە لە هۆزە هاوپەیمانەکانی کۆن.

١٠- ئەم مێژوو دوورو درێژە پر رەسەنایەتیە، رەسەنایەتی کوردو بـەدیار دەخـات.. کـەرەگی لەگوتیەکانـەوە بـەدیار دەکـەوێ ەبەسـتەکە هۆزگـەریاتی و گرینگی دان نیە بـە (هـۆز) چونکـە هۆزەکـان میللـەتیان دروسـتکردووە یـان هـۆز سەرەتای نەتەوە دروستبوونە.

١١- ئەم هۆزە لەبەغداو بابل و ئـورو خـواروی عـیراق زۆر نزیکـە شـتێکی سروشتیە هەر خۆی دەم رووبـاری دیجلـە و نیـوان دوو رووبارەکـە (بـین النـهرین) دەست بەسـەردا بکـرێ و مێـژووی دروسـت بکـات. زێـتر لـەهۆزە بیابانـەکان کــە رووباری فـورات و بیابـانێکی پـان و بـەرین و بـێ ئاویـان لـەپێش ببـوە سـنورێکی گەورەی سروشتی.

١٢- ئەو گاوانیانەی مێژوو باسیان دەکـا کـە ارض السـواد یـان (السـواد) بەجێ دەهێلن دەگەرێنەوە ئازربیجان ئاتر پایگـان بـەرای مـن بۆیـێ پیـان دەلێـن جافەرەشکە لە (جافە رەشـگاە) وە هـاتوو (رەشـگان) بـەکوردی بەعەرەبەکـەی بەمانای (السواد) دێـت دەبێتـە کینایـە لـە سـواد العـراق وە هـاتوون گەراونەتـەوە دوکان و دۆلی جافایەتی کە ئازربیجان لە (مجمع باینجانەوە) دەست پـێ دەکـا تـا دەگاتە دەریای قزوین و سوفیەت ئەرمێنا بەلای رۆژئاواشیەوە و خاکی جـەزیرە. کەواتـە (جافـە رەشـگا)ش دەبێتـە بەڵگەیـەك کـە گاوانیـەکانی (حلـە) و ئـورو

(واسط)وە هاتوونەتەوە ناوچە کوردیەکان و کوردەواری قوولایی چیاکان ئەوانەن کە نەبوونەتە عەرەب یانیش لەزۆری ورەش و رشەوە هاتووە کە بەدووری دەزانم چونکە ئەگەر وابوایە دەبوە لەقەبی هەموو جافەکانی کە ئەسمەرن بە رەچەڵەك هیندی ئاریایی.

١٣- ئەم هۆزە لەدەوروبەری تیسفون (بغدا) پایتەختی ساسانیان بوو زۆر بەهێزبوو بۆیێ هەمیشە سوپای پێشەوەی متمانە پێ کراوی دەولەتی ساسانیان بوون. هەر بۆیەش فارسەکان چیرۆکی کاوەیان واگونجاندووە کە کاوە هێزی سەربازی و (فەریدون)[١٢٨] خانەدان و پاشایە بۆ ئەوەی بلێن هەر فارس سەرکردەبوە. بەلأم لەراستیدا گاوە مرۆڤێکی شورشگێری گوتیە (گودیە) لەناوچەی سۆمەر و بابل نەك سەر فارسەکان – خۆی ناکا بەحاکم چونکە گوتیەکان سەرەك هۆزی خۆیان هەبووە لە چیرۆکەکانی سومەری تەنیا ئاماژە بەگوتیەکان دەکات – گاوەکانیش جێگرێکی ئاشتی خواز کەلە (گودئا) (کودیا) باسی دەکەین یان باسمان کردوە. کەمەبەست گودی گوتیەکانە[١٢٩] کاوەش کوردێکی گودی گوتی بووە بەمانای گاوەو گوتی گودی یەك مانا بەخشن، .

١٤- مینورسکی دەلی گاوانیەکان لەهۆزی جافن راست دەکا هەرچەندە بەڵگەکانی ئەو نازانم چییە.

---

١٢٨ فەریدون ناوێکی تازەیە لەسەردەمی کۆندا نەبووە بەتایبەتی پێش هخامنش و میدی کەواتە دەسکردە زیاد کراوەتە سەر چیرۆکە کە لەلایەن فارسەکانەوە تا بەشداری شۆرشی کاوە بکەن کە دەفەکەی ساسانی هخامنشی بوو.

١٢٩ لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ شورشی (گاوە) شورشی گاوانە کوردە کانە لەناوچەی بین النهرین (سۆمەرو بابل) شورشی کاسبکارانی تازە دروستبووە لەدژی (ئەژدیهاك) پاشایانی ئەکەدی وبابلی کە قۆچ نیشانەیانە لەسەر شانە وەك لەوێنەی (فرام سن ) و(حامورابی) بەدیار دەکەوێ. ئەژدیهاك بەمانای درندە ناوی کەسێك نیە کەمەبەست پاشای ئەکەدی و بابلە

بۆیی پێویستە نەهێلین هیچ نەزانێك لەمێژوو دەستكاری مێژووی كوردو ئەم هۆزە بكات كە پاشماوەی فدراسیای هۆزی گوتیەكانن كەرەگ و بنەماو بناغەی پەیدابوونی میللەتی كوردن. شان بەشانی میدی وماننایی و كاسی لولوەكان. كورتەیەكیش دەبێ لەم هۆزە بزانین كەتا ئێستا گرینگی گوتیەكانی پێوە دیارە لەگەڵ هاوپەیمانەكانیان بەدرێژایی مێژوو[١٣٠].

## دوو تێبینی زۆر گرنگ:

**١. هـ. جـ. ویڵز: لە موجز تاریخ العالم لا ٧٩-٨٠ دەڵێ**

**(ئاریەكان گەنمیان دەچاند خاكیان بە (گا) دەكێڵا ئەوان یەكەم كەسێك بوو ئاسنیان تاواندەوە). (ئاریەكان مەبەست لەكوردەكانە)**

**بۆ بەڵگەی راستی ئەم ووتەیە كە هـ. جـ. ویڵز ئاگاداری نیە هەموو كوردێك دەزانێ لە نزیك پێنجوێن شوێنەوارێك هەیە پێی دەڵێن (كورەی كاوە) شوێنی ئاسن توانەوەیە كە دیارە دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی گوتیەكان كە چەكوشیان بۆ سۆمەریەكانیشت دروست دەكرد. لەبەر ئەوەی ناوچەی سۆمەر نە ئاسن و نە دار بەرووی سوتاندنی لێ نەبووە وەك ناوچەی گوتیەكان كە ئێستا هەمان پاشماوەیان هۆزی جاف و هۆزەكانی كوردی دیكەی لێیەكە پەیوەندی مێژوویی دروست دەكات.**

**٢. ئەوێستا بەم جۆرە وەسفی (ئاژیدهاك) دەكات: (ئەو هێزی زاڵ بوونە(فەرەیدون) هەیی بوو توانی ئەژدیهاك كە خاوەنی سێ قەپۆز و سێ سەرو شەش چاو و هەزار چەشنە فێڵ و تەڵەكە بوو شكەست بدات پاشان دەڵێ: (بەهرام بەرەكەت بدات بەم ماڵە وكەلەی گای تێدابێت) ئەم دەقە لەگەڵ وێنەی دووەمی ئەژدیهاكی سێ سەر دەگونجێ كەلە پاشكۆی وێنەكاندا هەیە هەروەها مەسەلەی پیرۆزی و (گا) و (بەهرام))**

*** بەهرام یەشت لا ١٩٤، ١٩٥ نامەی مینەوی زەردەشت وەرگێری عومەری فاروقی[١٣١].**

---

(١٣٠) بروانە بەشێكی تایبەت لەم نووسراوە لەسەر هۆزی جاف.

(١٣١) ئەویستا لا ١٩٥،١٩٥ وەرگێر عومەری فاروقی.

# پێناسەیەكی هۆزی جاف
# كە پاشماوەی گاوانیەكانی گوتین

لەنزیكترین سەردەمەوە دەست پێ دەكەین بنەماڵەی بەگزادە لەنێو هەموو لقەكانی و تیرەكانی ئەم هـۆزە جێگـای رێـزە كەبەبنەماڵـەی سـەركردەی هۆزیـان دەزانن.

بەگزادەی جاف لەسالی ١٩١٩ دیارە دوو جۆرە هەلوێست بە دیار دەكەوێ و دوو بـەش بوینـە یـەكیان بەسـەرۆكایەتی (عادلـە خـانم) خـێزانی عثمـان پاشـاو لایـەنگری ئینگلیزیـان كـردووە عادلـە خـانم (وسـام) و نیشـانە (خـان بـهادور) ی وەرگرتووە، بەرەی دووەم بەسەرۆكایەتی زڕ كوری عادلە خانم بـوو كـوری عثمـان پاشا لەژنەكەی دیكەی كە ناوی حامد بگ كوری مەجید بەگ كوری عوسمان پاشـا بوو كەواتە یەك بنەماڵە حوكمی جافیان دەكرد زۆربەی هۆزی جـاف لـەگاوانی رود (جوانرو) جاوان رود[١٣٢]: شوێنی بـاوك و باپـیرانی گاوانیـەكان بـەواتای جافـەكان بەواتای گوتیەكان كە دیارە لەم رووبارە ناوچـە بەرفراوانـە كەبـەلێواری دیجلـە و فورات دەچێ كەدەكەوێتە سنووری رۆژئاوای ئەوان بەهەمان شێوە لەدەم رووباری دیجلە و فوراتی خواروو بین النهرین جێنشین بوینە چونكـە یـەك شـێوە سروشـتیە بۆ بەخێو كردنی رەشە وولاخ و گـاو گولـەك كەئەمـەش كـاری هۆزەكـانی (هندیـە)

(١٣٢) ی. ئی ڤاسیلیەڤا بە جاڤـانرود (زێـی جافـان تۆمـاركردووە)، ل١٩٣، و. رەشـاد مـیران، یـان ڤیلیجیڤسكی كە زاراوەی (گاڤسواری – شوان) بەكاردەهێنێ هەمان ووشەی جـاف سـواری (جـاف بـەدی دەكرێ هـەروەها لـە لا(١٧) تـأریخی جـاف لـە نووسـینی كریـم بـەگی فتـاح بـــەگی جـاف لێكۆلێنەوەی د. حسن جاف هاتووە مێژووی جاف دەگەڕێتەوە ٣٩٤٠ ساڵ بەرلەئێستا بەلام بـەبێ بەلگە هێنانەوە.

لەکۆنـەوە کوردیـش هینـد و ئـەورووپی خـۆی لـێرەدا دەسـەلمێنیٚ بەتایبـەتی گـەر سەیری دەستورو ئاینی گوتیەکانمان کرد رێز گرتنە لە (گاو) وەك سمبولی بەهیزی و ئازایی و گاریگەری ئەمەش لەسەر سۆمەریەکان.

رستـەی (گـاوان رود) (ارض اسـلافهم فی جوانـرو) ئـەوە دەسـەلمێنیٚ کـە جافـەکان (گـاوان) روودیـن کەواتـە گـاوانین (جـاوانیش) بروانـە (ص٧٩) الهـامش العشائر الکردیە فؤاد حەمە خورشید. بەکۆچەری دەژیان تەنیا بەرەی (میکائیلی) نەبێت کژی زستانیان لەناوچەی (کفری) دەبردە سەر کەدەکەوێتە لێواری چـەپی رووباری سیروان لەبانی خیلآنەوە بگرە لەسەرەوەوە تا قزلربـات لـە خـوارەوە لـە کژی بەهار بەناوچەی شارەزووردا تێپەر دەبوون کەدەچوونە هاوینە هەوارەکانیان لەنێو ئیران لەرۆژئاوای سنە و سەقز ئەو هـۆزە جـەنگاوەرو ئـازان بەبـەخێوکردنی ئەسپ ناودارن- هۆزی جاف یەکێکە لە هۆزە هـەرە گـەورەکانی میللـەتی کـورد- لەهەمووشـیان زێـتر پـەرت و بـلاوە لەســـەردەمی ئیمـارەتی ئـەردەلان وپێشـتر لەناوچەی (جوانرو) (جوان روود) بەفارسـی کـوردی گـاوان روود رووبـاری گاوانـان بوون لەناوچەی حوکمی ئەردەلانیەکان، پاشان نـاکۆکی لـەنێوانیاندا پـەیدا دەبـیٚ سـەرۆکی جافـان دەکـوژریٚ و زۆریـان ناوچـەی بـاوك و باپیرانیـان (ارض اسـلافهم جوانرو)[١٣٣] بەجیٚ دەهێلن ئەوانەی مانەوە پیٚیان ووترا (جافی جوانرۆیـی) (جـافی گـاوان- رودی) لقەکانیشـی ئەمانـەن ١- ولـد بـــەگی ٢- قوبـادی ٣- باباجـانی کەبەئاشکرا پەیوەندی لەنێوان جاف و رووبارو ناوچەی گـاوانن دیـارە لـەدەم ئـەم رووبارە دوورو درێژە وەك لەلێواری دجلە گاوگامێشیان بەخێو کردووە وەك خـۆی باباجان هەست دەکەیت لەباباگان باباگـاو (گـاوان) هـاتووە هـەر ووشـەی جابانـە

١٣٣ هەمان سەرچاوە (ناوچەی گل ئێستا پێی دەڵێن قادر کرم) ٣العشائر الکوردیة فؤاد حمە خورشد ص٨٠. ،جاوان القبیلە الکوردیە المنسیە ومشاهیر الجـاوانیین د. مصگفـی جـواد، ص٣٩.گلعنـبر- ناحیەی خورماڵە.

پاش و پێش کراوە جابابان یان جابان بووەتە باباجان، ووشەکەش دیارە لە (بانی جابان) ەوە هاتووە یان + جابان، باباجان بەهەر حاڵ ئەوە گرینگ نیە لەوە گرینگ تر ووشەی (جوانرو) بوو کە جاف خەڵکی رووباری (گاوان) بە مانای گاوانی دێت کە رەسەنترە یان کۆنترە لەجاف (جاو) جاوانی کە کورتکراوە شێونیدراو سواوە لەسەر زمان بەدرێژایی رۆژگار مانای سەرەکی و رەگی رەسەنی لەبیرکراوە. هاتنیان بۆ شارەوزور و پەرینەوەیان بۆ لێواری رۆژئاوای رووباری سیروان، لەسەردەمی ئەحمەدی پاشای بابان بووە. ئەویش ظاهربەك بەخۆیو سەد رەشمال پاشان خۆیو ٣٩ کەسیان دەکوژری بەناوی ئەوەی چەتەگەریان کردبی دواتر رۆن دەبیتەوە وانە بووە بۆیی پاشای بابان ریگا بەجافەکان دەدا بپەرنەوە و زۆر بن تا ئەو بەشە ناونراوە (جافی مرادی).

بەلام ڤاسیلەڤا[١٣٤] دەڵێ: جاف مورادی و جاف جوانرۆیی یان جاف ئێرانی و جاف عوسمانلی (تورکی). جاف مورادی. ٣١ تیرەی هەبووە لەوانە: ١. رۆخزادی ٢. گەلالی ٣. تەرخانی ٤. شاتری ٥. هاروونی ٦. کەمالی ٧. عەمەلەیی ٨. پۆشتماڵی ٩. بۆداکی ١٠. ساگانی ١١. (میکایلی) ١٢. اسماعیل عەزیزی ١٣. سۆفی وەند ١٤. نەورۆڵی ١٥. شوان ١٦. شێخ بزێنی ١٧. تالانی (جافە رەشکە) ١٨. گەواری ١٩. بێسەری ٢٠. کامیلی ٢١. بارخی ٢٢. چۆجانی ٢٣. حەسەنی ٢٤. رەشبۆریی ٢٥. باشەکی ٢٦. مورادی ٢٧. بۆسوجانی ٢٨. یەزدانبەخشی ٢٩. یاروەیسی ٣٠. عیسایی ٣١. شەرەف بەیانی... جاف جوانرۆیش لە ١٦ تیرە پێك دێت:

١. قوبادی ٢. پاوە ٣. جانی ٤. وەلد بەگی ٥. ئیناخی ٦. ئیمامی ٧. داختۆیی ٨. تایشە ٩. تاوەگۆزی ١٠. کەلاش ١١. نامداربەگی

(١٣٤) ی. نی. ڤاسیلیەڤا، کوردستانی خوارووی رۆژهەلات لە سەدەی ١٧ تا سەرتای سەدەی ١٩، ل١٧٢، و. لە روسیەوە د. رەشاد میران.

١٢. قادر مـێر وەیـس ١٣. میربـەگی ١٤. دەڵـە تـاس ١٥. دەواشـی
١٦. نێرزی. (١٧ - زەردۆی).

وە زۆر تـیرەو هـۆزی تریـش کـە کـاتی خـۆی سـەبەم هـۆزە بوونـە ئێسـتا سەربەخۆن.

## ئەمەش بەشەکانی هۆزی جافە کەلە کتێبی العشائر الکوردیە د. فوئاد حمە خورشید هاتووە:

١. میکائیلی: دوو لقی هەیە:

١- شوانکارە(١٣٥)

٢- رەشو بوری

دیارە (پیر میکائیلی) بەمانای (شیخ میکـائیلی) دێـت (پـیر بـەمانای شـیخ دێت لـە کوردیـدا) کەشـێخی تەریقـەت بـووە خـاوەنی تەکیـە و دیوەخـان و مریـد لەدەربـەندو (حلـوان) و (پـاوە) میکـائیلی بـەمانای لەسـەر تەریقـەتی شـیخ (میکائیل)ن نەك لە نەوەی ئـەون وەك هـەموو تەریقەتـەکانی تـری شـێخایەتی لـە کوردەواریدا.

* لقی حەمە عەلی وەیس و عەلی بەگشتی و چەند لقێکی دیکە. ئەمانە تەنیا نەدەهاتنە ناوچەی کفری بـەڵکو لەشـارەزوور و ناوچـەی (گـل)[١٣٦] پـەرت دەبـوون بەرەو خوارەوە لەکۆی بـەهاراندا ئـەو بەشـەی پـێی دەڵێـن (پـیر میکـائیل) pir mikail[١٣٧] کە دیارە دەگەڕێنەوە سەر ئەو شێخ میکائیلەی کەبەشێخ ئەل جبال ناو دار بووە کە شـێخی(دەربـەند) هـێرەوەی (حلـوان) و (پـاوە)و چیاکانـە- لـەلا

(١٣٥) شوانکارە لەسەردەمی ساسانیان حوکمیان لەدەست بووە لەگەڵ گاوانانییـەکان کـە لەسـەردەمی ساسـانایان باسـی لێوە دەکەین.

١٣٦ ناوچەی گل و ئێستای پێ دەلێن قادر کرم.

١٣٧ فؤاد حمە خورشید العشائر الکردیە ص٨٠

پەرەی (٣٩) کتێبیی جاوان القبیله الکردیه باسی دەکات.[١٣٨] حکومەتی عوسمانی ڕێگای بەهۆزی جاف دابوو هاوینان بچنە نزیك پێنجوین و زستانان بینەوە گەرمیان لەشارەزووریش لەناوچەی (گلعنبر)[١٣٩] و (خورمال) لەکژی بەهاران و پایزاندا. ئەمە شوێنی جافەکانی ئیمرۆی کوردستانی عیراق، ئەوەی شایانی باسە کە پێشتر لەناوچەی شارەزوور ئەم هۆز و بەرەبابانەش دەژیان وەك ، جەلالی (گەلالی)، شیخ ئیسماعیل، بیسەری، جوجانی، قوبلای، اسماعیل عزیزی، شینکی، کافروشی، بلباسی، کلهور تیلەکو ، گەلباخی ، مەنمی بەلأم بەهۆی شەروناکۆکی و کرین و فرۆشتن ناوچەکەگۆڕانکاری بەسەرداهاتووە، لەوانیش مرادیەکانی بەگزادەی جاف بوونە خاوەنی زۆربەی ناوچەکان.

٢. بەشی دووەمی ئەم هۆزە گەلالی (جەلالی)یە کەلەبەشی پشدەر و شاربازێر پێك دێت وە هەندێکیان لەناوچەی کفری جێنشین.
٣. روغزایی: کەلەچەند لقێك پێك دێت روغزاییەکان لەزستانان دەهاتنە کفری زۆریشیان لەسەر قەلاو باوەنور جێنشین بوون کە ئەو بەشە حەزیان لەنیشتەجێ بوون هەیە. نەك کۆچەری. شوێنی رەسەنی ئەم لقەی هۆزی جاف یا گاوانی ناوچەی (بلە بیزان) beleh bizan لەناوچەی جوانرو (گاوان رود)لە کوردستانی ڕۆژهەلأت جێنشینن.
٤. هارونی: لەچەند بەرەبابێك پێك دێت ناوچەی ڕەسەنیان (هارون ئاباد) بووە بەشێکیشیان جوانرو و گاوان رود هەروەکو دیارە و لد بەگی و باداخیەکان سەر بەم بەشەن.

---

١٣٨ جاوان القبیلة الکردیة المنسیة و مشاهیر الجوانین دکتور مصطفی جواد ص٣٩

١٣٩ گلعنبر – ناحیەی خورماله

٥. شاتری: لەمیروەیسی چەند بەرەبابێك پێك دێت، زستانان لە کفری و نێوان شیروانە سەید خەلیل و باوەنور دەبێ.

٦. ترخانی: لەرەسەندا خەلکی (بلە بێسانی)ن دەگەرێنەوە سەر روغزاییەکان

٧. یەزدان بەخشی: ئەم بەشە وازی هێناوە لە کۆچەری.

لە کۆچەری لەناوچەی شمیران دادەنیشن

٨. نورولی: ئەم بەشە لەشاریار دادەنیشن

هەروەها چەند بەشێکی بچوکیش هەیە سەر بەهۆزی (جاف)ە وەك

٩. باشکی زستان هەواریان باش قەلابووە لەکفری

١٠. تیلە کو Tileh kull زستان هواریان باشکییە

١١. سادانی زستان هەوار یان لەکانی چەقەلە

١٢. ئاناله: لەتایفەکانی بەگزادەن

١٣. تاوەکو گوزی لەناو گوز دادەنیشن لەئێران

١٤. باداخی

١٥. یاروسیی

١٦. شیخ ئیسماعیل لەشارەزوور دادەنیشن

١٧. عیسایی

١٨. سوفی وەند لە کفری دادەنیشن

١٩. باسیری لەبابانەکانی بوونەتە تایفی جافەکان

٢٠. ئیسماعیل عزیری پەرت و بلاون لەهەموو شوێنێك[١٤٠]

١٤٠وەك سەرچنار، بازیان، قەلاسیوکە ص١٨٨ العشائر الكردية.

٢١. پشت ماڵە: کاتی خۆی لەگەڵ شیخ مەحمود پاشا بووە.

شێوەی زمان و فونەتێکی ئاخاوتنی هۆزی جاف یەك جۆر نیە هەیە لەجیاتی (بارام) دەڵێ (وارام) وەك چۆن لە هۆزی گاوانی مێژووی (وارمی) بەرەبابێك بوون یان لەسەردەمی ساسانیان دەیان ووت (ورارام) بەهەر حاڵ بەشێوەی جیاجیای کوردی سۆرانی لەیەك هۆزدا قسە لەگەڵ یەك دەکەن هەموویان لەیەك دەگەن. لەم کورتە باسەدا لەسە هۆزی پاشماوەی گاوانی گوتی کە هۆزی گاڤانی گاف (جاف) یان پێ دەلێن بۆمان ڕوون دەبێتەوە سەرەرای جێنیشبونیان لەهەمان شوێنی مێژووی هەمان ناویان هەلگرتووە، سەرەرای ئەوەی کەوا هۆزی شبانکارەشیان لەلالقێکە لەلقەکانی. هەر ئەم هۆزەش کە ئێستا گەورەترین هۆزی کوردە.. گرینگی مێژوویی پێوە دیارە وەك باسمان کرد مێژوو نووسان گوتی بە بنەماو ئەساسی گەلی کورد دادەنێن، کە کونترین جێنشینی ناوچەکەنە کە کاتی خۆی ناوی لە قورئانی پیرۆزیش هاتوو... کە سەفینەی نوح لەسەر چیاکانی (جودی) گوتی جێگیرە دەبێ. بەهەمان شێوەش لەلای سۆمەریەکان ناسراو بوون لە هونەرەکانیان تۆماریان کردووە بەمە ئێمە گرینگترین شت لەلامان ئەوەیە پاشماوەی گوتیەکانمان دۆزیەوە لەگەڵ سمبۆلەکانی کاوەو و ئەژدیهاك. بەمەش بەرپەرچی هەموو ئەو کەسانە دەدەینەوە کەدەلێن کورد شەپۆلێکی تازەن ئێمەش پێ یان ئەلێین لە سۆمەریەکانیش کۆنترن کە کوردن و بەلکو کاریگەریان لەسەر شارستانیەتی سۆمەریش هەبووە وەك بۆمان ڕوون بوەتەوە لەم لێکۆلینەوەیەدا تەنانەت وەك د. سبایزەر دەڵێ گوتیەکان پێش سۆمەریەکانیش لەناوچەی بین النهرین دا دەژیان، واتا پێنج هەزار

ساڵیش زیاتر بەر لەئێستا دوبارە دەلێم بەم لێکۆلینەوەیە ئێمە هۆزی گاوە (جاف) گاو دەدۆزینەوە لەهەمان کاتدا پاشماوەی هۆزی گوتی و پەیوەندی لەگەڵ سۆمەریەکان و وێنە ئارکولوجیەکان و مانایەکی تازە و خوێندنەوەیەکی زانستیانەی چیرۆك و سەربردەی گاویەکان کەکاتی خۆی ئاینێك بووە و سەرچاوەی ئاینی دیکە بە ناوی ئاینی جاڤ (جاڤی) وە لە ڤاندیدات ئاماژەمان پێکردووە بە ناوی ئاینی جاڤ (جاڤی)وە.

**<u>تێبینی</u>:**

١. پیتی (ب) (و) لەشێوە زمانەکانی کوریدا زۆر جاران جێگۆرکێ دەکات وەك (وەقورحان) (بەقورحان) لەشێوەیەك بۆ شێوەیەك یان لەلای جافەکان (وانێك، هەرامە، چیەژی) بەکاردێ بەڵگەی زۆر شێوەییە لەنێو هۆزێکدا کە فیدراسیایە[١٤١]. لەسەردەمی ساسانیان (وەزورگ فەرماذدار) ئێستا بووەتە (بزرگ فەرماندار)[١٤٢] ص ٢٤١ تاریخ ایران پیرنیاو اقبال هەر بەم شێوەیەش لە وارام و بارام پیتی (و) (ب) جێگۆرکێ کردووە[١٤٣].

٢. ی. ئی. ڤاسیلیەڤا لە لا ١٩٣ی کتێبەکەی کوردستانی خوارووی ڕۆژهەلات لە وەرگێڕانی د. رەشاد میران دەڵێ: (جوانرود لە جاڤانرود(زێی جافان) هاتووە بەڵگەی کۆنیەتی ئەم خێلەیە لە ناوچەکەدا لەگەڵ رەسەنایەتی).

ئەم هۆزە کە لەسەرەوە باسمان کرد ئێستاش تایبەتمەندییەکی دیاری هەیە لەنێو هەموو هۆزەکانی کوردستان چ بەهۆی ژمارە زۆری یان جموجۆڵی هۆزایەتی و یەکدی گری کە بەبەڵگەی ڕەسەنایەتی و قوڵی مێژووی دادەنێم. لەم دواییەش

١٤١ جاف و عەشیرەتی میکائیلی تاهیر سوسەیی.

١٤٢ تأريخ ایران حسن پیر نیاو عباس اقبال، ص٢٤١.

١٤٣ بروانە جاوان القبيلة الكوردية المنسية د. مصطفى جواد.

کتێبێك دەرچوو کە باسمان کرد بە ناونیشانی (تاریخی جاف) لە نووسینی کەریم بەگی جاف، لە لێکۆڵینەوەی د. حسن جاف، لەم کتێبەدا رای مەلا جەمیل رۆژبەیانی لە لاپەرە ٢١ لە هەموو راکان پەسەندتر بوو لە لام بەڵام دەرفەت نەبوو لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین چونکە ئێمە لەم باسەدا مەبەستمان مێژووی کوردە بە گشتی و سەروچاوەی جەژنی نەورۆز و رووداوی کاوە.



دروشمێکی ئێزدییان - لالش ١٣

# ناوو ئاین و شوێنی عەرەب پێش ئیسلام و پێش هاتنیان بۆ خوارووی عێراق

بۆ ئەوەی هەندێ زانیاری دەربارەی دانیشتوانی ئێستای خوارووی ئێراق بزانین كە عەربن لە تەوراتدا بە مانای (الاعراب) هاتووە بە مانای خەڵكی (بادیە)[١٤٤]. بیابانی و شوێنی كۆچەرەكان شوێنی رەسەنی عەرەب و سەرهەڵدانیان نیوە دورگەی عەرەبی بوو، سەنتەری سەرەكیان یەمەنی خواروو بووە، كە عەرەبی یەعاربەن بەلای حیجازەوە عەرەبی (مستعربن)، كەواتە هەر خوارووی نیوە دوورگەی عەرەبی شوێنی دروستبوون و گەشەكردنیانە كە وەك ئاشكرایە بەرامبەر بە ئەفریقییەكانی دەریای سوریان لەنێواندایە. عەرەبەكانی بۆ یەكەم جار لە مێژوودا بەهۆی ئاینی ئیسلامەوە توانیان دەسەڵاتیان سنووری نێوە دوورگەی عەرەبی بەجێ بهێڵی و ولاتانی دەوروپشتیان داگیر بكەن. تا لەسەردەمی ئەیوبیانی كوردیش تەنیا بە نیوەی دوورگەی عەرەبیان دەگوت (عەرەبستان).

جورجی زێدان لەسەر هەمان رایە كە شوێنی عەرەبەكان نیوە دوورگەی عەرەبی بووە[١٤٥].ووشەی عەرەب لەلای ئەو بەمانای (بدو) بادیە—دێت پاشان دەڵێ خەڵكی ناوچەی (بین النهرین) بە عەرەبیان دەگوت (عمور) بەمانای خەڵكی رۆژئاوای رووباری (فورات) بۆیێ (عەریبی) (عەرەب) بە زمانی سامی رەسەن بە مانای رۆژئاواییەكان دێت[١٤٦]. هەر بۆیەش (حیرە) كە دەكەوێتە رۆژئاوای فورات

---

(١٤٤) دكتور جواد علي، تاريخ العرب قبل الاسلام، ج١، ص٢٦٢.

(١٤٥) جورجي زيدان، العرب قبل الاسلام، ص٣٩، دار الهلال.

(١٤٦) هەمان سەرچاوە، ل٤٣.

بە زمانی ئارامی بەمانای شوێنی چادری کۆچەران دێت[١٤٧]. کە هەندێ جار کۆچەر عەرەبی لێی جێنشین دەبوون.

ئەم شوێنە هەمان شوێنی نزیك کەربەلا و نەجەف ئێستایە. ووشەی (عربان) ئوربان نزیکە لە (ئاریان) ئارەبان بە کوردیەکەی بەمانای شوێن بیابان یان (بیابانی). وەك لە (ئوربان) وە هاتبێ وایە. (بە گوێرەی ناوی (عمورو) خەڵکی (بین النهرین) عەرەبی نەبوون بە واتایەکی دیکە خەڵکی رۆژهەلاتی فورات عەرەبی لێ نەبووە یان عەرەب نەبوینە) بابلییەکان سامی بوون ولاتی سۆمەرییان بۆ ماوەیك داگیرکرد کە سۆمەریەکان بەرەگەز هێندی ئەورویی بوون[١٤٨]. بەلام بابلییەکان عەرەب بنەبوون.

پاشان دەڵێ: کە بابلییەکان هاتن لەسەر شارستانییەتی سۆمەرییەکان ژیان ولاسایی ئەوانیان کردووە، وەك چۆن عەرەبە موسڵمانەکان بەهەمان شێوە سوودیان لە شارستانیەتی فارس وەرگرت لە (دەوڵەتی ساسانی) منیش دەڵێم وەك چۆن موسڵمانەکان لە سلمان فارسی فێرە (خندق) بوون کە لە (کەندەك) کەندۆکە هاتووە. کە مەبەستی ئارییەکان و دەوڵەتی ساسانییە سەلمان فارسی زۆر سوودی دیکەش.

پاشان دەڵێ پیتەکانی نووسینی (فهلەوی) وکلدانی یان بەجێ هێلاو پیتی (نبطی) یان بەکارهێنا، بۆ نووسین کە پاشتر ووردە ووردە بووە خەتێکی تایبەتمەندی عەرەبی و خەتی جیهانی موسڵمانان وەك بەهەمان جۆر حامورابی بەم جۆرە رەفتاری لەگەڵ نووسین و شارستانییەتی سۆمەری کرد زۆر شتی لێ وەرگرت وەك لاسایی.

---

(١٤٧) تاریخ ایران، حسین بیرنیا وعباس اقبال.

(١٤٨) جورجی زیدان، هەمان سەرچاوە، ل٥٨.

و یاساکانی ئەوانی لە بەردێکی رەش نووسیەوە بە هەندێ دەسکاری زێدەکاری کۆمەڵگای ئەوکاتە سێ چین بوون:

١. چینی سەربەست وئازاد.
٢. چینی کۆیلە (عبد)
٣. چینی ناوەنجی. بابلییەکان تەنیا رێگایان بە کۆیلەکانی کۆشکی پاشادەدا کەوا کیژێ خانەدانەکان بخوازی (وەك چۆن کۆدیا گوتی زاوای مەلیکی سۆمەرییەکان بوو)، بەرای من دیارە لەو گووتییە کۆیلانە بووە.

(تەبەنی) کردن و منداڵی خەڵکی کردن بە منداڵی رەسمی لە نێو بابلیان باو بوو لە کاتی ژنەکەیان منداڵی نەبوایە. عەرەبەکانیش ئەمەیان دەکرد تا موسڵمانەتی ئەمەی نەهێشت عەرەبەکان کچیان بە زیندویی لەژێر گڵ دەنا نەوەك گەورەبێت لە جەنگدا بیکەنە کویلە وجارییە. بۆیێ لەکاتی جەنگدا ئافرەت یەکێك بوو لەدەسکەوتەکانیان دەفرۆشرا.

عەرەبەکان لە (جەزیرە)[١٤٩]ی عەرەبی پێش ئیسلام (بوت) پەرست بوون ئەم بوتانەیان دەپەرست.

١- (وە ثن) وە ثە ن کە بۆیی پێیان دەگوتن وەثەني.
٢- الصلم (صلمن) کە دیارە لە صلات و کرنۆش بردن ناوەکە نزیکە لە زیو دروست کرابوو.
٣- عز
٤- اللات
٥- المناه

(١٤٩) دکتور جواد علی، تاریخ العرب قبل الاسلام، ل٧٢، ج٣.

٦- هبل که له هەموویان گرینگتر بووه له نێو کەعبەدا لە سەرووی هەموو بتەکانیان دانابوو. گەهـ + بەهـ = شوێنی پیرۆز بە فارسی کوردی.

٧- یعوق

٨- رضی

٩- (منــاف) زۆر ناویــان بــەناو دەکــرد یــان دەڵێــن ئــەم بوتــە ناوی(عبدمناف)بووه[١٥٠].

١٠- ذو الخصلة

١١- ذو الكفين دوو ناوپەلی یان خاوەنی دوودەست بوو.

١٢- ذو الثرى

١٣- الاقيصر

١٤- الفلس سەری کەپووی سوور بووه (شمس) و زۆر بووتی دیکەش[١٥١].

ئێمە بە خێرایی ئەم چەند دێرەمان خستە بەرچاوی خوێنەری ئازیز لە ئاینی عەرەبی پێش ئیسلام بگات چونکە شارەزای عەرەبی دوای ئیسلامە کە عەرەب بەهۆی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە لە فرەخواوەندیەتی کۆیلایەتی (بەندایەتی) مرۆڤ بۆ مرۆڤ کە لەژێر کاریگەری بیرۆگەی کۆیلایەتی بابلی و سۆمەری و ئەکەدی دابوو رزگاری بوو، بڕوای بەتاك پەرستی هێنا کە رێگادرا نەك بۆ بوتو سەنەم مەلیك و ناوە پرترسەکانی میتافیزیکی.

ئەم بوتانە دوای هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەمووی شکێندران و لە (کەعبە) لابردران تەنیا بەردی رەش (حجر الاسود) نەبێ کە تەنیا بەردێکی رەشی پیرۆز بوو هیچ نەخشێکی لەسەر دروست نەکرابوو. هەر لەشوێن خۆی

(١٥٠) دکتور جواد علی، تاریخ العرب قبل الاسلام، ل٢٦٩، ج٦.

(١٥١) هەمان سەرچاوە، ل٢٦٢، ل٢٦٨، ل٢٧٤ هتد.

مایەوە بە پیرۆزی وەك هەموو هۆزەكانی عەرەب دەیان ویست خزمەتی بكەن.

ناوی عەرەبی هەمان ناوە لە پێش ئیسلام كە لەدوای هاتنی ئیسلامەتیش مندالّەكانی خۆیان پێ بەناو دەكرد وەك عبدالله محمد عبدالمناف عبدالعزيز حمزة عثمان علي، عبدالمطلب. ناوی هەموو یارانی پێغەمبەر كە پێشتر موسلّمان نەبوون پاشان بوون بە موسلّمان بۆ زێدە زانیاری بڕوانە (مێژووی عەرەبی پێش ئیسلام هەر شەش جلدی لە نووسینی دكتۆر جواد عەلی ناوەكانیان لەپێش ئیسلام). هیچ كەسێكیان ناوی خۆیان نەگۆڕی لەگەڵ سەردەمی نوێدا بگونجێ تەنیا ناوی هەندێكیان نەبێت لەوانە عبداللات كە كردیانە عبدالله بەلاّم ئاینی خۆیان لە بوت پەرستییەوە گۆڕی بۆن بە موسلّمان.

### جەژنەكیانیان

لەو جەژنانەی كە دیاربوون و زانراوو بوو لە لای عەرەب جەژنی قوربانی بوو كە لە حەزرەتی ئیبراهیمەوە بۆیان مابۆوە كە قوربانییان سەردەبڕی.



شكل (٣٤)

الرمز السومري لاله القمر (نانا، ننار) القرن ٢٢ ق.م

### مانگ و ئەستێرەی سۆمەری و كاریگەری لەسەر فەلسەفەكانی دوای خۆی

## ( ئەفسانەی ئەژدیهاك وكاوەو ) كودیا

## چۆن گاوەو گودیا یەك كەسن

**كاوە - گودیا حاكمێكی گوتی وولاتی سۆمەریەكان بوو یان حاكمێكی سۆمەری سەر بە گوتیەكان بوو.**

**گاوە: بەكوردی مانای وەكو گا. گودیا بەسۆمەری مانای گا یان گایی**

گوت - گاو-گا، گودgod جود - جاف - جابان - گافان - گاوە دەخەینە بەرباس و لێكۆلینەوە وەك لە پێشووتریشدا باسمان كردووە گاو: بەهیندی و فارسی بەمانای گا. گود، غود، بەسۆمەری بەمانای گا دێت.

هەموو كوردێك چیرۆكی كاوە دەزانێ ئەژدیهاكی كوشت، چونكە دوومارى لەسەر شان بوو یان ئەژدیهای سێسەربوو، رۆژێ مێشكی دوو گەنجیان دەرخوارد دەدا كەواتە گەنجانی میللەتی دەكوشت ودەخوارد، كورەكانی كاوەش سەر دەبڕان لەگەڵ گەنجانی دیكە .. كاوە شۆڕشی كرد گەنجەكانی رزگاربووی نێو ئەوانە زۆر بوون یارمەتی كاوەیان دا- كاوە ومیللەت كە لەخوێن رشتن رزگاریان بوو، كاوە خۆی نەكردە مەلیك بەلكو وەك دەلێن تەختی دایە دەست فەریدوون جەژنی نەورۆز و (درەفشی كاویان) ئالای هەزاران ساڵەی ئاریان لەوە پەیدا بووە .

ئێمە دەزانین ئەم چیرۆكەیە بەشێكی ئەفسانەیە وبەشێكی راستیتێدایە بەدوایدا گەراین لەهەر ووشەیەك نزیك بێت لە(كاوانی) - جاوانی-لەسەردەمە جیاجیاكان لەپاشماوەكانیەوە دەسمان پێكرد بەرەو قولایی كە گەیشتمە سەروچاوەكەی كەنزیكەی ٤٢٠٠ چوارهەزار ودووسەد ساڵ بەر لەئێستا لەسەردەمی سۆمەریەكان دووبارە لەسەرەوە بۆ خوارەوە لە خوارەوە بۆ سەرەوەم لەیەكتر بەستەوە تاراستیەكان سەرەداویان كەوتە دەست:

١. زانیمان ئەژدیهاك ناو نیە بەهەر درندەیەكی مرۆڤ خۆر دەگوترێ. ئەژدیهاك ،حەزیا، دیوودرنج. بەمرۆڤی زۆر گەورە دەوترێ دەڵێی ئەژدیهایە. كەواتە مرۆڤی ئاسایی نیە.

٢. زانیمان كاوە، ناوی كەسێك نییە بەڵكو ناوی هۆزە لەقەبە وەك كیسرا، فرعون، قەیسەر،بۆ نموونە كەباسی ئەسحابەی پێغەمبەر ئیبن جابان الكردی دەكا ناوەكە دیار نییە هۆزو لەقەبەكە بەباوك و ناودانراوە بۆ نموونە كە لە سەردەمی شەری ئیسلام و ساسانی باسی یەكێ لەسەركردە سەربازیەكانی گاوانی دەكا دەڵێ ((جابان عظیم العجم)) (گاوان گەورەی عەجەمان) كەواتە ئێمە دەبێ لەم گرێ یە رزگارمان بێت كاوە بەناوێكی رووت وەرگرین ناوە مێژوویی هەرسەركردەیەك بەهۆزەكەی یان میللەتەكەی وەنووسێ وون نابێ بۆ مێژوو (كاوە)گاوەی بۆتۆماركردووین بۆ نەمری بەردەوامی نەوەكەی شانازی پێوە كردووە ناوی خۆی لێناوە. وەك هەموو سەركردەیەكی نەمر بەلاَم راستی چۆن دەدۆزرێتەوە ئەوا هەر بەلەقەبەكەی. چونكە لەقەبەكەی ناوی هۆزو میللەتەكەیە دەمینێ نەمرە. كە لەگاوتی- گوتی و گاودی و گودیاییەوە هاتوە. وەك چۆن دەڵێی شێروانی یان لەسەردەمی زەردەشتا پورشا سپ (پور+شا+ئەسپ) هاتبوو. كە لە (ئەسپ)ەوە هاتبوو.. بەسەردەمی سمبولەكەی ئەوكاتە كە جیایە لەگەڵ سمبولی (گا) و سەردەمەكەی كە سەردەمی گاوەو گوتیانە.

(سەردەمی كاوە سەردەمی گایە كە ئەسپیان نەبوو بۆ سواربوون سەردەمی زەردەشت سەردەمی ئەسپ بوو كە لەمیدیەكانەوە بۆیان مابوەوە بۆ سواربوون و هێرش بردن لە جەنگدا).كەواتە كاوە لەسەردەمی پیرۆزی گاوە سەرهەڵدەدا. بۆ بەڵگەی ئەمەش هیچ وێنەی ئەسپێك لە وێنە دروست كراوەكانی سۆمەریان نادۆزیتەوە تا لەسەردەمی گوتیەكانیش بەلاَم وێنەی گاو شێر دەبینی وەلەسەردەمی میدیاو زەردەشت ئەسپ باوبووە بەكارهاتووە وە بۆتە لەقەب وەك

کە باوکی زەردەشت دەڵێن پورشا ئەسپ بووە یان لەسەردەمی ئەو بووە لەگەڵ زۆر ناوی دیکە لە بەشێکی تایبەت.

پاش لێکۆڵینەوە گەیشتینە ئەم ئەنجامە، دەبێ کاتێ بتەوێ چیرۆك و ئەفسانەی کاوە پێش هەزاران ساڵ بدۆزینەوە ١٠٠٪ سەد دەرسەد چیرۆکەکە وەرنەگرین چونکە بەم ماوە درێژە چیرۆکەکە گۆرانکاری دێتە سەر هەندێ لایەنی بۆی هەیە لەبیرکرابێ - یان هەمان ناو بەگۆرانکاری تۆمارکرابێ، دەبێ ئێمە وەك زێرنگر بەهەڵەدا نەچین وەك چۆن زانست بەهۆی خوێن وکرۆمۆسۆمات دایك وباوك دەدۆزێتەوە. ئاوا ئێمە بەخوێنی میللەت کەزمانەکەیەتی دەبێ نەوەکانی سەروترمان واتا باوك باپیرانمان بدۆزینەوە جگە لە بەڵگەکانی ئەنترۆپۆلۆژی وشوێنەواری ومێژوویی واتا سەرچاوەی بەردەست وپێك هاتەی ئەو کاتەی وئێستای میللەتی کوردکەواتە ئەو چیرۆکەی لە٥٠٪ هەتا١٠٠٪ گونجاوترە لەگەڵ چیرۆکی بەردەست ئیستا ئەوا زیاتر دەبێتە رەگ ومەبەستی لێکۆڵینەوە. بە دواگەرانێکی سەرچاوەی مێژوویی زۆر پێ بەپێ لێرەوە بۆ قولای ولەقولای یەوە دووبارە بۆ سەردەم گەیشتینە ئەو وێنەیەی کە لە وێنەکانی (سومر فنونها وحضارتها) کەوتمە لێکۆڵینەوە لە سەر ئەژدیهاك بەشێوەی (مرۆڤێکی سێسەر) یان (مرۆڤێکیدووەمار) لەسەرشان کەواتە گەیشتینە سەرچاوەکە لە نێو ئەم وێنانە لە گوتی گەراین لەنێو سۆمەر پەیوەندی چییە بەم وێنەیەی کەئەفسانەی کاوە وئەژدیهاکە سەردەمی (گوتیە کوردەکان )بوو کەواتە پەیوەندی لەگەڵ کورد پەیدا بوو.. نەك هەر هیندە بەڵکو بووە تورایی مێژووی کورد چونکە گوتیەکان(١٢٥) ساڵ ناوچەی سۆمەریان لەگەڵ ناوچەکانی دیکە داگیر کرد یان رزگارکرد لەدەست ئەکەدی وبابلیەکان -کەسامیبوون- لەنێو دانیشتوانی رەسەن قبول نەدەکران جگە لەمەش هەر گوتیەکان زۆریان بوونە دانیشتوانی ناوچەکە پێشتریش وەك دیل ووەك کارکردە هەرلەوێ دەژیان کەسنووری شوێنی باوك وباپیریان بوو لەتەك چیای زاگرۆس ، بۆیە گەراین کە بەدڵنیاییەوە لەنێو مێژووی کورد لێرە و لەو سەردەمە بەڵگەکان لەتەك یەك کەوتنە دەست، کەئەمەش مانای راستی دەسەلمێنێ چونکە هەربەڵگە و هی سەردەمێك یان ناوچەی جیاجیانین کەواتە

گەیشتینە سەرچاوەی رووداو و سەرەتای شۆڕش و رووداوی کاوە. بە تێکڕایی نەك بەڵگەیەك و دوو بەڵگەی تەنیا.

پێشەکی دەبێ لەبیر نەکەین وەك وتمان -گاوا- گاو-جاو- جاف-جاب (جابان) لەقبی کاوەیە بەمانای(گاوە) بە سۆمەری(گۆد) کە هەموویان ناوی کەسێك نین، بەڵکو ناوی هۆزەکەیە وەك کیسرا، فیرعەون، قەیسەر، ئەیوبی، بارزانی..هتد. ناوەکەش لە هۆزەکەوە وەرگیراوە (گوتی، گودی، جودی، جاو)ەوە هاتووە کە سامییەکان بە گوتییەکانیان گوتووە(جودی) لەبەر نەبوونی پیتی(گ)ی کوردی لە زمانەکەیاندا وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە(و أستوت على الجودى) کە بەمانای چیای(گوتی)یەکان دێ لە سەرووی رۆژهەلاتی سۆمەرییەکان کەواتە لە(گود، گودیا)وە هاتووە، کە نزیکترین ناو مانایە لە(گاوە)وە بە سووککردنی(گ) لەسەر زمان بۆتە(گاو) کاوە کە هێمایە بۆ گاپەرستی یان پاڵەوانی وەك گا(گای خواوەند) شانبەشانی بەڵگەکانی دیکەی هاتووە نەك وەك وتمان بە تەنیا وشەیەکی زمانەوانی و رووت. کە لەو سەردەمی گا سمبولی پیرۆزی و پالەوانی بوو دواتر بووە شێرو بووە ئەسپ بۆیە کە ویستمان بەشەکانی دیکەی چیرۆکی کاوە ناوی کاوە بدۆزینەوە لە نێو سۆمەرییەکاندا چونکە ئێمە لە پاشماوە دۆزینەوەکەی دڵنیابووین کە گاوانییەکانن لە نێوان(بين النهرين) و هەمان شوێنی رووداوەکە، کاتێ زانیمان زوحاك ناوە تەعریبکراوەکەی(ئەژدیهاك) ناوە رەسەنەکەی مەلیکی ناوچەی بابل بووە یان خواوەندی ناوچەی بابل بووە، کە دەبێ کاوەش لە هەمان ناوچە بووبێ کە پایتەخت بووە. هەموو چیرۆکەکانی ئەفسانەی سۆمەر و بابلییەکانمان خستە بەر باس و لێکۆڵینەوە، بەدوای ناوی(کاوە) یان ناوێکی نزیکی ئەو گەڕاین، گەیشتینە ئەو قەناعەتەی ناوی(گۆدیا) بە هەمان مانا نزیکە لە ناوی(کاوە)، (گاودیا)،(گاو+دیا) کە لە گودی، جودی، غودی، کە بەسۆمەری بە مانای گادێ) یان وەکو گا. پاشان بۆمان رۆن

بۆوە(گود،(غود) بەمانای گاو دێت بە کوردی و بە سۆمەری و بە هیندی و بە فارسی گۆدیا دەبێتە گاویا وەك زانیمان گۆدیا لە گودەوە هاتووە. گاو+یا=گاویان-(گاو-گا بە عەرەبی بەمانای الثور دێت) کە سومبولی ئازایی و و گاوانی و بەخواوەند کردن و زاڵبوونە بەسەر گا وەك گلگامش کە لە گل+گامش(گامێش) کە هاتووە کە چۆن بەسەر گایەکان زاڵ دەبوو گەورەترین ئەفسانەی‌ی رۆحی سۆمەرییەکانە کە لە گامێشەوە هاتووە. ئێستاش کورد دەڵێ (کەڵە گامێش). وەك کەڵەشێر - کەڵە پیاو (کەم بژی و کەل بژی) کە (گامێش) ئێستاش بە کوردی پێی دەڵێن گامێش.

چونکە هەر دەمێك و سمبولێکی تایبەتی خۆی هەیە تەنانەت (کاوە)گا بەڵگەیە بۆ گەڕانەوەی ناوەکە بۆ سەردەمی گوتی و سۆمەریەکان کە هەڵە قبوڵ ناکەت سەردەمی پیرۆزی گایە.

٣. ئێمە بەمە نەوەستاوین ئەمەی سەرەوە بەتەنیا نابێتە بەڵگە چونکە تەنیا پێك چوونی ناوە- گەڕاینەوە سەرچیرۆکی (کۆدیا) خۆی. کودیا وەك کاوە مەلیکایەتی هەڵنەبژاردبەڵکو وەك مرۆڤێکی ئایینی یان کۆمەڵایەتی خزمەتی میللەتی هەڵبژارد و لەوکاتەی لەدەست خۆی بوو خۆی بکاتە مەلیك هەروەکو (کاوە) کەواتە ئێمە بەڵگەیەکی روداویشمان کەوتەدەست لەگەڵ ناوەکە گونجا .. کەواتە (گاوە) پەروەردەکردنی گاوگامێش وڕاو کردنیانە. کەپاشتر بووەتە خواوەند لەلای گوتی وسۆمەریەکاندا پاش هەشت سەد ساڵیش ئاشورییەکان هەمان گای دەموچاومرۆڤیان لە لا پیرۆزو بایەخداربوو وەك لە پەیکەرەکانیاندا بە دیار دەکەوێ.

لەبەر ئەوەی گوتی لەقورئانی پیرۆزدا بە(جودی) هاتووە کەواتە ووشەکە(گودیە)لەلای سۆمەریەکان وەهەروەها، گودیا لەگودیاوە هاتووە، کەبەمانای(گا) وگاوانی دێت چونکە بەڕێوبەرو خزمەت کاری خواوەندکە (گاو)

بووە. كەكارێگەری گاپەرستی هیندستانی بەسەرەوە بووە دەبینین پاشای هەخامنشی هەموو ساڵێك لەنەورۆزدا دەچووە (بابل) پەرستگای(بل مردوك) ودەستی دەگرد ئەمە نهێنی مانەوەی پەیوەندیە بەسەرچاوەی نەورۆزەوە لەناوچەی بابل.

٤. ئێمە بەوەندەش نەوەستاوین كەواتە فەریدوون كێیە– وەك ناوێك یان ئەو پاشایەی كەكاوە لەخۆی گەورەتری دانا– دەڵێ(( كودیا باج وخەراجی دەدایە پاشای گوتیەكانی)) كەواتە ئەو مەلیكەی كە حوكمی بۆ بەجێ هێشت لەدوای كوشتنی ئەژدیهاك– لەكوردە گوتیەكان بوو لەقولای هەمان ناوچەی (جوانرود)حوكمی ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەراستیان دەكرد، تا دەگاتە سۆمەرو پایتەختەكەیان لگش بوو.

لێرەدا بەرپەرچی ئەو كەسانە دەدەینەوە كەدەڵێن (فەریدوون) فارس بوو نەخێر ئەگەر هەبووبێ بەم ناوە كە نەماندۆزیەوە لە مێژوودا مەبەستیان تەنیا پاشایانی(گوتی)بووە بەڵێ چونكە پاشایەتی وئیمپراتۆریەت لەناوچەكە لەدەست گوتیەكان وسەركردەكانی بووە فارسەكان لەو سەردەمە هیچ سیمایەكیان دیار نەبووە، لەو سەردەمەدا هیچ بەڵگەیەك لەئارادانییە فەریدوون فارس بێت وسەردەمیش سەردەمی گوتیەكان بووە(٢٢٨٥)پ ز هەتا(٢٠١٦)پ ز كودیاش هی سەردەمی گوتیەكانە بەڵكو باوەری پێكراوی گوتیانوخۆی (كودی) كودیا((گوتی/گوتیا))[١٥٢]. بووە بەواتای كوردبووە باوەرپێكراوی گوتیان بوە. سەركردەیەكی ئێراقی كۆنی كوردیان ناوچەی سۆمەریەكانی بووە سەربەمەلیكەكانی گوتی. بەلام وەك زانیمان ئەژدیهاك زوحاك(زهاك) ناوێكی

---

(١٥٢) سەیری جێگۆركێی (ت)لەگەڵ (د)بكە تا لەزمانی فارسیش وەك كتێبی (خدای نامە) (بە پەهلەوی پێی دەڵێن (خوە تای نامك) لا٢٦٩، تأريخ ايران لە دانانی حسن پیرنیاو عباس اقبال بەهەمان شێوە (گودی) بە(كوتی) هاتووە (زەردەشت) بە (زەرتشت) تۆمار كراوە.

موعـەین وبەرجەسـتە نەبووهـەروەها کـاوە وفـەریدوونیش – نـاوێکی رەمـزی یانـاوێکی خۆشـکراوی سـەرزمانی نـاوێکی کـۆن ولـەبیرکراون کەبـەدرێژایی چوارهەزارودووسەد ساڵ بەم جـۆرە گۆڕاوە چونکە نـاوێکی وامـان بـەم شـێوەیە لـەنێو مێـژوودا بەردەسـت نەکـەوت بـەڵام مەلیکـەکانی گوتـی بەهـەرناوێك بـن مەلیکی(کودیا)(کاوە) بوون– کەئەمەیان گرینگە، سەرەڕای ئـەوەی ئـەم ووشـەیە بە (جود) و بەشێوەی

(گۆتی، گووتی،جـودی،جووتـی–کورتـی) هـەروەها(کارداکـا، کـارداك، کـاردۆخی، کـاردۆك، کردۆخـی، کوردوکـی، کارتایـا،کـاردوی، کـوردی) نـاوی هـاتووە، بـەڕای منیـش قردایـی بـە شـێوەی ئـارامی بە هـەمان شـێوەیە لـە هـەموویان رەوانـتر ئایەتەکەی پیرۆزە کە دەڵێت(و أستوت علی جودی) مەبەستی چیـای گووتیەکانـە کە هەمان گودیای سۆمەری دەپێکێت.

لێرەدا داوا لە خوێنەری بەرێز دەکەم بگەرێتەوە سەر هەموو ئەو بەڵگانـەی لە بەشی (ناوچەی سۆمەر و بابل و شوێنی رووداوی کاوە و ئەژدیـهاك بـووە) هـەر لە پێشـەکی ئـەم کتێبـەدا هـاتووە جگـە لەمـەش بـەم رسـتەیە هـەموو بەڵگـەکان کۆدەکەینەوە کە دەڵـێ کـاوە + ئەژدیـهاك + هۆزەکـەی + شـوێنی رووداوەکـە + بەڵگـە مێژووییـەکان + بەڵگـە شـوێنەوارییەکان + بەڵگـە زمانەوانییـەکان + دەرئەنجامی بەڵگەکان = راستی کـاوە و ئەژدیـهاك بـەدیار دەکـەوێت لـە ناوچـەی سـۆمەر وبـابل و سـەردەمی گوتییـەکان بـەر لـە ٤٢٠٠ سـاڵ کـە لـە هیـچ شـوێن و سەردەمێکیش ئەم هەموو بەڵگانە کۆ نەبوونەتەوە وە کۆ نابنـەوە تـا راسـتی وون بکات یان بیشێوێنێت یان دووبـارەی بکاتـەوە بیکاتـە ئەفسـانەیەکی بـێ شـوێن و سەردەم.

## پەراوێز:

* گاو: (الثور) مێیەکەی پێ دەڵێن ((مـا گـا)) بـەکوردی پێیدەڵێـن(مانگـا). کەواتـە (گاو مانگا)هەردووك دەگرێتەوە.

گاو لەلای سۆمەریەکان سمبولی پاڵەوانی ئازایەتی بووە ناوێکە بەمەلیکەکان گوتـراوە.

ص٣٣ سومر اسطورة وملحمة ، د. فاضل عبد الواحد علي

* بروانە ص٨٣ هاوڕێ باخەوان، کوردستان نیشتمانی یەکەمی سـۆمەریەکانە(گـا–Ga ) (گود) لەسۆمەریدا بەواتای ((گا)) هاتووە (مێ) =لەسۆمەریدا بەواتای (می) هاتووە

کەواتە میگا= مانگا = هەمان هەمان زاراوە کوردیەکەیە هەروەها ئابی=کانی

([١٥٣]) بۆ زێدە زانیاری بڕوانە لاپەڕە(٣٧) کتێبی چیانشـینانی زاگـرۆس لـە نووسـینی/ هورمـزی بێگلەری. و. حەمە سەعید کە بە (جودی)یش هاتووە

هەندێ ووشەی سـۆمەری کە لە البنية الذهنية الحضارية في الشـرق المطوسـطي لـە دانـانی یوسـف الحورانی لا ٩٦ لا ٢٧ وەرم گرتووە کە لەگـەڵ ووشـەی کـوردی بـەراوردم کردۆتـەوە هـاو رەگەزە.

| کوردی | سۆمەری | ووشەکە بە دابەشکراوی لەکوردیدا | بەعەرەبی |
| --- | --- | --- | --- |
| ئاسمان | ئان | ئاسم + ئان | سماء |
| خاك | کی | خا + کی | الارض |
| کۆە | کور | کۆە + ئار وەك کۆڕەك، خوا کوڕك | جبل |
| سەر | ساغ | سە + غ | راس |
| دواندن | دۆغ | دوا + غ | محادثة |
| نان | نندا | نن + دا | خبز |
| خواردن | کو | کوا + ردن | أكل |

(١٥٣) بلاذری – لة فتوح البلدان ص٠٤٢ ص ٧٤٢ ص ٦٥٢ ص ٦٩٢ یان جابان الاعجمی یان بە جابان الکوردی صحابەی پێغەمبەر کە ناوی هاتووە هەمان مانای گاوان و گاوانی لە ووشەی عەجەمـەکان کە مەبەستیان کوردە نەك فارس چونکە نەیان ووتووە جابان الفارسی وەك سـەلمان الفارسی کـە مێژوونووسی کورد دەبێ زۆر ئاگای لەم ووردەکاریانە بێ.

| ناو | ئای | ئا + ی / ئا + و | ماء |
|---|---|---|---|
| دەوەستی | دو | د + وە ستان | وقوف |
| ماسی (ماهی) | ها | ما + ها (هی) | سمك |
| گاو (گا) | (غود) گود. گۆ | گا + و (گاودیا) | الثور |

<u>تێبینی</u>: ووشـەی گوتـی گـودی ئـەم ووشـەیە لـەقورئانی پـیرۆزدا بەشـێوەی (جـودی ) هاتووە کە مەبەست چیای (جودیە ) دەکەوێتە سەرووی ڕۆژهەڵاتی سۆمەریەکان کە ئێستا پێـی دەڵێن زاگرۆس وولاتی مێژوویی گوتیەکانە.




ئەم پەیکەرە کە گای کەلەی سەری لە شێوەی مرۆڤە بە سۆمەری ناوی (گۆ+لۆلۆ) بەمانای گایە لۆلۆ کـەمانای مرۆڤ دەدات ئەم پەیکەرە گۆدیا - گاوە لەلای خۆی داینابوو لەلای پیرۆز بوو بۆیە (گۆدیا) کەبەمانای (گـایی- گاوەیی) دێت مەبەست گاوەیە کە سەر بەو ئاینەبووە ناوەکەشی لەوەوە هاتووە بە هەندێ گۆڕانکاری دەم بەدەم بەم ماوە دورو درێژە لەلای کورد

# پیرۆزی (گاو) یان (گا) لەلای (سۆمەر)یەکان لەسەردەمی گوتیەکاندا

وەك وتمان (گاو) یـان (گـا) سمبـولی پاڵـەوانی و ئازایـەتی بـووە بـە زمـانی ئینگلیزی بە خواوەند دەڵێن گۆد بەمەلیەکەکانی گوتراوە (گاو) بەفارسی و هیندی و بەناوە رەسەنەکەی (گاو) کە سوککراوە (گاو) لەسەر زمانی بەکوردی (گا)ی پێ دەڵێن. لەسەر دەمی سۆمەرو گوتیەکاندا سمبولی ئازایەتی و پاڵـەوانی بـووە. لـەو سەردەمەی هەموو کارەکانیان بە (گاو) دەکرد تاکو بۆ سواربونیش لـە نێـو ئـاو و لەسەر خاك ئەسپ نەبوە لەلایان وەك لەم وێنەیـەدا بـە دیـار دەکـەوێ لەناوچـەی (دیـالی) واتـا دەم روبـاری سـیروان دۆزراوەتـەوە کەدەگەرێتــەوە بـۆ سـەرەتایی هەزاری سیهەمی پ.ز. بروانە ص٣٤٩ سومر فنونها و حضارتـها کە وەك وتومانـە بەزمانی سۆمەری بەشێوەی (گود) (غود) (جود)[١٥٤] هاتووە وەك وتومانە لەبـەر نەبوونی پیتی (گ) لە زمانی عەرەبی و سامی بـە غـود (جـود) نووسـراوەتەوە لـە هەمان ووشەی (گاودی) (گودی) (گوتی)یە بەڵام بەفۆنەتیکی زمانەکانی سامی کە بە (گوتی) شیان بە (جود) تۆمار کردووە – وەك (جبل جودی) کەمەبەست چیای گوتیەکانی کوردە لەسەر سنووری عەرەب و جەزیرەی عـەرەب بـوون، کـە یەکـەم کەسێك بوون لـەکاتی هاتنیـان بـۆ لێـواری فوراتـی خـواروو رووبـەرویان ببنـەوە و ناویان بڵاو و ناسراو بـووە لـەلای سـامی و عەرەبـەکان ئـەوەی لـێرە مەبەسـتمانە ناوی (گاو) پیرۆز بووە وەك ئەم دەقە سۆمەریە کە دەڵێ: (ئەی ئەو مەلیکـەی بـۆ ئەنلیل لەسەر تەخت دانیشت ئەی گەورە ئەی (گاو)ەی بەحائج هاتوو پایـە بلنـد،

(١٥٤) یوسف الحوراني، البنية الذهنية الحضارية في الشرق المتوسط الاسيوي القديم (قائمة بالكلمات السومرية).

ـەی سـەرۆکی خـواروو))[١٥٥] یان سـەیر بکـە شـارێکی وەك (ئـور) بـە (گـاو)
ـەشوبهێنێ کە لەم دەقە سۆمەریە داهاتووە:

**بەڵێ، لەو رۆژانەدا ( وەرگا )**

**بەخۆشیەکی گەورەوە رۆژەکانی دەباتەسەر**

**هەروەها – (ئورا) کەدەلێی (گاو)ەیە سەر بەرەو ئاسمان بڵند دەکات**[١٥٦]

باشـە لـێرەدا دەپرسـین ئەگـەر مەلیکـەکانی سـۆمەر و (ئـور) بـەگاو بشوبهێندری ئەوا بۆ دەبێ ناوی (وەرکا) لە (وارگا)وە نەهاتبێ وار = هەوار + گـاو (گا) شوێنی ئەو گایە پیرۆزە نەبێت؟پرسیارێکە و لەرووداوەکان و تەقس و ئاین و هزری سۆمەریەکان دوورنیە سـەرەرای پێك چوونـی زمـانی کـوردی و سـۆمەری و پێکەوە ژیانی سەدو بیست و پێنج ساڵەی گوتیەکان و مانەوەیان لە (ئاری واکـێ) و ئورو گشت و ناوچەکانی دیکەی هاوپیشە بۆیێ لە وێنەکانی سـەردەمی گوتـی و دواتریـش و پێشـتریش زۆر گرینگیـان داوە بـە گـا بەسـەرکی گـاو بـۆ ئالەتـە موسیقاکانیان زۆرانبازی لەگەڵ (گەلگامش) (کەلەگامێش) بەسەدان پەیکەری گای تێدایە بـەلام پەیکـەری ئەسپی تێدانیـە تەنانـەت ئەگـەر چـی دەلێـن گوتیـەکان ئەسپیان بەخێو دەکرد بەلام کاریگەری دیارنیە دیارە هەر سواری (گا بوینـە) لـەو سەردەمەدا دواتر فێری بـەخێوکردنی ئەسـپ بوینـە لـە میدیـەکانی کـورد چونکـە

(١٥٥) د.فاضل عبدالواحد علی سومر اسطورة و ملحمة ص ٣٣ پەیوەندیەك دەبینرێ لە نێوان (گـاوی) پـیرۆزو پلـەی خواوەندنـی گوتـی وسـومەریەکان وهیندەکـان ووشـەی God. کـە (خ) زۆر جـار جێگۆرکێ دکا دەبێتە (ك) لە زمانەکانی ئاریدا.

(١٥٦) د. فاضل عبدالواحد علی سومر اسطورة و ملحمة ص٣٣، ٧٦، الثور ذات الراس الادمی= تمثل قوی الخیر ضد الشـر – معجـم الاعـلام کتـاب سـومر فنونـها و حضارتـها وەك ئـەوە وایـە God لەوەوە هاتبێ (گاو) گودیان کاریگەری هیندی یان هیند و ئەورووپی دانیشتوانی زاگروس لـە سەر بێ لەوانـە گوتیـەکان کـە بـە (الهـة الثـور) هنـد و دۆزینـەوەی الهـة الثـور لەپەرسـتگای شوشناك سوسە.

گاومانگا – مەلەوانیشە بۆ پەرانەوەی مرۆڤ لەروبارو زەنگاوەكانی خواروی ئێراق وەك باسمانكرد.

١- لەسەردەمی گوتی‌دا لەوولاتی سۆمەر پیستی گایان لەبەر دەكرد، سواری (گا) دەبوون لەجیاتی ئەسپ – كە ئەمە وا دەكا گا هەموو شتێك بێت لەلایان تا خواوەندو گەورەكانی سۆمەر قۆچی گایان دەكردە كلاوێكی جوان و لەسەر یان دەنا وەك جەمەدانیەكی پێچراوی لێ دەهات بەواتە چەندین قۆچ لەسەر یەك بەدەوری سەردا – وەك لەوێنەكاندا دیارە ئەمەش پیرۆزی گادێ كەواتە هەموو دەبێتە بەلگە لەئایینەكانی ئەكەد و بابل یەك ئاین بوینە جیا لەئاینەكانی ئەكەد و بابل چونكە وەك بەدیار دەكەوێ زمانی سۆمەری رەگێكی زمانی كوردی تێدایە كەبەمە دەبێ زمانێكی ئاری بێت كورد لەمە دەگات تەنانەت هەردووكیان رێزیان لە (تاو) (هەتاو) گرتووە كە پیرز بووە لای كوێستانیەكانی زاگروس دواتر بووەتە میترایی پاشان زەردەشتی، هەروەها سەگ یان وێنەی خواوەندی (گا) سەری مرۆڤە لاشەی (گایە) دواتریش سەگ لەلای زەردەشتیان دیارە كاریگەری سومبولی (گا)ی لەسەر بووە كە هاورێی گاوان و شوانە كەسەر بەخواوەندی (گولا) بوو ئێستاش وەك ئەوان كورد بەسەگ دەلێ (گولا گولا)GULA. ص ٣٥٢ سومەر فنونها و حضارتها مەبەستم ووشەی (گولا)یە.

ئەوەشمان لە بیر نەچێت كاریگەری (گا) لەسەر ساسانی و هەخامنشیەكان و (میدیەكانیش) دیارە وەك لەجامی (كلیمو)[١٥٧] جامی كلیمۆ ئەگەرچی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ساسانییان بەلام بەكاریگەری سەردەمی پێشتر و میدییەكانی دەزانم هەروەها رەگی ئاینی گاپەرستی و گا پیرۆزی هیندۆئاری یان هیندۆئەورویی بەدیار دەكەوێ هەروەها ئاشوریەكان و گایە

(١٥٧) ایران درزمان ساسانیان ص ٢٥٣.

باڵدارەکانیان یان وەك بەڵگە لەلاپەرە (٦٢)ی سۆمەر فنونها وحضارتها هاتوە (النصب الاخمينيه من ) (ڤیران جاشمة) کەهەمان گای پالکەوتوی گودیای سەردەمی گوتیەکانی کوردە.

- لەوانەش ئەو ئەفسانەیەی دەڵێ: خاك لەسەر قۆچی گایە گا لەسەر (ماسی)یە لەسەر (ئاوە) ئاو لەسەر هەوایە دونیا لەوکاتە دەلەرزێ کەلەسەر قۆچێکی بۆ قۆچەکەی دیکەی دەگوازێتەوە.

# پەیامبەری ئاشتی و برایەتی ئەمیری سۆمەرو کوردی هاوبەش و ئاینەکەی دژبە ئەژدیهاکی تۆقێنەر و مرۆڤ کوژ

لە نووسینەکانی گودیادا لە پەرستگای (پەنجا) دا بەدیار دەکەوێ کەوا پێشانگایەکی بیرەوەری هەبووە بۆ ئەو جەنگانەی دژی ئەژدهاکان و گیاندارە درندەکانی دیکە بەرپای دەکرد بە واتایەکی دیکە سەری ئەوئەژدیهاکانەی پێشان دەدا کەوا لە جەنگەکانیدا سەری بڕیوە. هەروەها پاڵەوانکارییەکانی خواوەندی ننگرسو، سەرەرای چەکەکانی ننگرسو گودیە ئاماژە بە (بەرانی کێوی حەوت سەر دەدا) هەروەها ئەژدیهای حەوت سەرو (بیزون) و (شێرو)[١٥٨] چەندین گیانداری دیکە کە ناوی تایبەتیان هەیە لە زمانی سۆمەریدا هەریەك لەو پاڵەوانە کێویانە بە ناوی

( ursage بە سۆمەری) ناوبران (لێرەدا گەر سەیری ناوەکە بکەین بە وردی لە (ئاستیاگ)ەوە نزیکە هەروەها لە (ئورسەگ) وەکو بڵێ (سەگی ئور) چونکە ناوی

(١٥٨) نازانم مەبەست چییە ! ! بەلام ووشەکە هەمان ووشەی (شێر)ی کوردییە = الاسد.

(المارد الشرير) (پاڵەوانی شەڕاوی) یان پێ دەگوت (Asag) جگـە لەمانـە باسـی (ننورتا) دەکا کە خواوەندی بـای خـواروە، (ئاسـەگ) لەگـەڵ (kur) زاوزێ دەکـا (kur) بەمانا چیا دێ بە زمانی سۆمەری، مناڵێکیان دەبـێ دەیکەنـە مـەلیك ئـەو مناڵە شارەکان تالان دەکا وا دەکا کەوا (لە چیاکانیش ددانی ئەژدیهاك شین ببێ).

لێرەدا دەبینین سەرەتای هێزی خێرو هێزی شـەڕ پـەیدا دەبـێ وەك ئـاهورامزدا و ئەهریمەن بـەلام بەشـێوەیەکی سـەرەتایی و ئـاینێکی تـازەی ئاریـایی کـورد و لـە کۆتـاییدا خواوەنـد (ننورتـا) بـۆ پارێزگـاری لـە سـۆمەر دژی (Asag) ئاسـەگ دەوەستێ ئەو ئاسەگەی کەوای دەکرد ماسی لەنێو دەریادا بکوڵێنـێ بـە زیندویـی ننورتا دژی هەموو ئەو کەسانەش وەستا کـەوا پشتیوانی (ئاسـەگ) یـان دەکـرد ننورتا بەسەر هەموویاندا زاڵ دەبێ(١٥٩). (هەست دەکەین ناوی (ننورتا) زۆر نزیکە لە ووشەی نەو رۆز وەك بڵێی بە سۆمەری رۆژی ننورتا رۆژی چاندن و نوێبوونـەوە بێت شان بەشانی بەڵگەکانی دیکە یا لەنێویانا، ئەمەش پێویسـتی بـە لێکۆڵینـەوە بەدواداچوون هەیە) ننورنتا نزیکە لە (نەوردا نەودەم – نەوسەردەم).

(بابلییەکانیش باسی خواوەندی خۆیان دەکەن (مـردوخ) کـە گوایـە بەسـەر ئەژدیها و مارو درنـدە وگیانلەبـەرە سـەیرەکانی سـەریان مرۆڤـە لاشـەیان ئاژەڵـە ئەمیش توانی سەرکەوتن وەدەست بێنێ).

ئێمە لێرەدا بەرامبەر چەندین ئەفسانە دەوەستین کە دیارە لە کـاتی خـۆی لە وڵاتی بابل سۆمەردا بە چڕو پڕی هەبووە بـەلام لـە لای کـورد دەم بـەدەم هـەر هێندە لـەیاد مـاوە کـە (کـاوە) ئەژدیـهاکی سـێ سـەری کوشـتووە یـان سـەرێك و دوومار لەسەر شان بە واتای سەرێکی مرۆڤ و دووسەری مار) کە ئەمـەش هـەمان مانا و بۆچوونی گودیا و ئەژدیهاك کوشتن دەگەیەنێ کە زانیمان گودیا بـە مانـای، گا، گاوە، کاوە. دێت لـەلای سـۆمەر و گوتیـان ئەژدیـهاکانیش هـەمان ئەژدیـهاکی

(١٥٩) بڕوانە پەراوێز لە کۆتایی ئەم بەشە.

ئەفسانەیین گاوە و گاویا بەهەمان ناوی لە یەکتر نزیك و یەك ماناکە مرۆڤایەتی رزگار کردووە. کە لە لای کورد ئەژدیهاك بەناوی مرۆڤ تێ دەگەن بەلآم لە راستیدا ئەژدیهاك حەزیای خواوەندی شەڕن سێ سەرە کە سومبولی خواردن و روح دەرکێشان و دوژمنی ژیانە کە مێشکی لاوەکانی دەخوارد یا دەرخواردی مارەکانی یان سەرکەکانی سەرشانی خۆی دەدا کە لە یاسای خواردن هەموو سەرکێکی شەڕانی و مرۆڤ خۆر یەك مانا دەبەخشێ ئەویش ئەژدیهایە) کە گیانلەبەرێکی خاوەن هێزی مرۆڤ خۆرە یان مرۆڤ کوژە چ لەئەفسانەی کاوە یان گودیا کە هەردووکیان هی یەك سەردەمن بەلآم بە هەبوونی گودیا (گا) God خواوەندی سۆمەری گوتی هاوبەشن خاوەنی ئاشتی و نوێژو بیناکاری دارچاندن و نوێی بوونەوە و لەلایەن هەموو لایەنێکەوە لە سۆمەری و گووتی و کەمایەتییەکان لەناوچەکە بە گشتی واتا بە پەیامبەری برایەتی و رزگاری بزانن لە کۆیلایەتی هەر بۆیەش ناوی بەنەمری وەك رزگارکەرێك لەگەڵ هاتنی بەهار مایەوە. جەژنی ننورتا و (نەورۆز) و ژیان کە ئەمەش وای کرد کەوا (گودیا) (گاو)ە بەخواوەند بزانی لە دوای مردنی و پیرۆزی گاو مانگاش لە (بين النهرين) دا بلآو ببێتەوە کە ئاینێکی شەپۆلی هیندییەکانە بە هۆی گوتییەکانەوە گەیشتوەتە سۆمەر. ئەوەشمان لەبیر نەچێت گودیا لە کاتی ژیانیدا خۆی نەکردە مەلیك و باج و خەراجی دەدایە مەلیکی گوتیەکان وەك لە لێکۆڵینەوەکەدا ئاماژەمان پێ کردووە هەمان رەوشی کاوەو هەڵوێستە کە تاکە کەسێکە هەموو سیفەتەکانی کاوەی تێدایە .. جگە لە سمبولەکانی سەردەمەکە،جگە لەمانەی هەمووی وێنەکان ئەو دوو مارەی سەرشانی یەکێ لە خواوەندەکان کە دیارە دەمی کردۆتەوە سەری یەکێك لە (کودیا) یان بخوا کە بەلای من مەبەست یەکێکە لە (گوتیا) کان بە واتای سەری گەنجێك لە گەنجەکانی گوتی (گودیای) گاوەیی کە وەرزیرە لقەدار و داسێکی بە دەستەوە کە مەبەستی مانای لە چینی هەژار و گاوان و وەرزێرە لەسەردەمی

کۆیلەداری کە وێنەکە کە لەبەردەستمانایە هەرچەندی لێی ورد بینەوە زیاتر ڕوون دەبێتەوە، ئەمە مەزەندەی هەندێ کەس پوچەڵ دەکاتەوە کە دەڵێن وێنەی کودیای سەرکردەو ئەمیرە کە بەئاشکرا دیارە دەستگیر کراوە بەندکراوەمێشکی دەرخواردی مارەکە بدرێ یەکێکە لە کورەکانی کاوە یان کودیا سەری خوراوە مارەکەی لای ئەو دەمی کردۆتەوە بەلاّم مارەکەی لای خواوەندی تەکی دەمی داخراوە وەك ئاماژە بەوە بکات ئەمیان دۆستە کەواتە مارەکانیش سەری هەموو کەسێك ناخۆن تەنیا گەنجی کوتیەکان نەبێت ئەمانە هەموو پاڵپشتی بۆچوونەکەمان دەکات بۆ دۆزینەوەی سەروچاوەی کاوەو گاوانی و گاوەیی کودیای کوتیانی ٤٢٠٠ چوارهەزارو سەد ساڵ بەر لە ئێستا لە وڵات ودەوڵەتی گەورەی گوتیەکان بەهۆنەری سۆمەری و گوتی و هاوبەش، کە سەرچاوەکەش ئەژدیهاو(تنین)ی ڕۆژهەلاّتی چین و تبت وهیندستانە وە ئەم وێنانەش پێش گودیە نەبوو یان پێش سەردەمی گوتیەکان لە ناوچەی سۆمەر کەواتە لە سەردەمی گوتیەکان لەناوچەی سۆمەری سەری هەڵداوە بۆیێ بە جەژنی هاوبەشی سۆمەرو گوتی دەزانین وە میتودو ئەفسانە و داهێنانی گوتییە بە لەناوبردنی خواوەندی مار لەسەر شانی ئەکەد و بابل و هەندێ لایەنی خواوەندی مار لەسەر شانی ئەکەد و بابل و هەندێ لایەنی شەڕخوازی لە وڵاتی سۆمەردا. کەولتە جەژنی سەرکەوتنە بەسەر ئەژدیهاك. جەژنی گەنم چاندن و دارو درەختە جەژنی کژی نوێی و دەهۆڵ و زورنا و ئاهەنگ گێڕانە. کە بەهەمان شێوە ئەم ئاهەنگانە لە کوردستان ماوەتەوە کە لەسەربردەی نەورۆز باسمان کردووە بەرامبەر بەمەسەردەمی سۆمەر وگوتیان دەخەینەوە یاد شۆرشی کاوە وەکۆیلەکانە دژ بەمەلیکەکانی خواوەند ومرۆڤ کوژ و ستەمکار.

واتە گاوە گاودیا هێزی ئاشتی و خێرن بۆیێ گودیا مرد بە خواوەندیان لەقەڵەم دا. وەك ڕەمزێك ناوی بەشێوەی کاوە هەرماوە لە نێو کوردان کە

میراتگری سۆمەریەکانن چونکە سۆمەریەکان بون بە گوتی و کاشی و عیلامی کورد.

## پەراوێز و سەرچاوە:

١. دەقی ئەفسانەکەم (دەربارەی گودیا) گودی گاودی گاوە لە کتێبی سومر اسطورة وملحمە وەرگرتووە لە دانانی د. **فاضل** عبدالواحد علی ص١١٦ بەبێ لێدوان.

٢. تێبینی: هەمان بازی درەفشی کاویان کە باڵ کراوەیە لە سەردەمی سۆمەری رۆژگاری گوتیان بەرچاو دەکەوێ بە جیاوازی ئەوەی بازی سۆمەری سەرکی شێرە.

٣. بەرای ئێمە زاراوەی گۆران لە گاوران گاور گایاوەر وە هاتووە لەسەر کێشی دلاوەر، سەروەر، یا گاوەر گاپەروەر، بە هیندی (گبر) کە زەردەشتییەکان بە ئاینی گاپەرستانیان گوتبێ. بە پێی فۆنەتیك و جێگۆرکێی پیتی و ب لە زمانی گۆرانەکیش لەهەمان ناوچەی گووتی وسەرهەڵدانی یان بڵاوکردنەوەی گاپەرستی یان بلاوکردنەوەی گاپەرستی هزری یان سەروچاوەی هیندییە بۆ ئاریا و هیندۆئەوروپی کوردەوە هەیە.

٤. گودیا هەمیشە پەیکەری سێگای لەلا بووە.

٥. مانگ و ئەستێرە لە سۆمەرییەکانەوە تا ئێستا وەك سومبول بۆ ئاین بەکارهاتووە.

٦. لە (سووسە) دیلاڤواو ژنەکەی (Dieulafoy) ١٨٨٤-١٨٨٦ هەندێ پەیکەری گای باڵەوتووی دۆزییەوە کە بۆ هەخامنشییەکان دەگەرێتەوە، کەواتە ئەوانیش کاریگەری (گاو) گا گاوەو گوتییان بەسەرەوە دیارە. ص٦٢ سومر فنونها وحضارتها.

٧. ئەو ئەفسانەیەی دەڵێ: (دونیا لەسەر قۆچی گایە گا لەسەر ماسییە ماسی لەسەر ئاوە ئاو لەسەر هەوایە ) بۆ ئەم سەردەمە دەگەرێتەوە لەنێو کوردان دەڵێن بۆیێ دونیا دەلەرزێ کاتێ گایەکە لە قۆچێك بۆ قۆچەکەی دونیا دەگوازرێتەوە لەکاتی قۆچ شل بوندا. ئەمەش کاریگەری هەمان ئاینی (گای ئاسمانییە) وەك (گۆ) (گۆد) (گۆدیا) (گاوە) (کاوە).

٨. ئێستاش لەنێو دێهاتەکان وکوردەواری قۆچی یان مامز یان کێوی دەسەر دەرگای ماڵەکان دەدرێ بۆ دورخستنەوەی شەڕو چاوو زار.

# ماناو مەدلولی فەلسەفەی (مار) لە سەر شانی ئەژدیهاك و ئەستێرەو فریشتە لە سەر شانی مرۆڤــ

پێشەکی دەبێ ئەوە بزانین کەوا (مارا) بــە زمـانی ئـایینی بوزایـی کـۆن بـە مانای (روحی شەڕ) دێت[١٦٠] انجیل بـوذا ص ٨ طبـع بـیروت ١٩٥٣ ئەژدیـهاك خـۆی مارێکی ژەهراوی گەورەیە لە ئەفسانەی کوردیدا، خۆ ئەگەر هاتوو ئـەم ئەژدیهاکـە سێ سەر بوو ترسناکترە یان ئەژدیها دەسەلاتدرێك دوو مـاری لـە سـەر شـان بێـت ئەم هێزە بە هـێزی خراپـە لـە قەلـەم دەدرێ ئەمـە سـەرەتایی بیرۆکـەی دروسـت بوونی ئەهریمەنە لەلای زەردەشتیانی کورد و جیاکردنەوەی لەگـەڵ هـێزی چاکـەو ڕۆناکی کە ئاهورامزدایە بەڵام فریشتەو پەری و مەلائیکەت لە سەر شانی مرۆڤ بۆ نووسینی چاکەو خراپە تا مرۆڤ لە خراپ دوور بخاتــەوە نزیك ببێتـەوە لـە چاکـە ئـەوا فریشـتەکان نوێنـەری چاکـەن دەســەڵاتی خوایــی لــە ســەر شـانەکان بـە پێچەوانەی دوو ماری سەر شان کە حاکمە دڕندەکان دەیانویست بـە هـۆی ترسـی ئەو مارانە خۆیان (بە سێبەری خوا دابنێن لە سـەر خـاك یـان خـەڵك بترسـێنن بـۆ کڕنۆش بردن و بەرژەوەندی‌یەکانی تایبـەتییان لەوانـەش فرعەونیـەکان کـە داوای خوایـەتیان دەکـرد یــان پێغەمبــەرە درۆزنــەکانی وەك ئــەبو مســلیم الکـذاب و هاوڕێیەکانی) ئێمە ئەوانە دەزانین حاکمەکان بـە درێژایـی مێـژوو دەناسـین جـۆرە پیرۆزییـەکیان دەدایـە دەســەڵات و حوکمــی خۆیــان، ئەســتێرەی ســەر شــانی دەسەڵات کە ئێسـتا لـە هـەموو جیـهان ئەفسـەرەکان لـە سـەر شـانیانە بـۆ یاسـا

١٦٠ انجیل بوذا ص ٨ طبع بیروت ١٩٥٣.

چەسپاندن کە کەسم نەدیووە هیچی لێ بزانێ ئەمەشیان سومبولێکە کە مانای دەسەڵاتی ئاسمانی دەدات کە ئەستێرەی ئاسمانە لە سەر شانی ئەو کەسە کە یاسای ئاسمانی خوایی و عەدالەت بەڕێوە دەبات ئەمەشیان هەمان ئەستێرەی پیرۆزی خواوەندی (عەشتار) (زوهرە) زەردە ئوشترا زەرد ئەستێرەی زەردەشتە... کە بەمانای ئەستێرەی زەرد کینایەیە بۆ (خۆر) رۆژ لە ئاسمانا کە سەردەمێك خواوەند بوون. وەك چۆن (مار) خواوەندبووە لە کاتی لێی ترساون بەهێزیان زانیوە پێش هێزەکانی دیکە. کەواتە لەم پێشەکییە کوردتەوە با بچینە سەر سمبولی ماری سەر شانی ئەژدیهاکی بابلی و ئەکەدییەکان کە هەمان سەرچاوەی ئەژدیهاکی کاوەیە:

١- ئێمە کە زانیمان دوو قۆچی وەك مار لە سەر شانی (نرام سن) لە وێنەکەی دیارە کە ئەنفال و قەتلوعامی لولو و گوتیەکان دەکا.. ئەوەی ماوە بیانباتە خواروی عێراق نێوان دیجلەو فورات، کۆیلەتیان پێ بکات وەك زاناکانی مێژوو باسی کۆیلەداری ئەم ناوچەیان کردووە. ئەم دوو قۆچە لەو سەردەمە سومبولی خواوەندایەتیە لەلای سۆمەری و بابلی ئەکەدیەکاندا بڕوانە وێنە ٢١٣، ص٢٢٩ سۆمەر فنونها بەڵام لەلای کوردە گوتیەکان مار ڕەمزی خوێنخۆری و ژەهری کوشندەو هێزی ستەم و وێرانکاری بووە لە سەر شانی ئەژدیهاکی سەرخاك و ژێر خاکە کە دژی ئاسمان و بەهەشتە ئەم شەپۆلەش کە داوای خوایەتیان دەکرد کاریگەری فیرعەونیەکانە کە داوای خوایەتیان دەکرد نەك کاریگەری هزری ئاریەکان کەقەت داوای خوایەتی کردنی تێدانەبووە. پاشان وورده وورده داواکردنی کوڕی خوایەتی و نزیکی لە خوا بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتەکانیان و ترساندنی خەڵك.

٢- دوو قۆچی سەر شانی خواوەندی بابل بەرامبەر بە حامورابی بە ئاشکرا دیاە وەك دوو مار کاتێ حامورابی (یاسا)کانی لێ وەردەگرێ ئەگەرچی

هەندێ کەس بە تیشکی تەفسیر دەکەن بەڵام لەلای گوتیەکان سومبولی هێزی پێوەدانە بڕوانە وێنە ٢٨٤ ص٢٨٥ سومر فنونها. کەواتە یاساکانی بابل بۆ چەسپاندنی کۆیلەتی بووە هەروەها بڕوانە چیانشینانی زاگرۆس هۆرمزی بێگلەری وەرگێرانی حەمەی حەمە سعید ص٣٧. وێنەی خواوەندی بابل و مارەکانی سەر شانی.

٣- لە سەر شانی خواوەندی (ننخۆر ساك) سێ قۆچی وەك مار هەیە هەندێ لە زانکان بە شتلە داری دادەنێن بەڵام لە راستیتدا سەلکی سێ فەرخە مارە تەنانەت چاوی یەکێکیان دیارە ئەگەر شتلە رووەکیش نەبێت ئەوا ئەم وێنەیە مانای هیچ نەگەیەنێ مانای سومبولی ماری سەر شانی ئەژدیهاکەکانمان بۆ بە دیار دەخات و دەیسەلمێنێ کە ئەژدیهاکی بابل و کاوە – کاودیای گوتی و سۆمەری کودەتاو ئینقلابیان لە سەر دەکەن خەڵکی لە ستەمی ئەژدیهاك و گەنجە گوتیەکان لە سەربڕین رزگار دەکەن. هەروەها سومبولی چاکەو خراپە لە سەر شان لەو سەردەمەوە سەری هەڵداوە کە سەردەمی کاوەو ئایینی گاپەرستی کاریگەری براهمەی هیندیە یان کوردی کە سەرەتای ئەم هزرە لە چیای زاگرۆس و پێدەشتەکانی دروست بووەلەو پێدەشتانەش گوتی و سۆمەریەکانی کورد بە هاوبەشی بڕوانە وێنە ١٦٧ ص١٨٦ سۆمەر. خۆ ئەگەر سێ فەرخە مارەکە شتڵ بوو ئەوا هیچ لەمانای ئەفسانەکان و ئەژدیهاك و ماری سەر شانی کەم ناکاتەوە بەڵکو دەبێتە پاڵپشتی هەمان بۆچوون و سومبولەکانی سەر شان بەهێزترو پڕماناتر دەکا، کە وەك ئەستێرەی سەرشان و فریشتە سمبولی خێرو شەڕ نووسین لەسەر شان.

٤- لە سەر شانی ئەژدیهاك ص٢٨٤ سۆمەر یان خواوەندی بابل دوو ماری بە ڕاستی دیارە وەك (تەنین)ی یابان و چین و هیندی و خوارووی ڕۆژهەڵاتی

ئاسیای پێوە دیارە ئێستاکەش (تەنین) حەزیا بەم جۆرە دروست دەکـەن لـە ئاهەنگەکانیان وەك سومبول بە دیاری دەخەن ئەمەش بەڵگەی ئاریەتی گوتی و سۆمەریەکان دەسەلمێنی کە لە رۆژهەلاتەوە لە چیاکانی زاگرۆس چوونەتـە دەم ئاوەکانی خوارووی دیجلـەو فـورات یـان هـور چـوار رووبارەکـانی کـە لـە زاگرۆس هەڵدەقولێن کە کارۆن و کەرخە (گـاوان روود) و دیجلـەو فـورات. لـە ناوچەی شارستانیەتی رۆژهەلاتی ناوەراستە ئەوانە زمانەکانیان لە یەکتر نزیك بـووە لـە یـەکتر دەگەیشـتن ئـەم وێنانـە هـی سـەردەمی (گودیـا)ی گودیـیـە (گوتی) یان سەردەمی حوکمە گوتیەکان لە سۆمەر و سۆمار.

-٥ لە ئیسلامەتیدا بروایان بە دوو فریشتە هەیە لە سەر شان کە هێزی خێرن بۆ گوناھ کەم کردنەوەو هوشیارکردنەوەی مرۆڤ لە خراپە نەکردن دانراون ئەویش بە تۆمارکردنی چاکەو خراپە بەڵام ئەمانە دیار نین بە رای من دەبێ مارەکانی سەر شانی خواوەندەکانی بابل کە هێمای هێزی خراپە بوون لە دواتریشدا رەمزی ئەهریمەنن کە (ئادەم و حەوا لە بەهەشت تەفرە دەدات و مرۆڤ تووشی سەختی ژیانی سەر خاك دەکات) کەواتە ئەمانە لەلای گوتیەکان بە خواوەندی خراپە لە قەلەم دراون بە بەلگەی ئەمەش لە سەر شانی خواوەندی ئاریەکان (مار) نیە بروانە خواوەندی عیلامیەکان لە هەمان سەرچاوە وێنە ٣٩٧ ص ٣٧٨ یان ص ٣٨٦ (سومر فنونها و حضارتها).

ئاشکراشە کە عیلامیەکان لور بوون ئاری بوون ئەمەش بەلگەی بە دیارخستنی دوو ئایینە کەواتە لەو سەردەمە خواوەندێك کە دوو ماری لە سەر شانە بە دەستی خواوەندێك لە ناو دەچێت کە کاوە گودیایە ماری لە سەر شان نیە کەواتە ئایینی براهمە کاریگەری لە سەر بیرو بروای هزرو ئۆلی گوتیەکاندا هەیە بەهۆی ئەوانەوە ناوچەکە بە گشتی بیرو رای بەرامبەر بە مار گۆریوە یان کودەتا لە سەر ماری ئەژدیها بکات وەك کودەتای کاوەی گوتی

کەواتە مەسەلە وەك (ئو.ل.ڤیلجیڤسکی) هاورێکانی مەسەلەی کۆمەلایەتی (بین النهرین) دەبەنەوە سەر چینایەتی بەلام لێرەدا بۆمان ئاشکرا دەبێ کە مەسەلەکە تەنیا چینایەتی نیە مەسەلەیەکی ئایینی‌یە چینایەتی دروست کردووەو بەرێوەی دەبات بەهۆی کۆمەلە یاسایەکی توندو تیژو پڕ گەف و پڕ مردن وەك ئایینی کە حامورابی دروستی دەکات و دەیداتە پالّ خوداوەندی مار لە سەر شانی ناوچەی سۆمەرو بین النهرین و تا دەوروبەری ناوچەکەش حوکم بکات بە ئاسن و ئاگر و خوێن ڕشتن بۆ ئەو کەسانەی کڕنۆشی بۆ نابەن و کاری بۆ ناکەن ونایپەرستن خۆی داوەتە پالّ خواوەند سێبەری خواوەند ئەوکەسەی لەگەلّ خواوەند دەتوانێ بدوێ دەنگی دەگاتە ئاسمان یان خواوەندی لەگەلّ هەلّی بژاردووە حوکمی خەلکەکە بکات، خەلّك کاری بۆ بکات و ببێتە (عبدی) بە مانا (کۆیلەی). لێرەدا یاسادانانەکەی بۆ زولم و زۆری و دیلیەتی و کۆیلایەتی و خەلّکانی رەسەنی ناوچەکەیە کە گوتی و کاشی و عیلامی و کوردن وەك ئاشکرایە یاساکەشی لە سەر بنەمای کۆیلەتی دانراوە هەر بۆیەش حاکمانی سامی خۆیان بە سەروەرو سەیدو گەورەی میللەتانی تر داناوە لەوانەش کورد بە کۆیلە ودەرەجە دوو وەك هەموو میللەتانی دیکە بە درێژایی مێژوو. کاتی ئەوە هات سامیەکان لە ژێر کاریگەری ئەم میتۆلۆژیایە دەربچن ئەگینا یاسای جیهانی نوێی بە بەر نەفرەتیان دەخات. کوردەکانی بیتوێن دەلێن جێگا مەنجەنیقی حەزرەتی ابراهیم لە کوردستانە و کوردە کە لە شوێن هەواری جافەکان و شوێنی کۆنی گوتیەکانە لە نزیك سەدەی دۆکان شاخەکەش شوێنەوارەکەی لێ دیارە هەندێ مێژوو نووسیش دەلێن شوێنی مەنجەنیقی ابراهیم لە بابلە بە لای ئێمەوە هەر دوو شوێن شوێنی رەسەنی کورد بووە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆرێ کێ دەلّێ براهمە براهیمیەکانی هیندستان، پاشماوەی ابراهیم نین یان

كاریگەری ئایینی یان پاشماوەی هزری گوتیەكانی كورد نین وەك چۆن زەردەشتیەكان كە لە ناوچەی هیندیەكانن لێرەوە لە كوردستان چوونەتە ئەوێ كە ئاشكرایە لە (ئاتر پایگان) واتە (ئازربایجان)ەوە لە دەست ئیسلامەكان رایان كرد یان وەك دكتۆرە پاكیزە دەڵێ شارستانی سۆمەریەكان لێرەوە چووەتە ئەوێ ئێستا بەهوی مێژووی گوتی و پاشماوەیان بەلگەی ئەوەشمان كەوتە دەست كە حەزرەتی ابراهیم كوردو زاگرۆسی و ئاری‌یە براهیمە واتە براهی و ئایینی برایەتی‌یە بە زمانی هیندو ئەوروپی (براهما) برای هەموانە كە حەزرەتی براهیم / برایم بێت بە كوردی‌و كە ئایینی برایەتی و خۆشەویستی و بلاوكردۆتەوە ئێستاش كوردی رەسەن هەردەم داوای برایەتی دەكا رۆژنامەی ناوی برایەتی‌یە لەو سەردەمەش ئەوان داوای زیندووكردنەوەی (بەعس)ی واتا زیندوو كردنەوەی ئەژدیهاك و مارەكانی سەر شانی دەكەن ئەگەر كورد لە مێژووی خۆی و هاوسێیەكانی خۆی نەگات نابێتەوە گوتی و خاوەن كاوەو برایمێكی دیكە من لە كاتی نووسینەوەی ئەم نووسینە گەیشتمە ئەو قەناعەتەی ئەو شوێنەوارەی لە سەروو كێوەكانی نزیك جافەكانە یان لوتكەی چیای نەمرود بە ناوی شوێنی ابراهیم راستەو گوتی‌یە مەنجەنیقەكەی لە بابل كراوە لەلایەن نەمرودی ئاشوری‌یەوە كە حوكمی شیشاری دەكرد بەلام نەسووتاوە لەبەر هەر هۆیەك بێ خەڵكی دەشتی بێتوێن هەموویان دەلێن شارێك هەبووە بە ناوی شیشار. دەگونجێ لە شەش شارەوە هاتبێ یان (٣٠سیی) شار بە سۆمەری و كوردی ئایینی گوتی‌یەكانی كورد زولم و زۆری لە سەر كۆیلەكان لاداوە بەهۆی شۆرش و راپەرینی كاوە. گوتی‌یەكانی نێوان دوو رووبار واتە ناوچەی سۆمەر بە هاریكاری گوتیەكانی نێو چیاكانی زاگرۆس كە لە سومبولی ئەو گەنجانە پێك دێت كە دبردرانە نێو چیایەكان لە كوشتن رزگاریان دەبوو دووبارە دێنەوە بۆ رزگاركردنی بانەبلێ

کە خواوەندی بابلی بەناو کراوە ناوچەی سۆمەر لە دەست ئەژدیهاك خۆ بە خوازان و مار لە سەر شان وەك نرام سن رزگار دەگەن برهان قاطع ئەژدیهاکی بە ئەژدیهاکی بابل تۆمارکردووە کە لەمەدا لەگەڵ لێکۆڵینەوەکەماندا هارمۆنی و پڕ پێکە هەمان بۆچوونمان دەسەلمێنی وە کاتی باسی پاشماوەی ئایینی گوتی و کیشی و ئیلامیو سۆمەری و ئاریەکانی سەردەمی گوتیەکان دەکەین لە چۆنیەتی نوێژ و نوێژکردن کە ئایینی ئاری ناوچەکە چەند کاریگەری لە سەر دەورو پشتی خۆی هەبووە وەك لە وێنەکان بە دیار دەکەوێ. چۆن دەستیان گرتووە لەکاتی نوێژکردن یان ئەهریمەن چۆن دەچێتە نێو مار کەواتە مار ئەهریمەنی‌یە هێزی خراپەیە لە زەردەشتی دا لەگەڵ گیاندارە ئەهریمەنیەکان دەژمێردرێ. مەبەستیشمان لە (بابل) خوارووی ئێراقی ئێستایە.

٦- ئەستێرەی سەر شانی ئەفسەران هەمان مانای ئەستێرەی ئاسمانی و هێزی ئاسمانی خواوەند دەبەخشێ بە مانای ئەو مرۆڤەی ئەستێرەی لە سەر شانە یاساکانی ئاسمانی جێبەجێ دەکات واتە هێزێکی ئاسمانی لە پشتە بۆ جێبەجێکردنی یاساکان کە دەسەلاتی حکومەتەو لە یاسا پیرۆزەکان دەسەلاتی وەرگرتووە ئەمانە هەمووی پەیوەندی هەیە بە ئەفسانە کۆنەکانی پێش زانست، هەموویان پەیوەندی‌یان بە یەکەوە هەیە وەك مانا و رەنگدانەوەی فەلسەفی ناوچەیی (بین النهرین) وخواوەندی رۆژو ئەستێرە ومانگ.

٧- هیچ مارێك لە سەر شانی خواوەندی ئیلامی نیە بەلگەی ئەوەیە ئەم بڕوایە لەلای ئارەیەکان رەتکراوەتەوە هیچ کاریگەریشی نەبووە بە سەریانەوە بەلکو کوشتنی ئەژدیهاك ئەم مانایە دەبەخشێ بڕوانەی سەر شانی خواوەندی ئیلام وەك لە پێشەوە باسمان کرد سۆمەریەکان دواتر هاتوونەتە سەر بڕوای

گوتیەكان بە هۆی كاوە – گودیا ئەویش بە پیرۆزكردنی گاو نەفرەت لـە مـارو ئەژدیهاكی مار لە سەر شان یان ئەهریمەنی نـاو زگـی مـار كـە یەكـەم دایـك و باوكی مرۆڤایەتی لە بەهەشت بە دەركردن دا ئـەم وێنەیـەش لەگـەڵ وێنـەكان دەخەینە بەرچاو بۆیە شاعیرە سۆمەریەكان یـان ئەكەدیـەكان كـە نـازانین لـە كامیانن ئیستیفزازی گوتیەكان بە مار دەكەن كاتێ دەلێـن گوتیـەكان بـە مـار دەچن یان بڕوانە ماری سـەر شـانی خوداوەنـدی بـابلی ص٣٧٣ سـۆمەر یـان خواوەندی ئیلام لە هەمان لەهەمان سەرچاوە.

٨- گاپەرستی یان پیرۆزی گا لـەلای ئیلامیـەكانیش بـە دیـار دەكـەوێ لـە وێنــە ٣٨٦ لاشــەی مرۆڤــە دوو پێیــەكانی (گــا)یــە دواتریــش لــەلای هەخامەنشیەكان مەسەلەی گا و وێنەكانی كاریگەری بە دیار دەكـەوێ. بـەلام بۆ مەسەلەی قوربانی پێشكەشكردن بۆ بتەكان و خواوەندەكان ئەوا بە دەهـا وێنـە لـە كتێبەكـەی سـومر فنونــها و حضارتــها بە دیـار دەكـەوێ. لەوانـە ص٣٨٦. كە مەڕ و ئاژەلیان لە باوەشە بۆ سەربڕین و قوربانی كە گەورەترین سیماكانی ئایینی حەزرەتی ابراهیمە شێوەی كاریگەری لە سەر یـەكی ناوچـە بە دیار دەخا لە لایەنی قوربانی وبەس.

* خواوەندی ئیلامی ص٣٧٩ سۆمەر هەمان سەرچاوە. كـە مـاری لـە سـەر شـان نیـە بەپێچەوانـەی خواوەنــدی ئەكــەد و بابلیــەكان ئێمــە پیــتی (ع) مــان بەكارنەهێنا لەبەر نەبوونی لە كوردی و رەسەنایەتی ناوەكە بۆ ئێراق و ئیسلام.

* ئێمە لەم كتێبەدا لە دەقێـك دا سـەلماندوومانە گووتـی ئـایین بـووە وەك عەشتار بە واتای خواوەند بووە كە هەمان مانای گاوە – گا– گـاوانی – گـاودی– گودیا (الثور) بە عــەرەبی دەگەیـەنێ لـە زۆر دەقیـش (گووتـی) بـەخواوەند نـاوی هاتووە وەك عەشتار.

* لە ص ١٥٧ كتێبی (بوزا) كە باسی براهماییەكان دەكا (بـوزا) (غوتامـا) (گوتامـا) بـانگ دەكـا كـە بـە رای مـن پەیوەندییـەك دروسـت دەكـا لـە نێـوان ئایینەكانی سەردەمەكەو ناوەكان وەك ناوی (گواتاما) كە نزیكە لە ناوی گوتی.

* ڕەشید یاسمی دەڵـێ: (لـەپاش لـەناوچوونی گوتیـەكان ملـوك الطوائـف) هاتنـە سـەركوحم خواوەندەكـانی (هینـدی ئـیرانی) یـان پەرست كـە (ئـەندرا) و (وراونە) (ڤارونە) و (میترا) بوو (Inda- ra) لەگەڵ خواوەنـدی (Nasat). بـەڵام ئێمە وتمان گوتیەكانیش بەهەمان شێوە خواوەندەكـانی (هینـدی ئێرانیـەكانیان) دەپەرست.



شكل (٣٠)
الإلهة الأم ننخرساج (سيدة الزمن)



٣- نيراج (نيراه) الثعبان
الحامي للبشر والحدود

سەرچاوە - خزعل الماجدی - متون و انجيل سومرية

**ماری سۆمەری پارێزگاری مرۆڤ و سنور**

**ننخرساج خواوەندی شەش شتلی وەك ماری لەسەر شانە كە ئەمە بەڵگەی كشتوكاڵ ونەم بۆچوونەیە كە ماریش لەسەر شانی ننكیشزیدا جۆرە مانایەكی تری هەبووە بۆ هێزو ستەم كاری و مرۆڤ خۆری**

# كاریگەری ئەفسانەی مار لە سەر كورد

كاریگـەری مـار و ئەفسـانەكانی كۆنـی كـوردەواری كـاری كردۆتـە زۆر لەنەوەكانی دواتر. وەك بیرونی دەلی (دیتنی مار لەهەر رۆژێك لە رۆژەكانی مـانگدا دەبێتە مایەی شوم و بەدبەختی بۆ ئەو كەسـە. یـان دەسـكەوتێك. ص٢٥٧ ایـران درزمان ساسانیان (دیارە ئەمە لەكۆن ماوەتەوە) لەم بارەوە (ئاگائیاس لـە ٢٤، ٢ لـە ص٢٥٦ ایـران درزمـان ساسـانیان دەڵێ لـە ئـێران جـەژنێك هـەبووە بـەناوی لـەناوبردنی گیانـە لەبـەرەكانی زیان بـەخش) لـەناوبردنی گیـان لەبـەرە زیـان بەخشەكان كەلە مەخلوقاتی ئەهریمەنن). (نرام سن) كـە دوو قۆچـی لەسـەر شـان بووە وەك مار یان بەمار یان شـوبهاندووە یـان هـەر بـەماری تێكەیشـتوون كـە لـە راستیدا قۆچ لەسەر نان مانای خواوەندایەتییە. ئەوەی قۆچی لەسەربێ وەك (گـا) خواوەندە گاوەیە یان هەر بۆ ئیستیفزاز و جوێن بـۆ درنـدە بەئەژدیـهاكی دوو مـار لەسەر شانیان شوبهاندووە ئێستاش كورد دەڵێ مار جێگای بڕوا نی‌یە ئەمـەش لـە زۆر وێنەی دیكەدا سمبولی (مار) كاری كردۆتە سەر ئەفسانەكانی عەرەب و ئیزدیی و زەردەشتی‌یەكان چۆنیەتی رەفتاركردنیان لەگەڵ سمبـولی (مـار). وەك دەزانـین لێرەدا تەنیا ئەوەندە دەلێـن لـەلای كـورد و دواتـر زەردەشـت دوژمنـی مـار بـووە چونكە زیانی بە مرۆڤ گەیاندووە. هەندیچ جاریش لێی ترسـاون رێزیـان گرتـووە وێنەیان كردووە وەك وێنەی (مار) لە دەرگای (لالشی) پەرستگای ئێزدیەكان.

بۆیـێ هـەموو وینەی‌ئـەو (مارانـەی) لـەنێو كۆلـین و وێنـەكانی سـۆمەری سەردەمی گوتیەكان پێویستیان بەلێكۆلینەوەی تازە هەیە هـەروەها ئەفسـانەكان كەسیمای هزری گوتیەكانی كوردی بەسەرەوەیە لەگەڵ كاریگـەری وەك دەسـەلات و بالا دەستی لەم ماوە دووروو درێژەدا كە هاتن و جێنشبوون.. هەندێكیان نەبێت گەرابوونـەوە یـان ئەوانـەی هـەر لەشـوێنی خۆیـان بـوون لەناوچـەی (جوانـرود) و

دەوروبەری کـە نێوەراسـتی کوردسـتانی گەورەیـە بەنسـبەت ڕۆژهـەلات و ڕۆژئـاوا کەواتە گوتیەکان هەقیانە ئەکەدی و بابلیەکان بەماری بیابان بچوێنـن لـەو کاتـەی زێتر لەهەموو خەلکانی دیکە نهێنیەکانی ئەکەدو بابلیان دەزانی و بەشـێکیان هـەر لەناوچەی ئورو لکش جێنیـش بوون[161] تـا هـەموو سۆمەریەکان بـوون بـە گـاوانی کورد. ئەمەش لەوەدا بەدیار دەکەوێ کە ئیسلام هات ناوچەی بـین النـهرین تـەنیا گاوانیەکانی لێ بوو یان زۆرینە. کە عەرەب پێیان دەگوتـن عجم. واتـا بـە خـەلکی ناوچەکەی خوارووی عێراق کە عەرەب نەبوون.

* بۆ قولبونەوەی زێترو بەدواداچوون ئەم وتەیە دووبارە دەکەینەوە[162]. کە (بـیرونی دەلـێ: (دیتنـی مـار لەهـەر ڕۆژەکـانی مـانگدا دەبێتـە مایـەی شـوم و بەدبەختی بۆ ئەو کەسە. یان دەسکەوتێك). یان وەك ئاگائیاس دەلـێ:- لـەئێران جەژنێك هـەبووە بـۆ لـەناوبردنی گیـان لەبەرەزیانبەخشـەکان (لەوانـەش مـار) کـە مەخلوقاتی ئەهریمەنن[163].






وێنەی ماری دووسەر لەسەر دەرگای بابل الخان لە سنجار کە کاریگەری جۆتە ماری ننکشزیدایە هەروەها ئەو مرۆڤەی وەك کاوە نێزەی لێدەدات وەك وێنەی ئەژدیهای میتراییەکان و کاریگەری لەسەری

سەرچاوەی وێنەی دووەم : جنوب کردستان هینری فیلد

---

١٦١ص٢٥٢ سؤمر لم يكن للكوتيين مطامع سياسية كبرى. فقد قنعوا بان يستوطنو طو بلاد خصبة وان يعيشو على غني الارض.

١٦٢ ایران در زمان ساسانیان کرستن سن ص٢٥٦.

١٦٣ هەمان سەرچاوە، ٢٤، ٢، لە لا٢٥٦.

## زەقورە:
## داهێنانێكی سەردەمی گوتیەكانە لە ناوچەی (سۆمەر) وەك (زاگورە) لە((لافاو)) و تۆفان رزگاریان بكات

زەقورە.. بەو بینا بەرزە چەندین نهۆمە دەڵێن كە یەك لە یەك بچووكترە تا بچووكترین نهۆمی سەرەوە، هەمووش بە خاك و خۆڵ دروستكراوە یان پڕكراوەتەوە پاش ئەوەی دیوارەكان نهۆم بە نهۆم دروستكراوە، بەڕای هەندێكیان گوایە بۆ خواوەند دانراوە وەك پێ پلیكانە پێی بێتە خوارەوە ئەوەی وابیردەكاتەوە لە شارستانیەتی سۆمەریەكان نەگەیەیشتوە میللەتێك ئەو بینایە بڵندە دروست بكات دەزانی ئەو خواوەندەی هەزاران هەزار بڵندایی ئاسمان بڕی دەتوانی ئەم چەند مەترەش بێتە خوارەوە. بە تایبەتی كە دەیانزانی زۆر لە خواوەندەكان باڵیان هەیە.. وێنەیان بۆ لەبەرد یا بە هەڵكۆڵین بۆ تا شیوون بۆمان ماونەتەوە، ئەو زەقورانە لەسەر دەمی گوتیەكانەوە پەیدا بوو، كە واتە بەكاریگەری ئەوانەوە بوە یان ئەوان مەبەستم كوردەكانی زاگرۆسی سۆمەریەكانیان فێركردوە ئەم جۆرە بینایەی وەك(چیا) دروست بكەن بۆ پارێزگاری لە لافاو وەك (كەندەك) كەندۆكە (خندق) چۆن مسلمان فارسی فێری موسلمانەكانی كرد بۆ پارێزگاری. یان وەك چۆن (نەبونوسەر) بۆ شاژنەكەی كچە(میدیا) باخچەی هەڵواسراوی دروستكرد[١٦٤]. بە چیا بچێ شاژنی كورد چونكە لەگەڵ ئاو هەوای گەرمی خواردو ڕانەهاتبوو. بەهەر حاڵ ئێمە دەبێ زۆر لەوە

---

١٦٤ئامی تیس AMITIS ناوی خوشكی هو خشتری میدیە كە دابوی بە (بخت نوسەر (نصر) كە باخچەی هەڵواسراوی بۆ لە ساڵانی ٦١٢ پ ز. دروستكرد بڕوانە (اهمیت كردستان بەفارسی منصور مخدوم ص٣٨).

ورتربین چونکە سومەریەکانی نێوان دوو روباری دیجلە و فورات لەسەردەمی گوتیەکان ئەمەیان دروستکرد، بەڵام ئاشووریەکان ئەم جۆرە بینایەیان دروست نەکرد. بۆ..؟ چونکە پێویستیان نەبوو لەبەر ئەوەی شوێنیان بڵند بوو و دوور بوون لە لافاو، ئێمە دەبێ لەروانگەی پێویستیەوە و هەروەها ترس و خەمی رۆژانە و هزری سۆمەریەکانەوە بچینە نێو لێکدانەوە و مانا دۆزینەوەی پاشماوەکانیان لە وانەش(زەقورە). کە هەمومان دەزانین خواروی ئیراق ئور ناوچەی بابل هەمووی بە تێکرایی هەموو ساڵێك لافاوی لێ هەڵدەستا،چونکە هیچ بەنداوێك دروست نەکرابوو لە نێو چیاکانی کوردستان وەك ئێستا ئاوی زیادە بگێڕێتەوە یا گل داتەوە تا نەکاتە لافاو لە خواروی ئیراقی ئێستا(وەك بەندە بەبیری دێت) کە چۆن هەموو ساڵێك لافاو لە شاری بەغداوە بەرەو خواری شپرزە و نغرۆی دەکردن[١٦٥]. بۆیە مرۆڤی سۆمەری لە نێو ئەم ترسە هەمیشەییە دەژیا بەڵگەشمان چیرۆکی(لافاوی) بەناو بانگ و پاپۆری(نوح) و کەسۆمەریەکان (ئوتوناپشتیم) یانِ پێ دەگووت، هەروەها وەك لە داستانی گلگامێش بە دیار دەکەوێ بۆیی بەڕای من کە خیلافی هەموو راکانە یان دۆزینەوەیە بۆ مانای(زەقورە) کە بۆ ئەوە دروستراوە لە کاتی(لافاو) هەستان فریاکەون خێرا بچنە سەری و رزگاریان بێت لە مردن، ئەمەش گوتیە چیاییەکان فێریان کردن کە چۆن لە چیاکان لە کاتی لافاوی روبارەکان چیا رزگاری دەکردن. ئاواش سۆمەریەکانیان فێرە(زەقورە) دروستکردن کرد یان(چیا)، بە زمانی سۆمەری(گۆرە) تا لە هەر شارێك و زەقورەیەك دروست بکەن[(١٦٦)]، بەڵگەشمان بۆ ئەمە ئەوەیە:.

---

١٦٥بڕوانە د. علی الوردی– دراسة في طبيعة المجتمع العراقي ص٣٢ المكتبة الحيدرية يان أحمد سوسة (فيضيانات بغداد في التأريخ) ص١٧٠–ص١٧١–ص١٦٦.

(١٦٦) لە كتێبی الاكراد منذ اقدم العصور لە نووسینی مقدم شێخ عبدالواحد لە پاكستان بە پێشەكی نووسینی محمد ئەیوب خان سەرۆكی پێشووی پاكستانی لە وەرگێڕانی عبدالمسیح سراج الدین ص١٢ هاتووە(لفظ زاغروس–زاگروس– في ما وراء الجبال اذ ان لفظ(غور) تعني الجبل و تسمى هذه

١-بیناکـە زۆر بـە پتـەوی دروسـتکراوە ئەگـەر لادیواریکیشـی بڕوخـی خۆڵەکـەی نێویـی وەك گردێك دەمینێتـەوە. وەك چۆن پـاش چوار هـەزار سـاڵ ئێستاش زەقورەکـان بـەبێ دیـوار وەك گـرد. مـاو نەتـەوە خۆئەگـەر مەبەسـت پەرستگا بوایە ژور و هۆڵی گەورەیان دروست دەکرد بۆ خواوەند، ئاوا پڕ خۆڵیـان نەدەکرد یان تـەنیا پـێ پلیکانـەکان کـە بـەرگری ئـاوی نـەدەگرت. جگـە لەمـەش گەورە دروستکراوە بەشی خەڵکانی شارێك بکات لەکاتی پێویست و لافاو.

٢-لەهەر چوار لای زەقورە پێپلیکانە هەیە کە ئەمە بەڵگەی ئەوەیـە تـا لـە هەر لایەك بێت بەزوترین کات سەرکەونە سەر زەقـورە کـە لـەلافاوی کتوپـڕ رزگـار یان بکات ئەگینا پێپلیکانەیەکی گەورەیان بۆ خواوەند دروست دەکرد و بەس یـان هەموو دەبووە مەدرەجێك وەك مەدرەجی یۆنانیان تا ئەم مانایە بدات.

٣-ووشەی(زەقورە) بەرای من عەرەب وای نووسـیووە یـان سـامیەکان کـە لەرەسەندا(ق) لە گەڵ(گ) کوردی جێگۆڕکێی کردوە کە(زەگورە)یە چونکە(کورە) بەسۆمەری بەمانای چیا دێت وەك باسی دەکەین باسمـانکردوە لـە(زاگـرۆ)س هوە هاتووە کە پیتی(س) یۆنانیەکان بۆ(زاگر) زیادیان کردووە، وەك(باخۆس، ڤینۆس، ئۆقیـانۆس،فیسـاغۆرس،زاگـرۆس..هتـد) وەك عبیـدالله ئـەیوبیان لـە نـەورۆز در کردستان درکێ پێکردووە و دەڵێت وشەکە لە رەسەندا(زاگورە)هیە کەواتـە زاگـور بەمانای(چیا)، (زا+گۆر) کە وەك باسمان کرد(زا) لـە زەردەوە هـاتووە بەبەڵگـەی بەشێکی خواروی زاگرۆس لە ئێران ناوی زەردکۆیە کوێوی زەرد کینایەیـە بـۆ رۆژ

---

المنطقة في لغة فارسية(گور) بەرای منیش زاگرۆس-زاگور-زا+گۆر..هەمان شێوەی وشـەی(گـۆر)ی سۆمەرییە بە مانای چیا، وەك لە پێشووش باسمان کرد(زا، لە زەردەوە هاتووە) بەبەڵگەی ئەوەی خوارووی چیای زاگروس ناوی(زەردکۆه)ە کە بەشێکی زاگرۆسـە کەواتـە(زاگـرۆس) کێـوی زەردە، هۆری زەردە، ئێستاش هەندێ شوێن هەیە لە کوردستان وشەی(کۆڕ) پێشگر و پاشـگری چیاکانـە وەك(کۆڕەك، خواکورك، بن کۆڕ،کۆڕەز و...هتد) لەبیریشمان نەچێت سـۆمەریەکان بـە خاکیشـیان گووتووە(کۆڕ) هەمان گۆڕەپانی کوردییە، کە دەکاتە کۆری بڵند(چیایە) کۆڕی نەوی(گۆڕەپانە).

هەڵاتی بابل و سۆمەر، كەواتە زەقورە(زاگورەیە) بەمانای چیا دێت، یان وەك چیا كە نیوە وشەی ناوی چیای زاگرۆسی گوتیەكانە(و استوت علی الجودی) كە زۆر جاری تریش بە بیری دەخەینەوە كە پاپۆڕی(نوح) لەسەری وەستا و وای كرد دووبارە سۆمەرییەكان بژینەوە و لەناونەچن كەواتە سۆمەریەكان لە چیاكانی كوردستانەوە چونەوە خواروی ئێراقی كورد، وەك بە هەمان شێوە كاوە ئەژدیهاكی كوشت و گەنجەكانی كورد و تۆی كورد لەناونەچن دووبارە لە چیاكانی كوردستانەوە گەڕانەوە خواروی ئێراق، ئەمە دەبێت لەلامان زۆر گرنگ بێت و ئەم بینایەش پیرۆز و پایە بڵند كە كاری میللەتێكە نەك تاكە كەس، بە واتای سۆمەرییەكان هەموویان پێكەوە دروستیان كردووە بە هەرەوەزی و زانیاری گوتیەكان، بۆیێ خۆم هیچ گومانم لەوەدانیە تەنیا لە خوارووی عێراق(شوێنی لافاوی هەمیشەیی)یە دروستكراوەئێستاكە لەجێگای ئەودا بەنداوەكانی(دۆكان و دەربەندیخان) لە ولاّتی جافەكانی گاوانی، گوتی كورد دروستكراوە بۆ پارێزگاری خاكی پێشووی گوتی و سۆمەریەكان لە خوارووی عێراق كە ئەمەش رێكەوت نیە و دووبارە بوونەوەی مێژووە، هەر كوردە دووبارە خوارووی عێراق لە لافاو و مەترسی رزگار دەكاتەوە مەبەستم شوێنی رەسەنی گوتی گاوانی جافە، مەبەستم(فیدراسیای سەركردەی هۆزەكانی كوردە لە سەردەمی گوتیەكاندا) خۆ ئەگەر مەسە بخەینە نێو قالبی تۆفانی نوح و تۆفانی زەردەشت ئەوا بێ سێو دوو دەڵێین هەموو جیهان لە كوردستانەوە ژیانی بۆ دووبارە بۆتەوە كە بەمەبە ناوچەی زاگرۆسی كورد لانكی مرۆڤایەتییە لانكی ژیانەوەی مرۆڤە لە دوای لەنوا چوون و تۆفانەكان. یان بەفرو شەختە بارینی زەردەشت و دووبارە بوونەوەی ژیان كە كورد دەبێ هەمیشە شانازوی بەم ئەفسانەیە بكات و بەمەش دەبێ لێرەوە لە ئەشكەوتی شارنەدەرەو نیاندرتاڵەوە ژیان بڵاو بوویێتەوە بۆ جیهان.





زەقورە- زاگورە - بڵندییەکی دروست کراوە هیچ خانوویەکی تێدانی‌یە لــە چــەندین لاوە شــوێنی بــۆ بە پەلە سەرکەوتنی بۆ دروست کراوە بۆ کاتی لافاو خۆ رزگار کردن وەك شوێنێکی پیرۆز پارێزراوە لەو شوێنانەش دروست کراوە لافاو دەی گرێتەوە لە تەك شارەکانا، کەواتە ناوەکە گوتی‌یــە کــە چیــایین ئەمەیان فێری سۆمەرییەکان کرد وە چیا لەلافاویان رزگار بکات

## جیاوازی نێوان تۆفانی سۆمەری و زەردەشتی
## گاڤی و گاڤییەكان وماری سەر سەری پاشای فیرعەونییەكان

پێشەكی بۆ ئەوەی پلەو پیرۆزی (گا) لەلای زەردەشتییەكان بزانین گەڕاینەوە سەر (ڤاندیدات)[١٦٧] دەبینین بە میزی (گا) پیسی و نەجاسەت دەشۆنەوە بە واتایەكی دیكە خۆیان لە شتە قەدەغەكراوەكانی دەستیان پێكەوتووە پاك دەكەنەوە وەك دەست دانە مردوو، ئەمەش رەنگدانەوەی پیرۆزی (گایە) لەسەر ئاینی زەردەشتیدایان كاریگەری ئاینی پێشوو كە ئاینی (گاڤی)[١٦٨] یەكانە، یان كە دەبینین لە بەندی ٥٦ی كوردەی هەڤدەم هاتووە كەوا ئازاردانی (گا) قەدەغە دەكەن[١٦٩]. بەڵام وەك باسمان كردووە مار گیانلەبەرێكی ئەهریمەنی شەڕاوییە لە ئاینی زەردەشتیدا كە چەند دەقێكی ئاڤێستامان باسكردووە چۆن ئەهریمەن ماری دروست كردووە نەك ئاهورامزدا كەواتە كە ئەهریمەن دەچێتە نێو لاشەی مارو بۆ هەڵخەڵەتاندنی مرۆڤ و دەركردنی لەبەهەشت، مانای شانبەشانی و لایەنگری كردنی مارە بۆ ئەهریمەن كە بەمە مار ئەهریمەنییە وەك لە ئاڤێستادا هاتووە ئەهریمەن دروستی كردووە[١٧٠]. بەڵام بۆ مەسەلەی تۆفانی سۆمەری و ئاینەكانی دوای خۆی و هزرو ئافسانەی میللەتان لەوانەش زەردەشتی دەبینین جیاوازییەكی ئاشكرا هەیە لەنێوانیاندا:

---

(١٦٧) ڤاندیدات، ئابیستا، و. د. داود الجلبي، ١٩٥٢، ل٩٧، ٩٨، ١١٥.

(١٦٨) گاڤی: ناوی پیاوەئاینییەكان بووە دژی زەردەشت وەستاون، كەواتە (گاڤ) ناوی ئاینەكە بووە، هەمان وشەی (جاف)ە.

(١٦٩) ئاوێستا، و. عمری فاروقی، ١٩٧٦، بەندی ٥٦، كوردەی هەڤدەم.

(١٧٠) ڤاندیدا، دروست كردنی ماری نێو رووباری لەلایەن ئەهریمەنەوە.

١) تۆفـانی سـۆمەری بـە هـۆی هەڵسـان و لافـاوی رووبارەكانـە لــە خــوارووی عێراقی كۆندا كە ئاگادرای گەورەیی جیهان نەبوون وایان دەزانی جیـهان هـەر هێندەیە هەتا چیاكانی زاگرۆسە كەبەلایانەوە ئاسمانی لەسـەر وەسـتاوە دوا سنووری جیهانە وەك لە ئەفسانەكانی كورد بەدیار دەكەوێ كەوا چیـای قـافێ (قەفقاس) دوا سنووری جیهانەو دوا سـنووری رۆنـاكی لـەپاش ئـەوە جیـهانی تاریكی دەست پێدەكات كە جیهانی دێوەكان و زستانی هەمیشەییە.

٢) بەڵام لافاوی زەردەشتی بەفریارین و شـەختەبەندانە. كـە جیـهان هـەمووی دەبێتە بەفرو شەختە و گیان لەبەران لەناو دەچن تەنیا ئەوانـەی دەچنـە نێـو (VAR)[١٧١] ڤار بەم جۆرەی خـوارەوە ئـاهورامزدا داوا لـە زەردەشـت دەكـا ڤارێك واتا ئەشـكەوتێك دروسـت بكـات چونكـە بـەفرێكی زۆر دەبـاری هـەموو جیهان دەگرێتەوە گیانداران لەناو دەبات بۆیە جوانترین نێرو مـێ لەگـەڵ هـەر گیانلەبەرێك و رووەكێك كە هەیە لەسەر زەوی نموونەی لەگەڵ خۆی بباتە ئەو ئەشكەوتە بۆ ئەوەی ژیان بە گشتی دووبارە دەست پێبكاتەوە، چونكە مرۆڤ وەك زەردەشت داوای كردبوو زۆر بووبوو لەسەر خـاك جێیـان نـەدەبۆوە ئـەم بەفربارینەش بە رەزامەندی ئـاهورامزاداوە دەبێـت وەك لافـاوی سـۆمەریانیش لەبەر ئەوە بووە خواوەندەكانیان لێیان نارازی بوینە.

٣) بەڵام جیاوازییە گرنگەكە ئەوەیـە كـە زەردەشـت جوانـترین بـەهێزترین بـە رەوەشتترین وگیانلەبەر و مرۆڤ هەڵبژێرێ و لەگەڵ خۆی بیبات كـە بنـەمای فەلسەفەی (نیتیشا)[١٧٢] لەوەوە وەرگیراوە كە پێی دەڵێـن (سـۆپەرمان) كـە لە كتێبەبەناوبانگەكەی (زەردەشت وای وت)[١٧٣] دا هاتووە وە هـەر ئـەوەش

---

(١٧١) هەمان سەرچاوە، ل٣٦. ڤار بە مانای ئەشكەوت ڤا + ئار.

(١٧٢) فەیلەسوفێكی ئەلەمانیە و ناوی فردریك نیشتەیە.

كتێبەبەناوبانگەكەی (زەردەشت وای وت)[١٧٣] دا هاتووە وە هەر ئەوەش بوو وای لە هیتلەر كرد فەلسەفەی رەگەزی ئاری لەسەر بنیات بكات، واتا بالادەستی رەگەزی ئاری لەسەر هەموو رەگەزەكانی جیهان.

بەلام لافاوەكەی سۆمەری جۆرێكی ترە وە جیایە لەگەڵ لافاوەكەی نوح كە تەنیا گرینگی دەداتە ئاین پەروەرو لایەنگرانی خۆی تا رزگارییان بكات نەك یاخیبووان و ئەوانەی بڕوایان بە ئاینەكەی نییە، وە ناوی نوح لە سۆمەریدا بە (ئۆتۆناپشتیم) هاتوە، بەلام لە تۆفانی نوح كوڕی خۆشی هەڵناگرێ كە یاخییە كە دەچێتە سەرچیایەكی بڵند وا دەزانێ كە ئاو نایگاتێ. كەواتە لافاوەكەی یان بەفربارینەكەوی زەردەشت هزرێكی چیاییە جیاوازە دەشتایی و بیابانی نییە چونكەلە چیادا ئەو لافاوە هەڵناستێ ناوچەكە هەموو بخنكێنێ وەك ئەوەی لە خوارووی ئێراق یان لە ئێراقی كۆندا رووی دەدا بەڵكو بەفر گوندو شارو چیاو هەموو ناوچەكەو ژیانی دادەپۆشی لەجیاتی ئاو ئەمەش بەڵگەی چیای ئاینی زەردەشتییە[١٧٤] كە شوێنی سەرهەڵدانی ناوچەی ئارومێ ئورمێ رەزاییەی ئێستایە، بەلام بۆ مەسەلەی كاریگەری قۆچی (گا) لەسەر كورد یان قۆچ بە گشتی ئێمە ئەو نەریتە دێنینە بەرچاو كە كاتی خۆی تاكو ئێستاش یان قۆچی گا یان قۆچی مامز یان قۆچی بزنەكێوییان لەسەر دەرگای ماڵەكانیان هەڵدەواسی، بۆ دوور خستنەوەی چاو و زاروو شەڕو نیگبەتی، كە ئەمەش كاریگەری قۆچی گایە دەگەڕێتەوە بۆ گوتی و گاوە و گاپەرستی رەگی ئاینی كۆنی هینیدی وە قۆچی لەسەر نانیش لەلایەن مەلیك و خواوەندەكانی سۆمەری هەمان مانا دەبەخشێت.

---

(١٧٣) بڕوانە لێكۆڵینەوەیەكی تایبەتیمان لەسەر ئەم بابەتە بۆ زێدە زانیاری لە كوردستانی نوێ ژمارە، ١٢٦٩، ٢٦/٨/١٩٩٦.

(١٧٤) هەمان سەرچاوە، ل٣٦-٣٧.

بەڵام لەدوای دۆزینەوەی ئەسپ یان ماڵی کردنی ئەسپ وبەکارهێنانی لەلایەن ماناکان و میدییەکان، ناوی ئەسپ وەك پاشگر و پێشگر یەکجارزۆر بەکارهاتووە وەك چۆن ناوی شێر لە کوردەواریدا بەکارهاتووە وەك (شێرزاد، شێرکۆ، ئەردەشێر  هتد) بەڵام لەکاتی زەردەشت ئەم جۆرە ناوانەمان بەرچاو دەکەوێ وەك ناوی باوکی زەردەشت (ئورشاسپ)[١٧٥] (ئور) بەمانای (شوێن + شا) + ئەسپ (ئور + شا + ئەسپ) یان (ئەسپی تاما) یان (جاماسپ) جام + ئەسپ. کە داڵدەی زەردەشتی داوە یان (گشتاسپ)[١٧٦] یان (ئارجاسب) کە لە ئار + جا + ئەسپ پێکهاتووە بە مانای ئەسپی ناوچەکە کینایەیە بۆ بەهێزی و سەرکردەیی. (کاریگەری سۆمەر لەسەر زەردەشت لەم سێ وشەیە بەدیار دەکەوێ هێزی ووشەی سۆمەری ئەمەیە (نا) هزر ناوەرۆك  هەناو. وشەی (گو)تە[١٧٧] ناو (نام) بە کوردی فارسی کە هەمووی کوردییە لەگەڵ سێ وشەی پیرۆزی زەردەشت یەکتر دەگرنەوە ١. ڤوهوما (نا) ٢. ڤوهو (گۆتا) ٣. ڤوهو (ڤرشتا)  هزرو مانای چاك  ٤. گوتنی چاك رەوشتی چاك یان کردەوە.

## ئاینێك پێش زەردەشت کە ئاڤێستا باسی دەکا ناوی (گاڤ)[١٧٨] بووە.

(١٧٥) ڤاندیداد، ل١٣،٢٩. یان پەراوێز ١٥ ئەسپنتو.

(١٧٦) تاريخ ايران، از اغاز تا انقراضي قاجاريه، ل٢٥٤–٢٥٥.

(١٧٧) خزعل ماجدى  متون سومريه، ص٢٥٦. الفكره (نا) الكلمه (گو). الاسم (نام) کە هەمووی کوردییە

(١٧٨) ڤانديدات، ل١٥، و. د. داود الجلبي الموصلي، ١٩٥٢، ناوی پیاوانی ئەم ئاینە، (گاڤی) بووە، کەواتە ئاینەکە گاڤ بووە، لێکۆڵینەوەکەی ئێمە بێگومان دەکات.

کە دەوری گا لەکاریگەری ئەم ئاینە و هزرە بە دیار دەخا لەو سەردەمەدا، بۆیە ئەم دەورە ئەگەرچی دەوری گا کەم دەکاتەوە لە پێش هاتنی ئەسپ بۆ گۆرەپانی ژیان و شەڕو هاتووچۆ کە بە رای ئێمە لە هەمان کاتدا پاشەکشەی ئاینی گاپەرستییە بەڵکو دیارە گاڤییەکان یان گاویەکان دژی زەردەشت وەستاون وە لە پێشەکییەکەی ڤاندیداد هاتووە کە چۆن ئاڤێستا بە ناوی گاڤی ناویان دەبا یان گراپانی گارانبانی کە زۆر بە توندی لە رووی زەردەشت وەستاون بە ئاشکرا هەست بە ناوی (گاڤی) دەکەین کە ووشەکە هەمان ناوی (جاڤی) (جاف)ە گاڤا نییە پاڵپشتێکی بەهێزی بۆچوونەکەمانە کە لە دواترین کاتی چاپکردنی ئەم لێکۆڵینەوە هەستمان بەم ناوە کرد چونکە حیسابمان بۆ پێشەکییەکە نەکردبوو. هەروەها گرابانی کە چەند نزیکە لە گابانی جابانی گاوانی هەمان رەگە لەگەڵ جاف و گاف و گاف سواری کاوە و کابیان ئەمە رێککەوت نییە بەڵ:و دۆزینەوەی ئاینی گاپەرستی رەگ هیندییە کە دەکەوێتە پێش سەردەمی زەردەشت و هەخامەنشییەکان کە زێتر لە چەندین سەدە لە پێش واتا لە پێش ٢٥٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا پێشتریش کە سەردەمی میدییەکان بوو بەمە لەگەڵ ناوی جاڤ ئێستا و جابانی سەردەمی عەباسییان و گاوانی پێش ئیسلام یەکتر دەگرنەوە جگە لە دۆزینەوەی حەلقەیەکی تری سەرچاوەی کاوەی گوتی و ئەژدیهاك و سەردەمی سۆمەر و پیرۆزیی گا دەگەڕێتەوە بۆ ٤٢٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا کەواتە مەبەستمان لە ٤٢٠٠ ساڵ خوارترە نەك سەرووتر کەواتە ئەوانە پاشماوەی گوتییەکانن یان گودابیەکان یان گاوانییەکان هەر ئەمەش کە تا ئێستا وا باوە لە نێو کوردانـدا جیهان لەسەر قۆچی (گا) وەستاوە کە بەڵگەی ئەوەیە خواوەندێکی کۆن بووە لە لای ئەوان قۆچی سەردەرگاکانیانیش هەر کاریگەری ئەوەیە وەك ماری تەك دەرگای پەرستگای ئێزیدییەکان کە ئەویش کاریگەری مارە لەسەر هزری کورد.

## ماری سەر سەری خواوەندە فیرعەونییەكان

### قولایی سمبولی خواوەندە(مار)ەكانە

بەڵام مەسەلەی ماری سەر نێوچەوانی فیرعەونییەكان كە بەڵگەیەكی زۆر گرینگە لە نێوان ماری سەر شانی خواوەندەكانی ناوچەی سۆمەر و بابل و ناوچەی نیل كە بە رای من كاریگەری ناوچەی سۆمەرە لەسەر نیل وەك چۆن كاریگەری رووباری (سند)ە لەسەر چوار رووباری دیجلە و فورات و كەرخە و كارون چونكە مارەكە لەسەر شێوەی ماری (كۆبرا) دروست كراوە كە ئەم مارەش شوێنی هیندستانە، كەواتە كاریگەری هیندۆ ئەورووپیە بەسەر سامییەكانەوە. بەڵام مانای ئەوە نیە لە لای ئارییەكان مار پیرۆز ببێت وەك لە لای ئەوان جۆرە تایبەتمەندییەكی هەبووە كە بەڵگەی حاشاهەڵنەگری جۆرە پیرۆزییەكە لە لایان. ئەوەی جێگای سەرسامیە مارەكەی سەر شانی ئەژدیهاكیش هەمان (تەنین)ی وڵاتی چین و رووباری (سند)ە بەم جۆرە پەیوەندی نێوان هەڵقەكان ئاشكراو روونتر دەبێ كەوا ماری سەرشانی ئەژدیهاك ناسنامە و ئاماژە بە شوێنی ناوچەی رووداوی كاوە و ئەژدیهاك دەكات سەردەمەكەش دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی گوتی سۆمەری ئەمەش زێتر پاشماوەكانی (گودیا) بەرجەستەو بەدیار دەخا شانبەشانی بەڵگەكانی دیكە كە تەواوكەری یەكترن بەتەنیا بە گوڵێك بەهار نایەت، وە ئێستاش گاپەرستی و پیرۆزی (گا) لە هیندستان هەر ماوە كە قولایی (ئایندان) و شوێنی ئاینەكان و ئیندیای هیندییە كە نەبوونە ئیسلام. هەردوو پیتی بسماری و هیندی ـ چینی پێك دەچێ. وەسفی ئەژدیهاك لە ئاڤێستادا لەگەڵ وێنەكەی ئەژدیهاك لە سەردەمی سۆمەری گوتی دا یەكتر دەگرنەوە ـ لەگەڵ ئاینی گاڤی و بارامییەكانی گاوانی.

<u>دەقەكە دەڵێ: ((ئەو هێزی زاڵبوونە (فەرەیدون) هەیبوو و توانی (ئاژدیهاك) كە خاوەنی سێ قەپۆز سێ قیپۆز و سەرو شەش چاو و هەزار چەشنە فێڵ تەڵەكە بوو شكەست بدات لە كردەی پانزدەهەم دەڵێ:</u>

بەهرام بەرەكەت بدات بەم ماڵەو كەڵلەی گای تێدا بێت)) بەهرام بەشت ل١٩٤- ١٩٥ ئەوێستانامەی مینەوی زەردەشت و. عومەری فاروقی سەیری سێ سەر كە راست لەگەڵ وێنەیەكی سەردەمی سۆمەر یەكتر دەگرێتەوە چونكە سێ سەرە مێشكی دوو گەنج دەخوا. هەروەها وشەی بارام (بەهرام) و بارامی گاوانییەكان لە ناوچەی دوو رووبار و بارامییەكان لەگەڵ (كەڵلەی گای تێدابێت كە پیرۆزی (گا) پێشان دەدا بە تایبەتی كەڵلە قۆچی. ئایا بەڵگە لەمە بەهێزتر هەیە بۆ ئەم هەموو پەیوەندیە مێژوویانە و ئاینی گاڤی و سەبردەی سەرچاوە نەورۆزو كاوە لەگەڵ هەموو هەڵقەكانی دوایی خۆی و سەردەمی گووتی و سۆمەری هاوبەش هەر تەنیا ئەم بەڵگەیە بە تەنیا جێگای هەموو بەڵگەكان دەگرێتەوە. كەواتە گاوە (گا) دژی ماری سەرشانی ئەژدیهاك (ننكشیزیدا)و ماری سەرشانی وماری گلگامشی ژێر ئاو كە نەیهێشت گوڵی نەمری بخوا كە خواردنی خواوەندەكانە لە زەردەشتیشدا ئەو مارەش كە ماری ئیاوی پێدەڵێن ئەهریمەن دروستی كردووە بۆیە نەفرەت لێكراوە تاكو ماری ئەهریمەن سێو یان گەنم دەرخواردی دایكە گەورەو باوكە گەورە دەدات بەهۆیەوە لە بەهەشت دەركرا مانەوەی ئەو ئەفسانانە مانای رەسەنایەتی كوردە میراتگری سۆمەرو ئیراقی كۆنە پێش هەموو گەلانی ناوچەكە.



ماری سەری فیرعەونی‌خواوەند



فردوسی (بەهەشتی) تەوراتی لە نەخشە قورینەیەكی سۆمەریدا چۆنیەتی خواردنی گەنم یا سێو بەهۆی تەفرەی(مـــــار)ەوە وەدەركردنیان لەبەهەشت سەیری ماری دەستە چەپ و گەنم و سێوی نێوان باوك ودایكی یەكەم بكە

# کاریگەری جەژنی (نەرۆزی) سۆمەری گووتی هاوبەش لەسەر جەژنی سەری ساڵی (بابلی) دا:

١- ئێمە باسی ئەوەمان کرد چۆن پاشـای هەخامەنشیان دەچووە بابل بۆ ئەوەی (دەسـتی خواوەنـدی (مـردۆخ) بگـرێ) لـەکاتی یادکردنـەوەی جـەژنی نەورۆز[١٧٩].

٢- وە جەژنەکـەش ئـەو کاتـە تـەنیا لـەبابل وەك جـەژنێکی ئـاینی یـادی دەکرایەوە بۆ ئـەوە هـەموو سـاڵێك لـە مـانگی نیسـاندا بـۆ مـاوەی چـوار رۆژ ئاهـەنگ دەگـێڕدرا قوربـانی سـەردەبڕدرا بـۆ ئـەوەی پێشـکەش خواوەنـدی (مرۆخ) بکرێ[١٨٠]. بۆیێ پاشای هەخانشیان دیارە بۆ ئاهەنگ گێڕان دەچووە بابل. هەروەها پاشای ئاشوور لە دواتر.

٣- ئەمەش نەریتێك بووە مەلیکەکانی ئاشووریش گرتۆتەوە بچنە بابل لەوانە سەرجۆنی دووەم (٧٢١-٧٠٥)پ.ز. کە چووەتە بابل بەشداری جەژنی سـەری سـاڵ بکـات و دەسـتی (خواوەنـدی مـردۆخ بگـرێ)[١٨١]. کەواتـە ئەمـە وەك جـەژنێکی (حـەج) بـووە لـەلایان قوربانیـان پێشـکەش دەکـرد سـەرجۆن لـــە دەقێکدا باسی ئەوە دەکات چۆن چووەتە بابل دەسـتی خواوەنـدی مردۆخـی

(١٧٩) بڕوانە نەورۆز در کردستان، لەم پەڕاوەش ئاماژەمان پێ کردووە.

(١٨٠) بڕوانە شانەدەر ژمارە (٢) ١٩٩٧م احتفالات عید راس السنة البابلیة، محمد صـالح زێبـاری یـان، الاعیاد والاحتفالات، حضارة العراق، علي فاضل عبدالواحد یان الحیاة الیومیة في بـلاد بـابل وآشـور، جورج کونتیونو.

(١٨١) هەمان سەرچاوە، شانەدەر.

گرتـووە)[١٨٢] چـۆن خـانوی (ئـەکیتو)ی ئـاوەدان کردۆتـەوە کـە دەکەوێتـە دەرەوەی قەڵات سنووری شاری ئاشوور تەنانـەت ئاشـوورییەکان زۆر جـاوان خواوەندی (مردۆخ) یان دەبردوەتە شاری ئاشوور.

٤- کەواتە ئاهەنگی جەژنی سەری ساڵی ئاشووری لـەدەرەوەی شـار دەکـرا. نەك وەك (بابل) لە شــەقامی تایبـەتی ئاهـەنگ دەگـێڕدرا. کـە لـە شـارەکانی (نفر) و (وەرکا) و (کوتی) و (کیشی) پەیکەرەکان دەبردرانە ئەوێ بۆ ئاهەنگ گێڕان (پەیکەری خواوەندەکان).

٥- ئاشوورییەکان: بە جـەژنی سـەری سـاڵیان دەگـوت زکمـوك Zagmuke بـە ئەکەدیش پێیان دەگوت ئەکیتو Akitu. دیار بە سۆمەریش ناوی خۆی هەیە و بە کوردیـش پـێی دەگوتـرێ نـەورۆز. کەواتـە لەهـەر سـەردەمێك ونـاوێکی هەبووە. ئەم جەژنەش لە شارەکانی سۆمەری دەکراوە وەك (ئور) (ورکا) لـە کژی (بەهار) و پـایزدا. کەواتـە لـەو سـەردەمە بـووە کـە سـاڵ دوو کـژ بـووە زستان و هاوین دوو جەژنیشان هەبووە وەك ئارییەکان یـان زەردەشـتییەکان لە دواتردا کە جەژنی (نەورۆز) و مهرکان بوو. کە کاریگەری پێـوە دیـارە کـە ئەمەشـیان دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمی سـۆمەری هاوبـەش، لـە دواتـر بـابلی ئاشوورییەکان لەوانیان وەرگرتووە. جەژنی بەهار جەژنی ژیان و خێروچـاندن و دروسـت بوونـە کـە سـەرکەوتنی خواوەنـدی خـێرە بەسـەر خواوەنـدی شەڕ[١٨٣]. ئەوەی سەیرە شوێنی ئاهەنگەکە کە لە دەرەوەی سنوری قەڵا بوو لە شوێنێك پێیان دەگوت خانووی ئەکیتۆ Bitakiti[١٨٤]. بە جــەژنی بـەهار

(١٨٢) هەمان سەرچاوە، شانەدەر. بۆ زانیـاری خواوەنـدی مـردۆخ و مەسـەلەی حـاموراِبی وەك بـوت بـوون لەبـەردی رەشـی بریقـەدار دروسـتکرابوون دەسـتیان لێ دەدان. لەلایـەن بـوت پەرسـتان پیرۆزبووە. ئێستاش زۆریان لە مۆزەخانەکانی جیهان ماون.

(١٨٣) هەمان سەرچاوە، شانەدەر (٢) یان طه باقر و فرنسیس، قصه الخلیقه. سومر (٥) ١٩٤٩ ص١، ٣٦، ص٣١٤-١٦.

شوێنێك پێیان دەگوت خانووی ئەكیتۆ Bitakiti[١٨٤]. بە جەژنی بەهار لەسەرمای زستان و بە جەژنی پایز لەگەرمای هاوین رزگارییان دەبوو. جەژنەکە لە چوار رۆژی یەکەمی نیسان دەگێردرا. قوربانی پێشکەش دەکرا ئاهەنگی ئاینی سازدەکرا بەردی تایبەتییان دەدایە هونەرمەندان وێنەی لێ دروست بکەن. لەم دوو پەیکەرانە جلی سوریان لەبەردەکرا ئەو دوو پەیکەرەی هەریەکەو مارو دووپشکی لەدەست بوو تا لە رۆژی شەشەمی نیسان سەریان دەبرین بەرامبەر پەیکەری خواوەندی (نابۆ) و مردۆخ دەخرانە ئاگر لێرەدا مەلیك دەوری خۆی لە رێکخستنی ئاهەنگگێراندا هەبوو. کە خۆی بە نوێنەری خواوەند دەزانی[١٨٥].

بە ئاشکراش کێشەی نێوان هێزی خێرو شەڕمان بۆ بەدیار دەکەوێ ئەویش بە سوتاندنی هێزی شەڕ و فڕێ دانە نێو ئاگر بەرامبەر بە خواوەندی (مردۆخ) کە ئەمەش بە جەهەننەم سپاردنێکە. کە سوتانە هەمان سەرکەوتنی کاوەیە بەسەر ئەژدیهاکە کە مار لەسەر شانەکان کە ئەو دوو خواوەندی دەسوتێنرێن کە بەدەستێك مارو بە دەستێك دووپشکیان گرتووە[١٨٦].

ئەمەشیان سەرکەوتنی خواوەندی (نابو) یان دادەنا بەسەر شەڕاوییەکان لێرەدا رایەکی دیکەمان بەرچاو دەکەوێ ئەویش باسکردنی قەمبێزی هەخامنشی کوڕی کۆرشە کە چۆن چوەتە (بابل) بەشداری ئەم جەژنانە یان بکات لە ساڵی (٥٥٩–٥٥٣پ.ز)[١٨٧]. کەواتە نەورۆزی هەخامەنشیان بۆ نەریتێکی کۆنتر

---

(١٨٤) هەمان سەرچاوە.

(١٨٥) هەمان سەرچاوە.

(١٨٦) هەمان سەرچاوە، لا٥٥، شانەدەر (ژمارە شەشەم).

(١٨٧) هەمان سەرچاوە.

دەگەڕێتــەوە وەك نــەریتی بابلیــانیش ئــەویش جــەژنی بــەهار و لـــەناوبردنی ئەژدیهاك)ی سەردەمی گۆتی و سۆمەری هاوبەشە کە (گودیای گاوەیە).



## بەڵگەیەکی گرنگ:

خواوەنــدی بــابل و تیشــکی سەرشــانی- کاریگـــەری دوومـــاری سەرشـــانی خواوەنـدی ئەژدیهاکی ســۆمەری و ئەکـەد قۆچـی سـەری نــرام ســن و مــاری لێچەوانی فێرعەونیـەکان پـاش گۆرانکــاری و لــەناوچونیان پــەیوەندی یــەکی گرینگی لاسایی کردنەوەی ماری سەر شانی ئەژدیهاکە بە جۆرێکی دیکە.

# توندو تیژی و کۆیلایەتی لەیاسای بابلدا

ئێمە لێرەدا هەندێ لە یاسکانی حامورابی دەخیەنە بەردەست وەك نموونە بۆ یاسایەکی توندو تیژوو پڕ لە کۆیلایەتی و بەندایەتی بۆ کۆیلە وخاوەن کۆیلەکان کە (حوکمی چاوبەچاو ودان بە دان)ی سەرەتاییە.

لەنێو کۆمەڵگایەکی بوت پەرست و کۆیلایەتی کوێرانە بۆ خواوەندو پاشاکانیان. کە پاشاکانیان بە خواوەند دەزانی وەك فیرعەون.

ماددە ١٩٦: ئەگەر گەورەیەك چاوی کوڕی یەکێك لە کەسایەتییە ناودارەکانی دەرهێنا دەبێ چاوی دەربهێنن.

ماددە ١٩٧: ئەگەر ئێسکی گەورەیەك شکاندرا دەبێ ئێسکی بشکێ.

ماددە ٢٠٠: ئەگەر گەورەیەك ددانی یەکێکی لەچینی خۆی دەرهێنا دەبێ ددانی دەربهێندرێ.

ماددە ٢٢٩: ئەگەر بەنایەك خانوویەکی دروستکرد تەواو نەبوو روخایە سەر خاوەن ماڵ بووە هۆی کوشتنی دەبێ ئەو بیناسازە بکوژرێتەوە.

ماددە ٢٣٠: ئەگەر بووە هۆی کوشتنی کوڕی خاوەن ماڵەکە دەبێ کوڕی بیناسازەکە بکوژرێتەوە.

لەتەورات هەمان مانا چاو بەچاو ددان بە ددان و پێ بە پێ برین بە برین و رازی بوون بە رازی بوون هاتووە. خروج ٢١/(٢٣-٢٥).

ماددە ١٩٥: ئەگەر کوڕێك لە باوکێ دا دەبێ دەستی ببڕن.

ماددە ٢٢: ئەگەر گەورەیەك دزی کرد وگیرا دەبێ بکوژرێ.

ئـەم یاسـایەنەش وەك لـە سۆمەری وەریگـیرابوون کاریـان لەفەلســەفەکانی دوای خۆیان کرد وەك دیار و ئاشکرایە بۆ رۆشنبیران[١٨٨] .




## ئـــەژدیهـــاکی بابـــل

**بەڵگەیەکی دیکەی گرنگ:**

خواوەندی (بابلی) و (ماری سەرشانی).

---

(١٨٨) اثر المدونات البابلية في المدونات التوراتية، الاب سهيل قاش، ل٢٩–٣١.

# هەندێ تێبینی گرینگ بۆ پاڵپشتی بۆچوونەكان

١- (ئەژدیهاك) هیچ پەیوەندییەكی بەناوی دوا شاهی (میدییەكانەوە نیە)؟ ئەو ناوەی كەوا فردوسی لە (شاهنامە) باسی كردووە لەشێوەی ناوی كە لە ئاڤێستادا) هاتووە بەشێوەی (ازی دیهاكە) لە راستیدا وەك د. جمال رشید ل٢٠٥ لە كتێبەكەی لقاء الاسلاف دەڵێ ئەم ناوە لە (ئاستیاك) ەوە نەهاتووە كە هیرادوت تۆماری كردووە. كە لە نووسینەكانی بابلی بەشێوەی (اشتوفیكو) هاتووە كە ناوی دوا مەلیكی میدییەكانە. كەواتە سەرەرای ئەوەی كە من وتومە هەر رووداوێك كە باس بكرێ لە دوای رووداوی گودیا و ئەژدیهاكی سۆمەری گووتیی هاویەش بە لاساییكردنەوە دەژمێردرێ و رەسەن نییە، لێرەدا بەم دەقە بۆمان رۆن دەبێتەوە نەورۆز هیچ پەیوەندییەكی بە سەردەمی هەخامەنشیانەوە نییە كە لەوسەردەمەدا رووی دابێ بەڵكو بۆمان ئاشكرایە وەك بەڵگە مەلیكی هەخامەنشی دەچووە (بابل) بۆ پیرۆزیی یادكردنەوەی نەورۆز كە بەڵگەی پەیوەندی و سەرچاوەی نەورۆزە لە بابل جا بە هەرجۆرە ناوێك یادكرابێتەوە یان دواتر هەرجۆرە ناوێكی لێنرابێ تا ناوی ئێستای كە نەورۆزە یان هەرجۆرە ماناو زیادەییان هاویشتبێتە سەر چیرۆكەكە وەك فەرەیدون و ناوی دیكە و باس وخواسی دیكە و ئاگرو جۆری یادكردنەوەی لە كوردستان و شوێنەكانی تردا بە درێژایی ئەم مێژووەی كە زێتر لە ٤٠٠٠ ساڵە.

٢- ئەكەدییەكان كێن؟ ئینقلابی سەرجون ئەكەدی چۆن بوو؟ نرام سن: چیرۆكی سەرجۆن بە چیرۆكی كاوە دەچێ كاتێ مەلیكی سۆمەری دەگرێ و بەندی دەكات و پاشان دەی كوژێ وەك كودەتایەك كە لەرەسەندا سەرجۆن ئەكەدی تەنیا ئەفسەرێك بووە ئەكەدی لەنێو سوپای سۆمەریدا ئەمە بەڵگەی فرەنەتەوەییە لەناوچەكەدا. بڕوانە ئەكەد، سومر فنونها وحضارتها. جگە لەوەی كە بەڵگەی قولاییە سەرچاوەی كاوە و ئەژدیهاك و سەرهەڵدانی كە دەگەڕێتەوە بۆ گوتییەكان لەناوچەی سۆمەرو بابل

و هەست بە دووبارەبوونەوەو لاسایی کردنەوەیەك دەکەین کە ئەم جۆرە رووداوانە کۆنن.

٣- پێشەوای دیاریکراوی سۆمەری لەجیاتی ناوی خۆی بەنازناو دەناسرا وەك ئورکیش = بە زمانی سۆمەری بە واتای = ئور + کیش یانی = کەسی + ئور. کەسایەتی ئور کە مەبەستمان پادشای ئورکیشە. ص١٠٣ لە فازیل قەرەداخی مێژووی دێرینی کوردستان ئەم وشەیەم وەرگرت.

من لێرەدا هەست دەکەم کیشی یان کاسییەکان رەگی لە ووشەی (کەس) ی کوردییە. ئور = بەمانای (ئار) شوێن دێت وەك ئورمی کە (ئارومی)یە هەروەها (ئور) لەتەوراتدا بە (ئاروك) ناوی هاتووە یان ئوربیلم و اربیل زۆر ئاساییشە پیتی (س) لەگەڵ (ش) جێگۆرکێ بکات لەشێوەیەك بۆ شێوەیەکی دیکە لە زمانی کوردی یان زمانی ناوچەکە. وەك (ئاسوری) (سوریە) ئاشوری. ئاشوریا سوریا. زەردەئوشترا زەردە ئوسترا. ئەستێرەی زەرد. کینایە بۆ ئەستێرەی (خۆر) رۆژ کە ئەستێرەیەکی زەردی گەورەی رۆژە کە ئەستێرەیەکی زەردی گەورەی ئاسمانە.

کەواتە (کەس) هاوڕەگە لەگەڵ ووشەی (کێش)ی سۆمەری وەك چۆن وشەی (En) بە سۆمەری کە هەمان مەبەست ومانای (ئاین)ـە بە کوردی. (endan نازناوێکی ئاینی و سەرکردایەتی بووە ل١٠٣) هەمان سەرچاوە.

بۆی هەیە ئیندی (هیندی) لە ئایندانەوە هاتبێ شوێنی ئاینەکان کە ٤٥٠ ئاین و مەزهەبی لێیە؟!

تەنیا لە خوارووی لێوارەکانی خوارووی چوار رووباری زاگرۆس گامێش دەژیا یان گاو گۆلك. رووبارەکانیش ئەمانەن گارون- (گاروند) گا + رووبارەوە هاتووە (کەرخە) دیجلە فورات بۆیێ لە بیابانی رۆژئاوای فورات گاو گامێش نـاژی کە بیابان و شوێنی عەرەب بوو کەواتە شارستانیەتەکە کە تەواوکەری

شارتانییەتی هیندستان و هیندو ئوروپییەکانی خوارووی زاگرۆسە یان کوردە گوتییەکان وکیشییەکان و ئیلامییەکان کە (گا) پێش ئەسپ بۆ سواربوون و گواستنەوە بەکارهاتووە جگە لەپەرینەوە لە (ئاو) بۆیێ جۆرە پیرۆزییەکی دراوەتێ ژیانیان هەمووی لەسەر (گاو) مانگا بووە وەك لە هیندستان روباری سند) تەواوکەری یەکی پیرۆزی خۆی ئێستاش ماوە لە خوار ئەم رووبارانەش رووباری (هندگان) هەیە لە ئێران (شوێنی هیند) کە وەك رێگایەك خۆشبکا بۆ شەپۆلەکانی هیندوو گامێشەوانەکان بەرەو لێواری خوارووی چوار رووبار هەڵبکێشێ لەوانەش خوارووی دیجلە و فورات.

٤- رووباری دیجلەو فورات سنورێکی سەخت بووە لەپێش پەرینەوەی سامییەکان بۆ رۆژهەلات. هەروەها بیابانی رۆژئاوای رووباری فورات بەرامبەر بە ئارییەکانی هیندو ئەورووپی. بۆیێ ئەم شارستانیەتە هەموو قەرزاری هەرچوار رووباری چیاکانی زاگرۆسی کوردەوارییە.

٥- کردنیاش = ناوێکە بە ولاتی (بابل) دەگوترا (ل٩٨ ئاشوور پانیپال، سیرتە ومنجزاتە، د. ریاض عبدالرحمن امین الدوري).

کە ووشەی کوردی تێدا بەدی دەکرێ بەلام بەلگەیەکی قەناعەت پێ کراوم دەست نەکەوتووە یان دەرفەت بۆ لێکۆڵینەوەی ماناکەی. بەلام لەبەرئەوەی ئەو رایەی کە گوتی پێش سۆمەری لەناوچەی بابل و ئارۆك ژیابن، بابل لە (بان بل) هاتبێ پاشان خواوەندەکەی بەناوکرابێ خواوەندە (بل) نیسبەت بە شارەکە (بل) بەکوردی (الارض الخصب او الناعم الزراعي، مثل: اربل المكان الخصب).

٦- لە کتێبی طوایف وعشائر کرد- سندی جالب از روزکار ناصرلدین شاه قاجار هاتووە (ئەو هۆزانەی لە خاکی جوانرود (گاوانرود) ماونەتەوە پاشماوەی جافەکانن) ل٢٤، هەروەها دەڵێ باباجانی لەسەرجافەکان مەحسوبن، لەگەل

رغزاوی، گلالی، یەزدان بەخشی میکایلی نورولی ئەوەی بەدی دەکرێ گوندی (گاومێشان) کە لە (گامێشەوە هاتووە) گاو + مێش . یان (گاورود) لە گاو + رود هاتووە کە مانای رووباری (گا) دێت گا حرف (گافە) گاف– جاف هەمان مانای هۆزی جاف هەمووی پاشماوە دەگەیەنێ، ل٢٨ کە گەرمەسێریان بووە گاوانیەکانیش هەمان شوێن پێشتریش گوتییەکان گوتی جودی گاودی گاوە (کاوە).

## ناوی ئاشوور، ئاقوور

١– لە کتێبی اثر المدونات البابلية في المدونات (التوراتية) ئەبو سهيل قاشا ص٢٩٧ هاتووە: ئاشوور ناوی شارێکە خواوەندی ئاشووری بەناوکراوە بەنیسبەت شارەکە رەگی ووشەکە دیار نییە نەزانراوە نە ناوێکی سۆمەرییە نە سامی ماناشی نەزانراوە)) (ئاشوریتو) لە شاری ئاشور یان (نینوی) یەکەم جار لە نوسینەکانی ئوری سێهەم وەك خواوەندی سامییەکان لە شاری ئاشوور ناوی هاتووە. کەواتە دەتوانین بڵێین کوردیە لە باشوور و باکوری کوردی نزیکە بە مانای سەرێ و خوارێ چونکە ئاقور (ئاکوری) بەمانای سەرەوە دێت لێرەدا هەمان مانای (جێی زێرە) جەزیرەی فارسی کوردیە بە ناوچەی موسل میثبالویان دەگوت بە مانای خاکی خواروو بە ئارامی لێرەدا هەرسێ ناویەك مانا دەدەنەوە میسل میثبالو زیرە باشور نیسبەت بە زۆزان و چیاکان عەرەب تەعریبی کردووە بە موسل جزيرە کە شوێنەکە جەە زیرە نیە جەزیرەیە جێزیرە بۆ کۆچەرەکان بۆ زێدەزانیاری بڕوانە گۆڤاری خازر ع.س بەرای من شاری (بابل)یش بەهەمان شێوە ناوی شارکە بووە خواوەندەکەی بەناوکراوە کە (بل) ە.

* ناوی (نوح) لە قۆناغی سۆمەریدا بە (ئۆتۆناپشتیم) هاتووە، ل٥٩ هاورێ باخەوان، کوردستان نیشتمانی یەکەمینی سۆمەرییەکانە.

* ننكرسو / اله لكشي (الراعي) ل١٨٧، سومر فنونها وحضارتها.
* ناوی گوتییەکان بەشێوەی (ئوتویان، ئودیان، ئودینان، ئاتینان هاتووە ل١٧٢ن ١٦٨ میدیا دیاکوف، کەواتە ئودیا (جودیا) گودیا بەرای من گوتیا بە مانای کاوە گاوەیی دێت لە کتێبی خشتەکانی شمارە یورکین لیو. عەزیز گەردی ل٥٣ بە (گوتها) هاتووە. وە صالح قەفتان بە (جودی)[١٨٩] یش تۆماری کردووە.
* ل٢٥٢ سومر فنونها وحضارتها، مەبەستی گوتییەکان تەنها مانەوە بوو. بە واتای جێنشینبوون لەناوچەی سۆمەر کە زستان هەواری کۆچەرانی زاگرۆسیەکان بوو.

کەواتە سەرەرای ئەوەی کە من وتوومە هەر روداوێك کە باسبکرێ لە دوای ئەمەو، ودوای گودیا ئەژدیهاکی سۆمەری گوتی هاوبەش بێت بە لاسایی کردنەوە دەژمێردرێ و رەسەن نیە. لێرەدا بەم دەقە بۆمان رۆن دەبێتەوە نەورۆز وکاوە هیچ پەیوەندییەکی بەسەردەمی هەخامەنشینانەوە نیە. بەڵکو وەك باسمان کردووە. مەلیکی هەخامەنشی دەچووە (بابل) بۆ پیرۆزی یادی نەورۆز کە بەڵگەی پەیوەندییە لەگەڵ بابل دایە جەژنەکەش لە دسەردەمی هەخامنیشان کۆنترە تا دەگاتە سەردەمی گووتیەکان و سۆمەر.

## گۆران وگاوران

ئەگەر ئێمە لە زاراوەو ناوی گۆران وردبینەوە کە لە هەمان شوێن نزیك جافەکان دەژین هەمان شوێنی مێژوی گوتییەکان. ناوەراستی کوردستان. هەست دەکەین ناوی گۆران نزیکە لە ناوو وشەی کۆنی گاوران. کە پێشتر ناوچەکە هەمووی بە نیسبەت موسڵمانان گاور بوون. بەڵام ئەگەر وردبینەوە دەبینین ئێستا

(١٨٩) مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمرۆ، صالح قەفتان، بابەتی گوتییەکان.

كە گاور بەو كەسانە دەڵێن كە ئیسلام نین غەیرەدینن. لەتەك ووشەی (فەلـە) كـە بۆ دیانـەكان بـەكاردێت شـان بەشـانی ووشـەی (دیـان و جـوو) كـە بـۆ دوو ئـاینی مەسیحی و عیسایی بەكاردێت. بۆیـە ووشـەكە لـەوە كۆنـترە كـە ئێمـە چـاوەڕێی دەكەین تەنانـەت بـەرای مـن دەگەڕێتـەوە پێـش زەردەشـت كـە دەبـێ بـە (گـبر) گاپەرسـتەكانیان گوتبـێ وەك ناوەكـە یـان ووشـەكە خـۆی لـەخۆیدا ئـەم مانایـە هەڵدەگرێ (گاور) (گا+وەر) بەمانای گاوەران = لەسەر كێشی جەنگاوەران دلاوەر كـە لـە جـەنگ + یـاوەرە وە هـاتووە هـەروەها دلاوەران بـەمانای دلـێرو ئـازاد ونەبەرد هاتووە.

یان لەسـەر شـێوەی (پـەروەر) كـە لـە پـەروەردە كردنـەوە هـاتبێتزن وەك شڤان پەروەر- گاپـەروەر ئـەو كەسـەی گـا گـەورە دەكـا و پـەروەردەی دەكـا - گرینگی پێ دەدا- كەواتە (گاوەر) (گاور) لە گا پەروەری گرینگی دان بە (گـا) وە هەیـە كـە دەبـێ ئـاینی پێـش زەردەشـتی و سـەردەمی گوتییـەكان بێـت كـە رەسەنایەتی هێندی پێوە دیارە- بەمـە دەبـێ زەردەشـتییەكان بـەو خەڵكانـەیان گوتبـێ كـە لەسـەر ئـاینی زەردەشـتی نـەبوبێ دواتـر - ئیسـلامیش هـەر بـەو كەسانەیان گوتبێ كـە درەنـگ بوونەتـە موسـڵمان بەتایبـەتی كوردەكـانی قوڵایـی چیاكان كە درەنگ دەستی عەرەبە موسڵمانەكانی گەیشتێ.

بۆی هەیـە ووشـەی (كـافر) لـەوە هـاتبێ نـەك گـاور لـە كـافرەوە هـاتبێ چونكە ووشەكە كوردیە تەنانەت (گاڤ) (گاڤر) (جاف) لەهەمان ووشـە نزیكـە كـە وتمان لە گوتی گودی جودی و گاوەو گاپەرستییەوە نزیكە لەوەوە هاتووە بە رای ئێمە. ئەگەر یەكێ وتی (گاور) بەزەردەشتییەكانیش گوتـراوە ئـەوا دەڵێـن راسـتە لەو كاتانەی زۆربەی كورد بووە بە موسڵمان بە تەوزەوە دەبێ بەو كەسانە وترابێ هێشـتا نـەبون بـە ئیسـلامن بـەڵام لـە راسـتیدا بـە زەردەشـتییەكانیان دەووت (زەندیق-زەندەگی) یان (مەجوسی) كە لە (موغوسی) موغەوە هاتووە بـە مانـای

ئەوانەی سەر بە موغەکانن موغی زرەدەشتی بۆیێ بە رای من ووشەی کافری عەرەبی لە گافر گاور گابر (گبر) ەوە هاتووە کە بەمە گاف، جاف لەهەمان ووشە نزیك دەبێتەوە کە ئاینێکی کوفر بووە بە نیسبەت ئاینی ئیسلام کە هەموو ئاینەکانی جیهانی رەتکردەوە، بەردەوام بوونیش لەسەر پەیرەو وکردنی ئاینەکانی هەموو جیهان بە کوفر دەزانێ. لەوانەش یەکەم بیر و ئوڵی سەروی نیوە دوورگەی عەرەبی کە (نێوان دوو روباری دیجلە و فورات)ـە، یان هەموو ئاین بیروبرِوای ئاینی چیانشینانی زاگرۆس. قەبول کردنی ناوەکەش لەدوای بونیشیان بە ئیسلام بەڵگەی ئەوەیە ناوی پێشتر یان بووە سەردەمی پێش زەردەشت لێی راهاتوون وەك ناوی هۆزێك لەکاتی بوونیان بە ئیسلام کە ناوەکە وەك ئاین نەبووە قەدەغەی بکەن مەبەستم ناو (کاوە) و کابیانی یە.



ئاسمان لە شێوەی گایکی گەورەدا بن زگی پر ئەستێرەو خەڵك لە ژێریەوە هەمان کاریگەرییە لەسەر فیرعەونیەکان

کاریگەری گای (گوتی)ی سۆمەری لە سەر ئاشوریەکان لەسەر شێوەی بوراگ- ئەویان سەری ئافرەت و لاشەی ئەسپە



التصوير رقم ٦(أ)

السماء كما صورها المصريون ايضا على هيئة بقرة يمسكها ... آلهة اخرى وعلى بطنها النجوم وسفينة الشمس ( ادولف ارمان ، ديانة مصر القديمة ) .

# سەربردەی نەورۆز و کاوە
# لە نێوسەردەمە جیا جیاکاندا

وەك ئاشکرایە سەربردەی کاوە و ئەفسانەکەی لە چەند دێرێك و بە کوشتنی ئەژدیهاك تێپەری نەدەکرد نە شوێنی کاوە دیار بوو نە ئەژدیهاك و سەردمەکەی، بەلاّم زۆر چیرۆك و ئەفسانە لە ئارێدا هەبوو دەربارەی نەورۆز و پەیدابوونی. کە چەندین سەربردەی لەسەر نووسراوە وەك کە هەندێکیان دەیگێرنەوە سەردەمی شەدادیان یان رۆژگاری تەهمورث و ئاشکرابوونی(صابئەکان) یان لەسەر تەخت دانیشتنی جمشید و تەختی زێرینی و تروسکە دانەوەی، یان دۆزینەوەی قامیشی شەکر ئەویش لە سەردەمی جەمشیدا کە بریاری داوە ببێتە جەژن . یان لە یەکەمین رۆژی(فەروەردین) وەهاتووە کە سەری سالّ بووە وەك ئەبو رەیحان لە((التفهیم)) دا باسی دەکا یان کاتێ جمشید خەلکی کۆ کردەوە کە پیّیان بلّێ ئەگەر من رۆژێك لە رۆژان زولمو ستەمم کرد رێگای راستم نیشاندەن ئەم رۆژەیان کردوە بە جەژن کەواتە جەژنی نەورۆز دەگەرێتەوە پێش هەخامنشیەکان و سەردەمی گوتیەکان لە سۆمەر، ئەو جەژنەیە کە وەك دەلّێن نەورۆز زۆر لەوە کونترە دەگەرێتەوە رۆژگارەکانی پێش هەخامەنشیەکان کاتێ کە ئاریەکان سالیان بەدوو کژ داناوە کە دوو کژی گەرماو سەرما– کژی سەرما بریتی بوو لە دە مانگ و کەژی گەرماش لە دوو مانگ وەك لە(ڤاندیدات) دا هاتووە بەندی(٢،٣) بە کەژی گەرمایان دەگوت هم hama هما hama کە بە مانای هاوین دێت. کە دیارە دواتر سالّ دابەشکراوەتە چوار کژ.

عبیدوللا ئەیوبیان لە کتێبەکەی نەورۆز در کوردستان(١٩٠) درێژە بە باسەکەی دەدات و دەڵێت: گریمان نەورۆز لە سەرەتادا تەنها بیرەوەرییێکی سادەی سوڕانەوەی ساڵ و مانگ بو بێت.؟ ئەمەش لەگەڵ گەنم چاندن و بەهار هاتنەوە لەلای گوتی و سۆمەری‌بەدیار دەکەوێ وەك سەرەتا.

بایەخ دانە تایبەتیەکانیش بۆ راگەیاندنی کات و ئەنجامەکەی بووە ئەمە راستە کە بەتێپەر بوونی رۆژگار و ئەو گۆڕانکاریەی بەسەر بارودۆخەکەدا هاتبێ. وورده وورده لە شێوە سادەییەکەی ئەستێرە و کاتژمێریەوە دمانباتە دەرەوە، بە هەر حاڵ تاکە جەژنێکی جیهانیە کە کۆ کەرەوەی هەموو لایەنەکانی ئاینی و رەسمی و سیاسی و سروشتیەکانە لە گەڵ هەموو بارو دوخێکی سروشتی ناوچەکاندا رێکەوتووە. ئەم رایە سنورەکان لەبەردەم راستی دۆزینەوە هەڵدەوەشێنێتەوە کە مرۆڤ بتوانی لە نێو هەموو پانتاییەکانی مێژوو سەربەستانە بگەڕێ(١٩١).

بە هیچ سنورێکی ئەفسانە ئامێز نەبێت چونکە هەر سەر دەمێك و جۆرە دیدیك و مانایەکی دیکە دەخاتە سەر تا هەقیقەتی سەرەکی لە نێو ئەم هەموو ئیزافانەی کە بە درێژایی رۆژگارەکان دەخرێتەسەری وون دەبێ. وەك ئەوەی کە ئێستا بە دەستمانەوەیە لە گەڕان بە دوای سەرچاوەی پەیدا بوونی نەورۆز و بوون و نەبوونی کاوە و ئەژدیهاك و کات و شوێنی رووداوەکەیە. من بەمەندە نەوەستام، چونکە تا سەردەمی هەخامنشیەکان سەرو سیمای نەورۆز دیار بوو وەك یادکردنەوەکانیان پاش لێکولینەوە بۆم دەرکەوت لە سەردەمی ئەوانیشا رووی نەداوە یا نەورۆز پەیدا نەبووە بەڵکو هی سەردەمانێکی پێشوو ترە، بەلام لە

(١٩٠) نەورۆز در کردستان بەشی((سەردەمی هەخامنشیان) عبید الله ئەیوبیان.

(١٩١) تێبینی: دەم دەو بەمانای (فم) سەیری جێگۆرکێی (م) و (و) بکە لەکاتی پێویست لە زمانی کوردیدا.

چوونـی شـای هەخامنشـیان بـۆ بـابل [١٩٢] و دوزینـەوەی(گـای) پـاڵ کـەوتوو [١٩٣] پەیوەندی نێوان هەخامنشی و بابل و گوتی و(گاوەم) بۆ بەدیار کەوتەوە.. کە تـا لەدەوری بابلدا بە دوای راستی بگەڕێم و هەمان جەژنی سۆمەری و گوتی و سـەرە سـاڵی هاوبـەش لـە لـەنێو سـەردەمی هەخامنشـیان و پـەیوەندی لەگـەڵ بـابل و ناوچەکە بدۆزمەوە، کە هەمان جەژنی نەورۆزی ئێستای هاوبەشیان بووە.

کەلـە لای هـەموو مێژوونووسـان راوەسـتا و نـەزاندراو بـوو بۆیـی مـن بـە ژوردا هەڵچوومـەوە لەسـەردەمەکانی پێش هەخامنیشـەکان بـەدوای نـەورۆز و سمبولـە کانیدا گەڕام تا سەروو چاوی گەیشتە سەردەمی سۆمەریەکان و سمبولەکانیم یەك لە دوای یەك دۆزیەوە کە هی سەردەمی گوتیەکانە کاتێ ناوچەی سۆمەرو بابلیـان حوکم دەکرد سمبولەکان باسی لە رزگار بوونی چینی کویلە و وەرزێـر و گـاوان وو کاسبکاران دەکەن لە دەستی ئەژدیهاکی سێ سـەرو ئەژدیـهاکی مـار لەسـەر شـان باسی(گودیا) و ئاینی گودیا(کە بە مانای گاوانی)،(گاوە) دێت بە زمـانی سـۆمەری چۆن لە پاش مردنـی کردیانـە خواوەنـد و ئاینەکـەی پـەیڕەو کـراوە کەبـەرای مـن (گـاو)،(گـا) پەرسـتیە(گـاوەیی)،(گاویـانی) چونکـە ئـاینی گودیـا لـە گـەڵ ئـاینی سۆمەریەکان جیا بوو ئەگـەر چـی خـۆی زاوای مـەلیکێکی سـۆمەریان بـوو، بـەڵام ناسنامەی بە سۆمەری نازاندرێ بۆیێ کەسەر بە گوتیەکان و جێی متمانـەیان بـوو باج و خەراجی پێ دەدان کەواتـە لەقـەبی گوتیـانی هـەلگرتبوو کەواتـە حـاکمێکی گوتیە. ئاینی گودیا لەو سێ(گا)یانەدا بەدیار دەکەوێ کـەوا هەیکەلـەکانی لـە لای

---

(١٩٢)کتیبی تاریخ الشرق الادنی القدیم–ص٩٩ – دکتـور سـامی و رضـا جـواد الهاشـی کـە چـۆن کورشـی لـە جەژنی سەری ساڵ بەشدار بووە لە بابل هەروەها بڕوانە(الفیلیبیـون/ جلیـل فیلـی) یـان عبیـدالله ایوبیـان نوروز الکوردستان.

(١٩٣) سومر فنونها وحضارتها–ص٦٢ دۆزینـەوەی تـاجێکی هخامنشـی وێنـەی گـای پاڵکـەوتووی گۆدیـای گاوەی لە سەر نەخشکراوە.

خۆی دا بــە گرنگـی پاراسـتبوو[١٩٤].. ئـەم گایـە وەك گایـەکی ئاسمـانی کەپێشـتر گلگامش و سۆمەریەکان لەگەڵی بەشەر دەهاتن، بەڵام(گا) لەلای گودیا پیرۆز بــوو. لەگەڵیا بەشەر نەدەهات لەبەر پـیرۆزی هـەر ئـەم کاریگەریـەش بـوو دوای هەشـت سـەد سـاڵ کـەوای کـرد کاریگـەری هـەبێت لـە سـەر ئاشــوریەکان تــا پەیکــەری گای(باڵدار) دروست بکەن، پیرۆزییەك بدەن بـە(گـا)،(الثـور السـمائی) باڵیشـی بـۆ بکەن هەردوو ئەفسانەکە دەبن بە یەك، گای ئاسمانی و گای گوتی سۆمەری لەلای ئاشـــوریيەکان، کـــە لەســـەرەتادا گلگامشـــیان پـێدەگـــووت پاشـــــان بووە(گالگامش)،(گال) پیرۆز گامش کورد کەواتە گاوە(کاوە) یان گودیا(کودیا) کە ئەژدیهاکی سێ سەرو(مار لەسەر شان) کوژ بوو خۆنەکردنی بەملیك و رازی بوونی، بەحاکمێکی ئاسایی لەناو چەکە و باج و خەراج کۆکردنەوەی بۆ پاشای گوتیــەکان بوو کەلێرەدا گوتیـەکان جێگـای(فـەریدون) دەگرێتـەوە چونکـە فـەریدون نـاوێکی دەسـتکردە ئاخنراوەتـە نێـو چـیرۆك و ئەفسـانەی نـەورۆز بـۆ ئـەوەی فارســەکان خۆیان لەسەردەمی گوتیەکان نزیـك بکەنـەوە، کـەهیچ سـیمایەکی فارسـەکان لـەو سەردەمەدا دیار نەبوو حوکم لــە دەسـت گوتـی و میدیـا و کـاردۆخ و لولـو ئیلامـە کاشیەکانی کورد دابووە وە تەنانەت ناوی(فەرەیدون) نــاوێکی تازەیـە بەنسـیبەت سەردەمی سۆمەرو گوتیەکان تەنیا نــاوە هیــچ بـوون و سـەرەداوێکی بەدەسـتەوە نیە تەنانەت لە زمانی ئەو سەردەمانەش نامۆیە زۆریش گەرام رەگیشم نەدۆزیــەوە بۆیێ ئێمە زێتر پشــتمان بەسـت بەوێنـە هـەڵکۆڵدراوەکانی سـەردەمی گوتیـان لـە ناوچەی سۆمەردا یان وێنەکانی سۆمەریان لەســەردەمی گوتیـاندا. کـە سـەردەمی زێرینی شارستانیەتی سۆمەریانە لەژێر سایەی گوتیەکاندا. نەك وەك هەندێ کەس

(١٩٤) بروانە اندری بارو–سومر فنونها وحضارتها ص٢٧٨ یان وێنەکە کوپی لەم نووسراوەدا(گای پاڵکەوتوو) کە کاریگەری لەسەر هخامنشیانیش هەر مابوو تا گای وەستاو بـەپێوە لـە لای ئاشـوریەکان دروسـتکرا کـە هەمان کاریگەری هیندیە ئاریەکانی کوردە.

وەك باسی لێوە دەکەن گوتیەکان بە کێوی و ناشارستان لە قەلەم دەدەن. ئەگەر ناشارستان بوونایە بۆ لەسەردەمی ئەواندا ناوچەی سۆمەر هێندە بەپێشکەوت کە هەموو سمبولەکانیش لە دەوری ئەفسانەی کاوە ئەژدیهاك دەخولێتەوە مەبەستم وێنەو(مەسەلله) کانی(گودی) گودیا[١٩٥] بۆیی بەپێی (منطق) و هزرو لێکولینەوە و بەراورد کاری زانستیانە ئێمە هەوڵمان دا بگەینە سەر بناغەی راستی و رووداوەکان - تا لە خلتو خاشی هەزاران سالەی پاك بکەینەوە، کە هەر سەردەمێك و شتێکیان بۆ زیاد کردووە بۆ بەرژەوەندی میللەتەکەیان یان کورسیەکەی پاشاکانیان یان ئاخنینی بیرەوەریەك لە بیرەوەری و رووداوەکانی ئەوکاتە وەك (لوحە الاعلانات) کە بۆ رۆژگارەکانی دوای خۆی بیگوازێتەوە، چونکە مانەوە و نەمری نەورۆز نهێنێکی گەورەیە سیمایەکی روحی گەورەی کوردانەی تێدایە بۆیی ئاوا ماوەتەوە هەر کوردیش پاراستویەتی بەتایبەتی گاوانیەکان کە لە خواروری ئیراقی ئێستا و ناوەندی ئیراق – بەغدا و دەوروبەری تا ناوەراستی کوردستان جێنیش بوون پێشکۆشی کاوە کە کراوە بە ئالاگوایە لە چەرمی پێشکۆشەکەی دروستکراوە کە چی لەراستیدا(گودیا) واتا(گاوە) و هەموو گوتیەکان جل و بەرگیان لە پیستی(گا) دروستکراوبوو کە واتە هیمای سەردەمەکەیە نەك هەر پێشکۆشەکە کە سەردەمانێکی وەك سەردەمی ساسانیان تەنیا پێش کۆش پیستەبووە بۆیە وایان وێنە کردووە بۆی هەیە ئاسنگەرییەکەش کە دراوەتە پالی هەر لەبەر پیستەکەش بووبێت نەیانزانیوە جل و بەرگی سەرتاپای پیستە بووە، چەکوشەکەی کاوەش هەر پیرۆز بووە چەکوش بەشێوەیەکی گشتی لەو سەردەمیدا[١٩٦]. جگە لەلای گوتی و سۆمەری ئەو

(١٩٥) اندری بارو–سومر فنونها وحضارتها ص٢٨١/ ص٢٨٢/ ص٢٨٣/ ص٢٨٥/ ص٢٨٧.

(١٩٦) بروانە، خزعل ماجدی، متون سومریە، ص١٧٥ الفأس رمز انلیل کەواتە سمبولی خواوەندی انلیل بووە.

ئەفسانانەشمان بەدوور خستەوە كەوا نامۆن هیچ پەیوەندیان بە كاوە و نەورۆزەوە نیە یان دوورن لە راستی و رێچكە سروشتیەكان، بەلآم سەرەرای ئەوەش ئەم ئەفسانانەشمان وون نەكردووە باسمانكردووە و سوودمان لێ وەرگرت وەك هیمایەك بۆ راستی دۆزینەوە لە هەمان كاتدا وەك سەرچاوە پاشان وەك قۆناغێك لە قۆناغەكانی سەر بردەی نەورۆز بەدرێژایی مێژوو سەردەمەكان لە هەمان كاتیشدا دراسە كردنی ئەو قۆناغانەی بەسەر جەژنی نەورۆزدا تێپەربووە یان كە پاشاكان گۆرانكاری و جوانكاریان تێدا كردووە. یان(ئاینەكانی) كە یەك لە دوای یەك گورانكاری كاریگەریان لەسەر نەورۆز هەبووە كە پەیوەندی لەگەل ئاین و فەلسەفە و سمبولەكانی هیندی و دۆلی سندەوە هەبووە. جیا بووە لەگەلْ هزری ئەوان جا كاوە(كودیا) لە پاش مردنی پلەی خواوەندی دراوەتێ لەلایەن میللەتەوە(١٩٧) هەر بۆیەش بە درێژایی مێژوو نەیانتوانیووە ناوی كاوە لەناو ببەن، وەك ئاینی زەردەشت و پیرۆزی ئاگر و كاركردنە سەر نەورۆز ئاگر كردنەوە چونكە(كاوە) ئاینێكی هیند و ئەورووپییە مانای شەپۆلەكانی سەرەتای پەیدا بوونی سیمای نەتەوایەتی كورد و كاریگەری میتولوژیای رۆژ هەلات بووە هەمیشە بیابانی رۆژ ئاوای دیجلە و فورات سنوورێك بوون لە نێوان شەپۆلی شارستانیەتی رۆژ هەلات و رۆژ ئاوا بە مانای شارستانیەتی هیند و چین بەرامبەر ئاینی سامیەكان و رۆماو فیرعەونیەكان یان شارستانیەتی رۆژ ئاوا بە گشتی كە هەمیشە بەرەو رۆژ هەلآت دەهاتن و لە سنووری دیجلە و فورات دەوەستان یان دیجلە و فورات دەی وەستاندن وەك كۆسپێكی گەورە چونكە پێشتر(پردو كەرستەی شارستانی پەرینەوە نەبوو) وەك ئێستا. لێرەدا ئەفسانەی یان چیرۆكی یان ئاینی كاوە(گودیا) یان گوتیەكانی گاپەرست ئاشكراترین زۆرانبازیی نێوان دوو شارستانیەتن.. یان دوو ئاین ئاینی گاپەرستی(گاوەیی)،(گودیایی) یان گابانی لە

---

(١٩٧) سۆمەریەكان لەقەبی خواوەندیان دایە كودیا/ بروانە سومر فنونها وحضارتها، ص٢٨٨

لایەك لە لایەکی دیکە خواوەندەکانی ئەکەد و بابل و هەندێ سەردەمی سۆمەریەکان کە خواوەندەکانیان دوو هێمای ماریان لەسەر شان بوو لە لایەکی دیکەوە وەك ئەو دوو هێمایەی لەسەر شانی خواوەندی حامورابی(١٩٨) هەیە لە کاتی وەرگرتنی یاساکان یان ئەو دوو قۆچەی(نرام سن) ی(ئەکەدی) (١٩٩) لەسەرشانی یان لەسەر سەریدا هەیە.

ئێمە پاشان باسی لێوە دەکەین لەکاتی باس لەچۆنیەتی رێك خستنی رووداوی نەورۆز لە(٢١) ئازار و شوێنێکی گونجاو و نەگوراویدا.. ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە کە لەگەڵ وێنەکانی سومەریانی سەردەمی گوتیدا دەگونجی ئەوەیە کە چۆن گرنیکی دەدرایە ئاو بەیەك داکردن و چوونە سەر ئاوو رووبارو شیرینی دابەشکردن..و(حەوت سین) حەوت خواردن و کەئەمەش بە ئاشکرا لەسەردەمی ساسانیادا بەدیار دەکەوێ وەك لە کتێبی نەورۆز درکردستان ئامارەی پێدەکا لەبەشی(چوار شەممە سورە) یان کە ئامارە بە لاپەرە(١٩٧) کتیبی ئیران در زەمانی ساسانیان دەکات بۆ هەمان مەبەست .. یان چۆن لەبەشی (سەرەتای نەورۆز) پێش ئەوەی باسی (سەمەنی) بکات کە لەگەنم دروست دەکرێ(لەسەرەتای نەورۆز) عبید اللە ئەیوبیان دەڵی(**چاندنی گەنمیش تایبەتمەندیکی تەواوی هەیە لە نێو ئەو گیاکولانەی کە دەی چێنین، چونکە لە هەموو مالێکدا دەفرێك (مەرکان) یان چەند دەفرێکی چاندرا و ئامادە دەکرێ ئەمانە هەمووی مانگێك پێش هاتنی نەورۆز دەچێندرێ بە بۆنەی پێشوازی کردن لە نەورۆز**)) ئەمەرێك لەگەڵ ئەو وێنەیە سۆمەریە بەیەك دەگاتەو. لەنێو دەفرێکا شتێك یان(گەنم) چاندراوە شاە بان(مەلیك) ئاو بەشتەکە

---

(١٩٨) اندری بارو سومر فنونها وحضارتها ص٣٦١ سەیری سەر شانی خواوەندی حامورابی بکە یان ص٢٨٤.

(١٩٩)هەمان سەر چاوە ص٢٢٨ سەیری دوو قۆچی وەك دوماری سەر سەری (نرام سن) بکە.

دادەكا لەپێش خوداوەندی سۆمەری كە مانایەكی تایبەتی چاندن و پیرۆزی چاندن دەدات جگە لەوەی ئاویش لەلایان پیرۆز بووە بروانە(سومر) ص٢٨٢ ص٢٨٣ وێنەكان چەپڵە لێدان كەئەم لایەنەی چاندن وئاوو كژی چاندن نیشان دەدا–بەلاَم لایەنەكەی دیكە كە ئاگرو ئاگر كردنەوەیە لەئاریێ دانیە[٢٠٠]. بەلاَم وێنەی رۆژو مانگ لەسەرەوە دیارە ئەگەر چی ئاگر لە وێنەكان دا دیار نیيە هەر ئەمانەش لەگەلْ ستەم و زۆریان لە چەوساوەكان و كۆیلەكانی كە زۆربەیان زاگرۆسی كوردبوون بەواتای رەسەنی كورد كۆیلەكان بۆ خواوەندەكان سەردەبڕان یان دەدرانە ئەو مارانەی سەرشانیان كە مەبەست دەكرانە قوربانی بۆ مارەكان یان دەچەوسێندرانەوە هەتا مردن بۆ ئەوەی خواوەندەكان لەبەروبوومیان بخۆن... بەخۆشیان لەبرسانا بمرن– كە سەردەمی كۆیلایەتی بوو[٢٠١] بەرای من بۆیێ هێرشی گۆتییەكان رۆژی رزگاربوونەوە لەدەست(ئەژدیهاكی ئەكەد و بابل) لە ناوچەی سۆمەرستان ئەژدیهاكی مار لەسەرشان و لەناوبردنی[٢٠٢] و كردنی بە جەژن و لێكدانەوەی لەگەلْ جەژنی دار و درەخت و ژیانەوەی سروشت و مرۆڤ،

---

٢٠٠ (ابرها) ی هیندی و ئەبراهام و ئیبراهیمی باوكی اسماعیل و ئیسحاق ناوی ئیبراهیم ی پەیامبەر لیك نزیكن كەوەك دەلێن لە كوردستان لەدایك بووە بەبابل و (اور) تێپەڕیوە بووە مەسەلەی قوربانی و سەر بڕینی قوچی قوربانی لەوێنەكان دیارە بروانە ص٢٨٦ سومر و خواوەندی(گا) .

(٢٠١) بڕوانە–هاوڕێ باخەوان– كوردستان نیشتمانی یەكەمینی سۆمەرییەكانە–ص٦١ یان العراق القدیم.

(٢٠٢) ئەندری بارو– سومر فنونها و حضارتها–ص٢٦١–ص٢٢٨، بەلاَم لە وێنەی(سوسە) و ئیلامییە ئاریە كوردەكان –ص٢٧٨ هەمان وێنە لاسایی كراوەتەوە ماری لەسەر شان نییە.؟! ئەم بەلگە لێكتر جیاكردنەوەیە لە خواوەندەكانی بابل و ئیلام. هەر ئەم زستانە دژوارە پڕ لافاوە ئەهریمەنیەكە بووە تەهۆی دروستكردنی(زەقورە) لە هەموو شارەكانی سۆمر تا لەكاتی ئاو هەلْسان بچنە سەری و رزگاربن هەر ئەمەش بوو كاریگەری لەسەر ئاینەكان بەجێهێشت كەوا وابزانن كەوا خواوەندی شەڕو ناخۆشی–زستانی دروستكردەوە وەك لە (ڤاندیداتدا) باس لێوە دەكات كە ئەهریمەن زستان و ساردی شەختە و مردنی دروستكردوە كەواتە زال بوون بەسەر ئەم ئەژدیهاكە ئەهریمەنیە زال بوونە بەسەر زستان ز هاتنی بەهار بە هاتنی بە هاریش جەژنی نەوروز دەست پێ دەكات. ڤاندیدات (ص ٢٩) د. جواد جلبی تەنیا هەستیان بە گۆرانكاری بەهار و كژوگیاشی بوون و چاندن دەكرد.

پێکەوە کە زۆربەی کۆیلەکان گوتی بوون بە مانایەکی دیکەش جەژنی لەناوبردنی قرِوقاتی زستان و ستەمی ئەژدیهاك و جەژنی رزگاری و هاتنی بەهار و گەنم و دانەوێڵە چاندن و ئاهەنگ وەك لە وێنەکانی سەردەمی گودیادا بەدیار دەکەوێت لە ولاّتی سۆمەر لەسەردەمی گوتییە کوردەکان زۆر پێشکەوتن ئەمانە هەمووی لەگەلْ یەك گونجاون وەك سەرچاوە ئارکۆلۆژیا و وێنەکان و میتۆلۆژیای سەردەمەکە کە سەرەتای سالْ لەسەرەتای بەهارەوە دەستی پێکرد بەمە سالْ دوو کەژ بوو: ١-زستان.٢-پاشماوەکەی تری سالْ تا هاتنەوەی زستان. کە ماوەیەکە مرۆڤ دەتوانێت تێیدا کار بکات و ئاژەڵەکانیان ئارام بن. یان بیانبەنە رەوەڵەکان. ئەم نەریتە جیابوو لەگەلْ نەریت و میتۆلۆژیای ئاینەکانی دەم دەریای سپی- لە(فەلەستان)[٢٠٢]. و میسری فیرعەونییەکانی جێنیشت دا کە لەسەر ئاو و ماسی و بەروبوومی(نیل) دەژیان... خواوەندەکانیشیان جیابوو لەگەلْ خواوەندەکانی ئاریانی کورد وەك گوتی و ئیلام و کاشی و میدییەکان.

ئێمە زانیمان سەردەمی گوتی و سۆمەریان و دەورووبەری کە ساڵنامەیان ئێستا بەم جۆرەی نەدەزانی پێوەرێ بۆ مانگ و رۆژەکانی نەبوو لەلایان پەیرەوی بکەن کەواتە گۆرانەکەیان بە جەژن دەزانی وەك لەوێنەکەی سۆمەری سەردەمی گوتیە کوردەکان ئەو کابرایەی دۆل زورناڵی دەداو لەسەرووی وێنەکە وێنەی سمبولێکی گەنم کراوە کەمەبەست لەوەدا جەژنی گەنم و چاندنی دێت-یان ئەو مەلیکە گوتیەی کە لەسەرو سیمای رادیارە یان لە کلاوەکەی سەری دەستوری زاگرۆسیەکان و شوێنی ساردە لە رەسەندا. کە چۆن (ئاو) دەرژێنێتەوە ژێر ئەو شتلە نەمامەی یان گەنمەی کە لەپێش خواوەند دانراوە(ننا) کە ئەمە خۆی لە

٢٠٢فەلەستان *Palastan* بەرای من لەشوێنی فەلەکانەوە هاتووە هی سەردەمی ساسانیان و پێشترە. فەڵە بەعیسایییەکان و (دیان) دەگوترا. لەسەردەمی سەلاحەددین بووەتە فەڵەستین ئەو شوێنەی فەڵەکان داگیریان کردووە. بە رای من.

خوێدا جەژنی نەورۆز و گەنم و دار چاندن نیشان دەدا وشەی (نن) لە نەو (نـو) نزیكە كەواتە سەرەتای ئەم كژەیان هەسـت پـێ كـردوە.. دیـارە دواتـر دوای ئـەم سەردەمانە هەستیان بە كژەكانی دیكە كردووە مەبەستم هەستیان بە چـوار كـژی ساڵە بەلگەشمان بۆ ئەمـە ئـەو زانیاریەیەكـە عبیـد اللـە ئـەیوبیان لـە نـەورۆز دەر كوردسـتان دەری دەبـڕێ دەڵـی((لـە رۆژ گارەكـانی پێـش هاخامەنیشـەكان و مادەكانەوە. لەو رۆژ گارە وەیە كە ئاریـەكان سـالیان بـە دوو كـژ– كـەژە(فصـل) دابەشكرد بوكە تەنها دوو كەژی گەرماو سەرمایان هەبوو كەژەی سەرما بریتی بوو لە دە مانگ و كەژەی گەرماش لە دوو مانگ، هەر وەكو لە ئاویستادا لە (ڤـاندیدات بەندی ٢،٣) داهاتووە بەكژەی سەرمایان ووتووە زیم *Zyam* ، زیما زیمو) بـەكژی گەرمایان دەووت هم *Hama*– هما *Hama* كەبە مانای هاوین هاتووە لە دوایـدا گۆڕانكاری بەسەرداهاتووە. هاوین حەوت مانگ و زستان پێنج مانگ بووە[(٢٠٤)] ئێمە پاشان باسی لێوە دەكەین لە كاتی باسـی چۆنیـەتی رێكخسـتنی رووداوی نـەورۆز لە(٢١)ی ئازار و شوێنێكی گونجاو و نەگۆڕاویدا. لێرەدا دووبارەی دەكەینەوە.

لەبـەر ئـەوەی ئـاینی (گـود) گودیـا– (گـا) گـاوە– زێـتر گاپەرسـتیو فـرە خواوەنـدی بـووە .. بـەڕای ئێمـە لەسـەردەمی پـەیدا بوونـی زەردەشـتو ئـاگر پەرستیو پیرۆزی ئاگر ئیزافەی سـەر جـەژنی نـەورۆز كـراوە– جگـە لەئیشـارەتی سەركەوتن كە لەكاتی خۆی ڕاگەیاندنێكی خێرا بـوو لەسـەر لوتكـەكان دەكرایـەوە هەروەها (دیاردەی دیاری بردن بۆ پاشـا) لـە وێنـەكانی سـەردەمی گوتیـەكان لـە سۆمەردا دیارە كـە لـەژێر پـێی كـوری گودیـادا وێنـەی كێشـراوە بڕوانـە ص٢٧٢ ص٢٧٣ سومر فنونها وحضارتها – كە بەڕای من دەبێ بە موناسەبەتی جەژن یان سەركەوتن بوبێ جا هەر ناوێكی هەبوبێ لەو كاتەدا كە نـاوی خواوەنـدی (ننورتـا) كە نزیكترین ناوە لە نەورۆز كە لەبەردەمیا مەلیكی گوتی سۆمەری هاوبەش گـەنم

---

(٢٠٤) نەورۆز در كردستان–عبیداللە ئەیوبیان .

ئـاو دەدا وەك لـە وێنـەکان را دیـارە کـە باسمـان کـردووە یـان کــە نــەورۆز وەك بەهەمان شێوە کە عبیداللە ئەیوبیان لەبەشی (نــەورۆز لەسـەردەمی ئیسـلامدا) لـە کتێبەکـەیدا[٢٠٥]. دەڵێ: ســەردارانی موسـڵمان وەك سـەردارانی ساسـانی ئــەو دیاریانـەی بـە بۆنـەی نـەورۆز پێشکەشـیان دەکـرا وەریــان دەگــرت، بەتایبــەتی موسڵمانانی نێوان دوو ڕووبار لێرەدا مەبەستی لـە دوو ڕووبـار (بـین النـهرین)ە کە شوێنی گاوانەکانی گاوانیانە هەر ئـەم دیاریانـەش بـوو کەنـەی هێشـت حاکمـە موسـڵمانەکانی بــەغدا نــەورۆز قەدەغــە بکــەن، وە زینــدو کردنــەوەی نــەورۆز لەسـەردەمی موسـڵمانان بـۆ ئـەبو مسـلم خۆرەسـانی و دەسـەڵاتی بەرمــەکیانو (زنجـیرەی تاهریـان) دەگێڕێتـەوە. حـەمزەی کـوڕی حەسـەنی اصفهانی دانــەری کتێبی ((الاشعار السـائرە فی النـیروز والمـهرجان)) یـان بۆحـتری و ئەبونـەواس بـە شـکومەندی باسـی نـەورۆزیان کـردوە، پاشـان باسـی (طـبری) دەکـا کـە لـەمێژوو ساڵانی (٢٤٨)دا دەنوسێت:

((لە ١١ حوزەیرانی کەسێ شەو لەمانگی جمادی الاول ڕۆیشتبوو لەلایـەن)) خەلیفەوە جاردرا– (کە ئاگر کردنەوەو (ئاو ڕشتن) قەدەغەیە لـە ڕۆژی نـەورۆزدا. پاشان گفتوگۆی لەسەر کرایـەوە لەبـەردەم کردنـەوەی جـەژنی نـەورۆز لـەپاش ئەمـە دانیشـتوان بـە جۆرێك ئـەم جەژنـەیان کـردەوە لـە سـنوور دەرچـوو بــوو. بەشێوەیەك کە ئاویان بەحاکمو کوێخاکانی بەغدادشـیان دادەکـرد[٢٠٦]. لـێرەدا بـە ئاشکرا پیرۆزی یان گرنگی دان بە ئاوو ئاگر لە نەورۆزدا بەدیار دەکـەوێ،بـەڵام لـە سەردەمی ئێستا لەنێو کوردان ئاو پێداکردن نەماوە بەڵام کە بەهەمان شێوەش لە سـەردەمی ساسـانیاندا لـە هــەمان سـەرچاوە لەبەشــی (نـەورۆز لــە ڕۆژگــاری

(٢٠٥) نوروز درکوردستان عبیداللە ایوبیان بەشی (نەورۆز لەسەردەمی ئیسلامەتیدا).

(٢٠٦) نەورۆز در کردستان– بەشی نەورۆز لەسەردەمی ئیسلامدا، باسی ئـاوپێداکردن دەکـا بەمـە لـە نـەورۆزی سەردەمی گوتی سۆمەری نزیکتر دەبینەوە. وەك هەڵقەی پەیوەندی ئەوساکەو ئێسـتای ئـاو پـێ دا کـردن نەماوە.

ساسانیاندا باسی دەکا) (کە چۆن ئەبو ریحانی پیرۆنی لە (ئاثار الباقیە) دا باسی کردوە دەڵێ پاشا لەیەکەم ڕۆژی نەورۆزەوە ئاگاداری خەڵکی دەکرد بۆ کاتی دیدارو وەرگرتنی دیاریو چاکە دانەوەیان کە لیستێکی بۆ ئەم دیدارانە ئامادە دەکرد. لە پیاوانی ئاینی موبەدان و وەزیرانو کاسبکاران و وەرزێران هتـد) لە زەمانی ساسانیان بە زمانی پەهلەوی بە نەورۆزیان دەگووت (نوگ روز Noghroz)[٢٠٧]. لە ڕۆژی نەورۆزدا لە گۆزەیەك گەورەکچان دەچوون لە ژێر دۆزەقەی ئاشەوە ئاویان دەهێنا ئەم ئاوەیان بۆ پاشا دەبرد، هەروەها بیستو یەك ڕۆژ پێش نەورۆز لە ماڵی پاشا دوانزدە پایە لە خشتی کاڵ دروستکراو لەسەر هەر پایەك دانەوێڵەیەکیان دەچاند وەك گەنم، جۆ، برنج، پاقلە، ڕەشکە، هتد سەیری ژمارەی دوانزە و پایەو (دوانزە مانگی ساڵ بکە) کە باسی لێوە دەکەین لە داهاتوودا، هەروەها خانووی نوێ دروست دەکران[٢٠٨]. بەهەمان شێوە لە وێنەکە دیارە شای ناوچەی گوتیان لە پێش خواوەندی دەفری شتلە گەنم ئاودەدا بەهەمان شێوە دەبینین پاشا لەسەردەمی گوتی نێو سۆمەریەکاندا لەوێنەی مەسەلەی (اورنمو) چەکوشو پێمەڕەو کەرستەی بیناسازی لەسەر شانە بۆ کار دەچێ کە جەژنەکە لەلایەن هەر دار چاندن نەبووە یان دانەوێڵەو گەنم بەڵکو بیناسازیو ژیان نوکردنەوە بوە جگە لە ڕزگار بونیان لە کۆیلیەتیو ستەمی ئەژدیهاکەکان کە لە شێوە مرۆڤو خاوەن دەسەڵات بوونە– ئەوانەی زێتر لەسەریکیان هەبوو– وەك ئەژدیهاکی سێ سەرو حەوت سەر[٢٠٩]. ئەمانە هەمووی پاشماوەی ڕەگەکانی نەورۆزن یان سەرەتاو بنەماو مانەوەیان بەدرێژای مێژوو لەسەردەمی سۆمەرو گوتیەکاندا ئاو پیرۆزبووە بە (ئاوی پیرۆز) ناویان بردوە.

---

(٢٠٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢٠٨) هەمان سەرچاوەی عبیداللە ئەیوبیان هەمان بەشی (نەورۆز لەسەردەمی ساسانیاندا)

(٢٠٩) سومر فنونها وحضارتها (مسله اورنمو ص٢٨٢ ص ٢٨٣.)

هەربەم ئاوە پیرۆزەش شتلو گەنمو جۆ دانەویڵە یان ئاو داوە. کەیەك دەگرێتەوە لەگەڵ پیرۆزی ئاوو بەیەك داکردنو ئاو بردنی بۆ پاشای ساسانی. تەنانەت چوونە سەر ئاویش لەبەرە بەیانی نەورۆزدا وەك عبیداللە ئوبیان لە نەورۆز در کوردستان باسی لێوە دەکات لە هەندێ ناوچەی کوردستانیش تا ئێستا باوی ماوە. پەیوەندی لەگەڵ ئاوو خوارووی ئێراق و جەژنی ئەوکاتەی سەردەمی گۆتییان و سۆمەرییانەوە هەیە؟! لەگەڵ ئاوپێ دا کردنی سەردەمی ساسانیان و عەباسیان لە بەغدا کە دیارە ئەو کاتەش زۆرینەی کورد بووە.

کەواتە ئاو هەمان دەوری خۆی بینیوە لەسەردەمی گوتیو سۆمەریەکاندا هەروەها شان بەشانی ئاگر کە لەلایەن زەردەشتەوە تێکەڵ بە نەورۆز کراوە وەك ئەوەی دوو ئاینی ئاو پەرستیو ئاینی ئاگرو ڕووناکی پەرستی تەنانەت ئەو شوێنانەی بێ ئاو بوون کانیەکانی ئاویان لەلا پیرۆز بوو کە بیابانی بێ ئاوەو پێچەوانەشەوە ئەو ناوچەی چیایە ساردانەی پرپەتی لەکانی ئاو. ئاگر پیرۆز بوو لەلایان کە کردنەوەی لە زستانان بە زەحمەت بوو لەسەرما دەیانی پاراست کەواتە لەو سەردەمانە ئەو شتە خواوەند بوو، کە خواردنو بەخاوەنی کردنی بۆ دەکردن بە واتایەکی دیکە کە بە سوودترین شت بوو بۆ ژیان یان ئەو دەسەڵاتانەی مردنیان بە دەستەوە بوو وەك شاو مەلیكو دیاردە سروشتیەکانی وەك لافاو گرکانو ئاگرو بۆمەلەرزە بەڵام کێ بوون ئەو گروپەی ئەم مێژووەیان دروستکر ئەوا لە وەڵامدا دەڵێین گوتیەکان بوون کاریان کردە سەر سۆمەرو هەموو هونەری ناوچەکە ئەویش بەهۆی ئەم بیرو بڕوا ئاینیەی کە ببوە هۆی یەکبونی فیدراسیۆنی ئەم هۆزانە لە نێو یەك قەوارەدا کە پێی دەگوترا گوتی (گودی) جودی کە (گۆد) گا پەرستەکانی بەڕەگ هێندی بووە یان بەهزرو بیروڕا- یان لە ژێر کاریگەری ئاینەکانی ناوچەی هیندستان و براهمایەکان کە بۆی هەیە زۆر کەس لە مریدو ئەوانەی ئاینەکەیان بڵاودەکردەوەو بەهەمان لەقەبو ناو ئازار

درابن، لەلایەن بیرو بڕوا بت پەرستەكانەوە بـە تایبـەتی لەسـەرەتادا. كـە بووەتـە هۆی ئەمەی چەند (شوێنێك)ی بە ناو كرابێ.

**لە ناوچەی چوار ڕووبارەكەدا** كە هەر چواریان لە نزیك شاری بەسرە لـە كەنداو دەكەنەوە كە بەڕای من سنورەكانی سیاسی كردیان بە دوو بەش لە نێـوان ئێران و عێراقدا ئـەگینا دەبوایە نـاوی ئـەم شارستانیەتە شارسـتانیەتی چـوار ڕووبارەكـان بوایەنـەك دوو ڕووبـار یـان پێدەشـتەكانی زاگـرۆس، كـە لـە ڕووبارەكانی گارونو گەرخە (گـاوان ڕود) و دیجلـەو فـورات پێـك دەهـات سـەیری ناوی گارون = بە ئاشكرا دیارە لە گا + روند (گارود) پێك دێت ڕووباری (گا)و كـە ڕووباری گاو گـامێش بـەخێو كردنـە لـە لێوارەكـاندا هـەروەها (كەرخـە) بەهـەمان شێوە ئینجا دوو ڕووبارەكەی دیجلەو فورات هەر چوار ڕووباریان لە زنجیرە چیایی زاگرۆس كورد نشین پێك دێـت. خـۆ ئەگـەر ئـەو ناوچـە كوردنشـینانە سنورێكیان دەبوو بە ناوی كوردستان ئەو كاتـە بـە شارسـتانیەتی كوردسـتان نـاو دەبـرا یـان شارستانیەتی كورد یـان زاگرۆسیەكان بـەڵام دابەشـكردنی سـنوری سیاسـی ئـەم سەردەمەو زلهێزی داگیركەران بە درێژای مێژوو وەك لامژە لەسـەر هـەڵمژینی ئـەم شارسـتانیەتە خۆیـان پـێ گـەیاندوە وە هـەموو جیـهانیش قـەرزاری ئـەم شارستانیەتەیە كە دەبێ بە ووردی خاوەنو ناوچەكـە بناسـرێتەوە لەگـەڵ دەوری ڕەگەكانی كوردو بەشداری كردنی وەك میدیو گوتیو لولـو كـاردۆخیو سـوبارتوو میتـانیو كاشـیوماننـاو ئیلامـیو هوریـەكان، وە هـەموو شارسـتانیەكانی دوای ئەوانەش وەك هخامنشو ئەشكانیو ساسانی هەر لەم ناوچەیەی زاگـرۆس بـوو وە پاشـانیش كـە عەرەبـە موسـڵمانەكان ناوچـەی عـێراقی خواروویـان داگـیركرد پایتـەختیان هـەر بـەغدای تـەك (تیسـفون)ی كۆنـە پایتـەختی ساسـانیەكان بـوو پێشتر.

١. ئەگەر رۆژێك لە رۆژان لە مێژوودا بـە رای هـەندێ كـەس قامیشـە شـەكر دۆزینەوە بوتە هۆی دروست بوونی جەژنی نـەورۆز لـە سـەردەمێ لەسـەردەمەكان لەسەرئەوا بە رای من دۆزینەوەی (گەنم) یان چاندنی گەنم لەلایەن گووتییەكانـەوە لە وولاتی سۆمەر بوەتە دروستبوونی جەژنی نەورۆز وەك لە وێنەكان را دیارە.

١. ئـەم وێنەیـەی دەهـۆلۆ زوڕنـا لێ دەدەن و لەسـەرەوەی وێنەكـە بـە گەورەیی وێنەكە شتلە گەنمێك نیشان دەدا، ووشەی لێك وەشاوەیە (گا) بـەزمانی هیندیو فارسیو كوردی هەر گایە یان دروستتر (گاو).

ئەمەش گەورەترین بەڵگەیە بۆ هۆیەكانی دروست بوونی ئەم جەژنـە بەیـەك دەچـن یـان ئـەو بەڵگانـەی دووبـارە دەكەنـەوە كـەوا بـە بەڵگـەی سـەرەكی سەرچاوە دەچێ كە چاندنو سـەرەتای بـەهارو ئاهـەنگ گێڕانـە بـە داهێنـانی دانەوێڵـە چـاندن لـەو كاتـەی كـە مـرۆڤ لـە (گـا) بـەخێو كـردنو ڕاوو شـكارو ڕەوەندیەوە بەرەو جێنشێونو جۆرەكانی چاندن هـەنگاوی دەنـا بـەرەو قۆنـاغی شارسـتانیەتو جێنشـینبون داهێنانـەكانی دیكـەی جێنشـینبون. وەك نوسـینو گرنگیدان بە خانوو هونەرەكانی كۆڵینو نەخشو نیگارۆ پەیكەرتاشـیو پەرسـتنی هونەرەكەی خۆی.

٢. ئەگەر هەندێ كـەس جـەژنی نـەورۆز دەگێڕنـەوە بـۆ سـەردەمی (كیومـرپ) لـە ڕەواندز دژی ئەهریمەن ڕاوەستاو سەركەوتنی وەدەسـت هێنـا ئـەوا هـەر دووبـارە بوونـەوەی هـەمان وێنـەی ئەژدیـهاك كوشـتنەیان دوبارەكردنـەوە چیرۆكەكـە بەجۆرێكی دیكە.

٣. یان ئەگەر خەیامی شاعیر نەورۆز بگەڕێنێتەوە بۆ دۆزینـەوەی (بورجـی حمـل) ئـەوا هـەمان وێنـەی بچوكـی دۆزینـەوەی سـەری سـاڵە لەلایـەن سـۆمەریەكان لەسەردەمی حوكمی گوتیەكاندا ئەویش دووبارە بوونەوەی بەهارو چاندنە كـەوەك جەژنە چاوەڕوانی دەكرا كە گەڕانەوەی بەهارە یان ڕووداوێك لە بەهار هەر ئەمەش

بووە هۆی دۆزینەوەی سالّ سالّیش چونکە بە ژمارەی حاکمەکان دەژمێردرا یان هەر چەند سالّەی حوکمی پاشەیەك ناوی هەمان پاشای لێدەنرا بەمە بەرای من ٢١ بیستویەك پاشای گوتی مێژووی ٢١ بیستو یەك کۆمەڵە سالّی دروست کرد بەرای من هەر دەبێ ٢١ بیستو یەك ناوی رۆژەکانی مانگێکیش لەمانگی بەهار لەوەوە هاتبێت لەو کاتەی مانگو ژمارە ڕۆژەکانی دۆزراوەتەوە لە دواتردا بەهۆی سوڕانەوەی مانگ بەدەوری خاکدا یان هاتوو چۆی مانگ چونکە هەر رۆژێك لە ٣٠ ڕۆژی مانگ ناوێکی خواوەندێکی لێنرا وە هەر مانگێکیش لە ١٢ دوانزە مانگەکان ناوی خواوەندێکی لێبوو بۆ ئەمە بڕوانە نەورۆز دەر کوردستان یان باسێکی تایبەت بەمە لەدۆتۆی ئەم کتێبە کە ناوی مانگەکانو ڕۆژەکان لە سەردەمی ساسانیەکان تۆمار کراوە کە بۆ ئاینی زەردەشت دەگەڕێتەوە کە ئەویش بە کاریگەری نەریتەکانی پێشە خۆی درست بووە وەك (یاسای گۆڕان) (قانون التطور) وئەلقەکانی یەك لە دوای یەکی داهێنان و دۆزینەوە. لەبیریشمان نەچێت نەورۆز وەك جەژنی رەمەزان و قوربان پاش و پێشی دەکرد بە سالّی قەمەری جاری وا هەبووە دەچووە نێو زستان یان هاوین عومەر خەیامی دەوری هەبوو لە ڕێك خستنی؟!.

٤. یان ئەگەر نەریتەکانی نەورۆز لەوە دایە کە لەم رۆژدا میللەتو ڕعیەت سەردانی پاشا بکات وەك لە مێژووی هخامنشیو ساسانیاندا بەدیار دەکەوێ وەك لە وێنەکانی تەختی جمشید، ئەوا هەمان وێنەیە دووبارە دەبێتەوە کە لەوێنەی شاو مەلیکی سۆمەرییە یان گووتی بە جل و بەرگی را دیارە کە چوەتە لای خواوەند ئاوی پیرۆز لە ژێر شتلە گەنم ڕوو دەکا بەمانای شتلە گەنمەکە بە پیرۆز دەزانێ وە بە ئاوی پیرۆز ئاوی دەدا ئەو کارەش بە کارێکی خوای شاهانە دەزانرێ لە دوای ئەم وێنەیەی گەنم ئاودانە وێنەی دهۆڵو زوڕناو چەپڵە لێدانە کە نیشانەی جەژنە ئەوا سەرەتاو سەروچاوەی جەژنی نەورۆزە بەهەر ناوێك بێت جەژنەکە لەو

سەردەمیدا دەیسەلمێنێ کە لە سەردەمی (گۆدیا) ی گاوەی حاکمی گوتیەکانە لـە وولاتی سۆمەردا. دەپرسم کام بەلگە لەمە کۆنترو ڕەسـەنترە، ساویلکەیە ئـەوەی جۆگەلە بە سەروچاوە دابنێت.

٥. ئەگەر دیاری بردن بۆ پاشا یەکێ لە نیشانەکانی جەژنی نەورۆز بێـت لـە هـەموو سـەردەمەکاندا لەوانـەش سـەردەمی هخامنشـیو ساسـانیو ئیسـلام (عەباسیەکان) کە بەهۆی ئەم دیاریانەوە حاکمەکان نـەورۆزیان قەدەغـە نـەدەکرد ئەگەر چی ئاگر کردنەوەو مەراسیمەکان لەگەڵ نەریتی ئیسلام نەدەگونجا چونکە خەلیفەی بەغدا دیاریەکی زۆری بۆ دەهات لەلایەن زۆربەی دانیشتوانی بـەغدا کـە کورد بوون نەورۆزیان دکردەوە ئەگینا، وەك گوتمـان نـەورۆز بـە جـەژنێکی پێش ئیسلام و کافران دادەنراو ناوە ناوە قەدەغەش دەکرا بڕوانە نەورۆز لە کوردسـتان ئەمـەش بەلگـەی ڕەسـەنایەتی ئـەم دیاریانـەی جەژنەکەیـە لەسـەردەمی گوتـیو سۆمەریدا بەدیار دەکەوێ کە لەژێر پـێی پەیکـەری (ننگرسـودا ) خـەڵکانێکی زۆر دیاری دەهێنن کە لەنزیکەی حەوت خواردن پێك دێت کە ئەویش هێمـای (حـەوت سین) نەریتەکانی نەورۆزە ماوەتەوە لەژێر ناوی جیا جیا دا بڕوانە سـۆمەر وێنـەی (ننگرسو) لەم کتێبەشدا ئایا ئەمە سەرچاوەو ڕەسەنایەتی جەژنی نـەورۆز نیـیە؟ (ننگرسو) کە کوڕی گۆدیایە (گۆدیا– کاوە)ی حاکمو باوەڕپێکراوی باجو خەراجی گوتیەکانە لە (لگش)و وولاتی سۆمەر بە گشتی کە دواتر گۆدیا گـاوە بـە خواوەنـد دادەنـرێ کـە ئەمـەش بەلگـەی زیندوویـی (کـاوە– گۆدیـا) کـە خـاوەن هـزرو بیروبـاوڕێکی ئاشـتی خـواز و برایـەتی بـووە وەك و پەیامبـەر بۆیـێ لـە نێـو دڵـی خەڵکی بین نهرینو کوردستان ماوەتەوە پاشان ئاریەکان بەگشتی تەنیا مەسەلەی ئاگری نەورۆز نەبێت کەوا دیارە گوتیەکان ئاگر لەنێو چیاکانی زاگرۆس بـە بۆنـەی ئـەم سـەرکەوتنە کردویانەتـەوە ئـاگر لـەنێو وێنـەکان بـەدی نـاکرێ یـانیش دواتـر بەکاریگەری ئاینی زەردەشتییەوە هاتبێتە نێو جـەژنی نـەورۆز وەك لێکدانـی دوو

سمبولی دوو ئاینی گووتیو زەردەشتی چونکە خوارووی عـێراقو عیـلام شـوێنێکی گەرم بووە ئاگر ئەو مانایەی نێو چیاو نەشئەیە ناداتەوە کە لە شوێنە ساردەکاندا هەیەتی کە زۆر جار مرۆڤ لە سـەرما ڕزگـار دەکـا بـەهر حـاڵ ئەمـەی گرنگـە لـە سمبولی ڕزگار بوونە لە کۆیلایەتی کەواتە سەرەڕای ئەمانەش نـەورۆز دۆزینـەوەی گەنمو کوشتنی ئەژدیهاکانو ڕزگاربوونو بڵاو کردنەوەی ئاشتیو ئاوەدانیـیـە وەك لە ((مەسەلەی ( انن) الکاهن کبیر او ملك گۆدیا)) ئەوا بەدیار دەکەوێ(٢١٠).



## شا بەڵگە:

**ئەژدیهاکی دوومار لەسەر شان و چۆنیەتی بەتوندی دەست گرتنی گودیای بچووکی وەرزێرو داس گوڵە گەنم لەسەر شان جلی گوتی لەبەرە کە لەپێستەی گایە خواوەندی سۆمەریانیش جلی لە(چیفە) مارەکەی لای گۆدیا دەمی هەرەشەی کردۆتەوە سەری گۆدیای خواردووە، بەڵام مارەکەی دەستە ڕاست کە سۆمەرییەکی لەتەکە دەمی داخراوە بەبێ هەرەشە.**

---

(٢١٠) بڕوانە ص ١١٨ وێنەی ٨٧ (مزهریة ذات مناظر دینیة ) (مزهریـة الورکـاء) ژمـارەی خواردنـەکان نیشان دەدات بۆ پاشای دێنن لەگەڵ وێنەی گوڵە گەنم وەك بەڵگە کە دیارە ڕۆژی نەورۆزو سـەری ساڵو بەهارو گەنم چاندنە ئەم پەرداخە نەخش کراوە بە ناوی الورکاو پەرستنی خواوەندە (انن)ی لێ بەدی دەکرێ.

# کژی ساڵو دەستنیشان کردنی ڕۆژی نەورۆز
# ﴿ جەژنی ڕزگار بوون لە مەترسیی ئەژدیهاك ﴾

ئەبو رەیحان لە التفهم دەنوسێت: نەورۆز چی‌یە؟

یەکەم ڕۆژی مانگی خاکە لێوەیە لەم ڕووەوە ناوی نوێیان لێناوە، چونکە پێشەنگی ساڵی نوێیە پێنج ڕۆژی یەکەمی سەری ساڵ جەژنە ڕۆژی شەشەم جەژنی (نەورۆزی گەورەیە)

یان شەشەمین مانگی (فەروەردین) لە مانگی نەورۆزی گەورەیە، هەمان سەرچاوە.

بەڵام لە (ئاوێستادا) دەربارەی نەورۆز نەدواوە[٢١١].

عبیدالله ئەیوبیانە دەڵێ: جەژنی نەورۆز لە ڕۆژگارەکانی پێش هەخامنشیو ماددەکانیش هەر هەبووە، لەو ڕۆژگارە کە ئاریەکان ساڵیان بە دوو کەژ – کژ– دابەشکردبوو– تەنها دوو کژی سەرماو گەرمایان هەبوو. کەژی سەرما بریتی‌یە لە دەمانگ وە کەژەی هاوین گارماش دوو مانگ بوو هەروەکو لە ئاوێستادا (ڤاندیدات) ڤرگرد یەکەم بەندی (٣،٢) داهاتووە بە کەژەی سەرمایان بە واتای دەگووت زیم zyam ، زیما، زیمو)) بە کەژەی گەرمایان دەگووت هم hama – هما hama / بە مانای هاوین دێت. لە دوایدا گۆڕانکاری بەسەر ئەم دوو کەژەدا هاتووە.

هاوین حەوت مانگو زستان پێنج مانگ بووە لە نێوان هەردوو کژ جەژنێکیان بەرپاکردوە، یەکەم جەژن لەسەرەتایی کەژی گەرما کە مەڕو ماڵاتیان

---

(٢١١) نورز در کردستان عبیدالله ئەیوبیان.

دەردەکرد، بۆ سەر سەوزەلان کە دەکاتە سەرەتایی بەهار دووەم جەژنیکیان لە سەرەتای کژی سەرمادا– لەو کاتەی کە مەڕو ماڵاتیان لە کێوە ساردەکان دەهێنا خوارەوە. بە کورتی لە کۆتایی کژێك سەرەتای کژێکی تر بوو. ئاریەکان کە هاتن یان وولاتی سەرەکیان ڕووباری سەندو پەنجابو دەوروبەرێکی گەرم بوو، ناچار بوون لەگەڵ سەرمای ناوچەی تازە بگونجێن. ئەم گۆڕانکاریانەی – ڕۆژی جەژنی نەورۆز پێویستی بەوە کرد جێگای لە نێو ڕوداوە سروشتیەکانو کەژو ڕۆژەکان دەستنیشان بکرێ کەواتە لێرەدا دەوری کاوە و شۆرشەکەی لاواز دەکا پەیوەندی نەورۆز تەنیا بە سروشتەوە دەبەستێتەوە– وەك سەردەمی سۆمەرو جەژنی دار چاندن. عبیدالله ئەیوبیان لە کتابەکەی نوروز در کردستان لە ژێر ناونیشانی (جێگۆرکێی نەورۆز لە هاوینەوە بۆ سەرەتای بەهار) دەڵێ: ((وەك زانیمان ساڵی ئاریان بە دوو کەژە دابەشکرا بوو سەرەتایی هاوینو کە لە مانگی" تیر" )) تیرماه دەستی پێ کرد نەورۆز لە کژی هاویندا بوو ساڵیان ٣٦٥ ڕۆژ بوە بە بێ ئەوەی کەرتی دیکەی بخرێتە سەر لەگەڵ هەتاوی کەمتر بوو. کۆنترین هەواڵ ساڵی چوونە سەر تەختی یەزدەی گوردی سێهەمی ساسانی بوو، کە لە ساڵی ٦٣٢ز یەکەم ڕۆژی مانگی فەروەردین ڕێکەوتی ١٦ حوزەیران ﴿ژۆنڤ﴾ی ڕۆمی یانی لە ڕێکەوتی (٩١) ڕۆژی بەهار دابووە، بە کورتی وەکو جەژنەکانی ڕەمەزانو قوربان جێگایان ڕاوەستاو نەبوو، بەلام جەژنی نەورۆز لەسەر خۆ بوو لەم شوێنگۆڕیە لە نێو کەژەکاندا، چونکە مانگە عەرەبیەکان هەر ساڵەی (١١) ڕۆژ دەکەوێتە دواوە، بەگوێرەی هاتوچۆی مانگ بەدەوری خاکدا(٢١٢). نەك ئەوانە تەقویمیان بە گوێرەی سوڕانی خاکە بە دەری خۆردا، بەهەر حاڵ جگە لە گیروگرفتەکانی ساڵی (کەبیسە)و کە لە(١٢٠) ساڵدا مانگێك زیادە بوو لە ساڵی ئاریاندا، بۆ کاتی

(٢١٢) بۆیی جەژنی (ڕەمەزان)و (قوربان) پاشو پێش دەکا لە نێو سەرماو گەرمادا.

ڕاستكردنەوەی ساڵیان بە جەژن دادەنا، بەناوی جەژنی (بهبزك) كە ڕۆمەكان ئەو ساڵەیان ناونابوو (ئۆلغیاس) یان ئەولفیاس لە چوار ساڵ ڕۆژێكی زیاد دەكرد ئەمە جگە لە گیروگرفتی كە هەر مانگو لەلایەن (٣٠) ڕۆژ بوو بۆیێ ساڵی زاینی ئەم هەڵاتەی هەموو چارەسەركرد كە هەندێ مانگی كردە (٣١) ڕۆژ بەمە یادكردنەوەی جەژنەكانی لە شوێن خۆیدا نەگوڕاو كرد كەواتە كاتێكی زۆری ویستوە تا ئەزمونی (تقویم) ساڵو ڕۆژ ژمێر گەیشتە ئەم ئاستە هەر بۆیەش دەڵێم مادامەكی ئاریان ساڵو ڕۆژ و مانگیان بەناوی خواوەندەكانیان كردوە دیار دەبێ پەیوەندیەك هەبووبێ لە ژمارەی (٢١) نەورۆزو (٢١) پاشای گوتی كە نەورۆزیان دروستكرد بابلو سۆمەریان ڕزگار كرد لە دەست كۆیلایەتی پاشاو دەسەڵات لەسەردەمی (عومەر خەیامی شاعیرو ماتماتیك زانو پیتیولو شارەزاو ئەسفزاریو (واسطي)و لوكری عەبدول رەحمانی خازنیو كۆمەڵێ ئەستێرەناسی دیكەی سەردەمی مەلكشاهی یەكەم ڕۆژی مانگی فەروەردینیان (١٧) ڕۆژ بردە پێشەوە نەورۆزیان لەسەرەتایی (بورجی حمل) جێگیر كرد. كەواتە (٢١) ی مانگ بۆ نەورۆز دانان دانانە. مێژووی ڕوداوەكە نیە؟ ئەگەر بەم جۆرە بێت یان ڕاستكردنەوەیە.

وە بە دروستكردنی ساڵی (جەلالی) داڕشتنی كەبیسەیەك لەسەر شێوەی كەبیسەی ساڵی ڕۆمیەكان یان ساڵی یۆنانی، بۆ هەمیشە كەمو كورتی ساڵژمێری (تقویم) ئێرانیان لابردو ساڵژمێری (ساڵنامە)یەكی زۆر ووردیان ڕێك خست بەم شێوەیە كە چۆن ساڵی هەتاوی ڕاستیەكەی ٣٦٥ ڕۆژو پێنج سەعات(٤٨) دەقیقەو (٥١) چركەیان خستە سەر كەئەمەش لە ساڵێكدا نزیكەی یەك ڕۆژ پێك دەهێنێت، لە هەر چوار ساڵ لە جیاتی ٣٦٥ ڕۆژ ٣٦٦ ڕۆژ حیساب دەكرێت. یانی ڕۆژێك دەخرێتە سەر بۆ پڕكردنەوەی ئەو تۆزە كەمیەی كە هەیەتی، یانی چوار ساڵ بە ٣٦٥ ڕۆژو پێنجەمیبە سەنە (كەبیسە)

دادەنرێت پاش ئەم ڕێکخستنەی سالّی ئاریانی ڕۆژی کڕی بەهار لە (اعتدالی بەهاری) گوێزرایەوە (بورجی حمل) و چەسپێنراو (نەورۆزی سولّتانی گەشەی ساند). کە لە (سالّی جەلالیە)– لەسەردەمی ڕەزا شا، ناوی مانگەکانی ڕەسمی وولآت بەناوە دێرینەکانەوە پەسند کرانەوە(٢١٣).

کەواتە ئێمە ئەگەر سەردەمی سۆمەریان بینینەوە یاد کە تەنیا هەستیان بە گۆڕانکاریەکانی سروشتکرد وە بە هاتنی هاوین زستانو کەژەی دارو گەنمو دانەوێلّە چاندن کەسەردەمی دۆزینەوەو جەژنی گەنمو بووە وەك لە وێنەکان ڕادیارە (گەنمو گا) ووشەکانیش زۆر لێك وەشاوەن بە کوردی وەك گا گەنم دروستبکا وایە یان گەنمو گا هۆکاری سەرەکی ژیانین‌و لەیەکتر جیا نەکرێنەوە هەر گوتیەکانیش بوون گەنجیان لەگەڵ خۆیان بردو ئەوانیان فێرە گەنم چاندن کردووە. لە شان بەشانی ناوی پیرۆز لەلای سۆمەریەکان– ئەوانە زانیویانە لەکاتی شین بوونی کژو گیای سروشتی کەژ خۆش بوون بزانن جەژنی بەهارو ڕووداوی ڕزگار بوونیان لە نێو ڕۆژەکانی سالّ دەستنیشان بکەن بەلآم سالّەکانیان ناویان هەبووە کەواتە هەر چەند سالّێکی حوکمی پاشاکەیان بەناوی ئەو پادشایە کردەوە کەواتە هەر چەند سالّێك‌و ناوێکی هەبووە ڕوداوەکانیان باس کردوە لەم سالّەدا وەك لەدایك بوون‌و ڕوداوی جەنگ‌و کارەسات‌و دیاردە سروشتیەکان کەواتە لەسەردەمی گوتیەکان کە (٢١) پادشایان حوکمی ناوچەکەیان کردووە پاشان کۆتاییان پێ هات لە وولآتی سۆمەردا ناوی ئەم بیست‌و یەك پاشایە بەڕای من ژمارەی بیست‌و یەکی لەلاپیرۆز کردون، دروست دەکا کە ئەوانیش وەك سۆمەری‌و ئاریانی دوای خۆیان بیست‌و یەك ناوی پاشاکانیان لە (٢١) ڕۆژی ئەو مانگە نابێ کە نەورۆزی تێدایە؟ لەسەردەمی ساسانیان (٢١) ڕۆژ پێشی نەورۆز لەمالّی پاشا دوانزە

(٢١٣) نەورۆز در کردستان– هەمان بەش.

پایە لە خشتی کال دروست دەکرا، لەهەر پایەیەك دانەویڵەیەك دەچاندرا وەك گەنم جۆ، پاقلە..هتد. ئایا ئەم (٢١) ڕۆژەی پێشی نەورۆز پەیوەندی بە (٢١) پاشاو دانانی (٢١)ی ئازارەوە نیە لەگەڵ (٢١) تۆپ هاویشتنی پێشوازی مەلیکەکان و شێوانی شامان (١٢) سمبولی (١٢) مانگی ساڵ ناگەیەنێ. بۆ هیمای (٢١) پاشاو (٢١) سەرکەوتن و حوکم کردنی بابل و سۆمەرو ساڵەکانی ئەوکاتە؟ بۆی هەیە هەر لەبەرئەمە ڕۆژی (٢١)ی ئازار هەڵبژێردرابێت بۆ یادی نەورۆز. وەك چۆن ئێستا هەفتەو مانگتان دەخەینە پێش چاو بەناوی خواوەندو پاشاکانیان کردوە[٢١٤].

ناوی ڕۆژەکانی هەفتە کە بەناوی خواوەندەکانیان کردوە لەسەردەمی زەردەشتیاندا(٢١٥).

| | ناوی ڕۆژەکان لە سەردەمی سۆمەر یان گوتی کە ناوی خواوەندەکانی سەردەمی سۆمەرییانە |
|---|---|
| ١. ئاهورامزدا. | ١. ئوتو |
| ٢. ڤوهمن (بەهمەن) | ٢. ننار |
| ٣. سپن ئارئیتی (سپندار مەر ئەسفەند | ٣. ئان |
| ٤. ئەشەوە هێشتە (ئوردی بەهەشت) | ٤. انکی |
| ٥. هائورتان (خورداد) | ٥. انلیل |
| ٦. ئەمرتات (ئەمرداد) | ٦. انانا |
| ٧. خشترو ئیریا (شهریوەر). | ٧. ننورتا |

(٢١٤) هەمان سەرچاوەو سەردەمی ساسانیان و نەورۆز.

(٢١٥) نوروز در کردستان.

سالّی زەردەشتیان دوانزە مانگ بوو هەر مانگێك و ناوی خواوەندێکی لێنرابوو[٢١٦].

١. فروردین (فروس ها)

٢. اردوهشت (اسیو هشت)

٣. خورداذ (هورتات)

٤. تیر (تشتری)

٥. امرداد (امرتات)

٦. شهریور خشرویری

٧. مهر (میثر – Kithra)

٨. ئابها انهایتا (ئابان)

٩. ئازر (ئاتر) (ئاتش) *Adhur*

١٠.دذو (خالق، اوهرمز) *Dadhv*

١١. وهمن (وهومنه)

١٢. اسپیندار مند (اسپنت ئارمیتی)

ناوی ڕۆژەکانی مانگی زەردەشتیان کە هەریەکەو بەناوی خواوەندێك کرا بوو بەم جۆرەیە[٢١٧].

١. او هرمز

٢. وهمن

٣. اردوهشت

٤. شهریور

٥. سپندارمز

(٢١٦) کریستن سن ص٢٤٦ ایران در زمان ساسانیان ص ٢٤٦ بەزمانی فارسی ترجمە رشید یاسمی.

(٢١٧) هەمان سەرچاوە ص٢٣١– ترجمە رشید یاسمی.

٦. خورداد

٧. امرداذ

٨. دذو

٩. ئاذر

١٠.ئایان

١١. خور

١٢. ماه

١٣. تیر

١٤. گوش

١٥. دذو

١٦. مهر

١٧. سروش

١٨. رشن

١٩. فروردین

٢٠.ورهران

٢١. رام

٢٢. وداذ (وداذ) (واذ) (انگران)

٢٣. دذو

٢٤. دین

٢٥. ئەرد

٢٦. اشتاذ

٢٧. اسمان

٢٨. زامداذ

٢٩. مهرسپند

٣٠. انگران « ناوی ١٢ پاشای گوتی »

کەواتە ئەگەر ناوەکان کە (٢١) ناوە بۆ هەفتەو دوانزە مانگ نەگونجا بێ یان جێی نەبوبێتەوە بەڵام لەنێو مانگێکدا بۆی هەیە (٢١) ناوی پادشـاکانی گوتـی لە وولاتی سۆمەردا[٢١٨]. کە ١٢٥ساڵی خایاند ناوی لەڕۆژەکانی مـانگی نـەورۆز نراوە، ئەمەش پاش ئەوەی ساڵ ژمێر دۆزرایەوە و پێ بـەپێ پـەرەی پێدرا تـا گەیشتە دانانی سـاڵەکانی زاینـی کـەلتوری ئـەم ناولێنانەکۆنینـەش بـووە نـاوی (٢١)ی مانگی ئازاری ساڵی زاینی بەڵگەشمان ئەو خۆ ئامادەکردنەیە بۆ ئاهەنگ کە (٢١) ڕۆژ پێشتر دەست پێدەکا واتا (٢١) ڕۆژ پێـش ئاهـەنگ گـێڕان خۆیـان ئامادە دەکەن دانەوێڵە دەچێنن تا پێبگا بۆ ڕۆژی ئاهەنگ:

١. ئێردو پیزیر
٢. ئیمتا
٣. ئینکیشوش
٤. سارلاگاپ
٥. شولمێ
٦. ئیلولومش
٧. ئینیما باکێش
٨. ئیگێشا ئوش
٩. یارلاگاب
١٠. ئیباتێ
١١. یارلاگاب
١٢. کوروم
١٣. خابێل کین
١٤. لائیرا بووم
١٥. ارارام لە وارام– بهرام نزیکە
١٦. ئیبرانوم– لە ئیبراهیم نزیکە
١٧. خابلوم
١٨. بوزور–سین
١٩.یارلاگاندا
٢٠.سیئو
٢١. تیرگان[٢١٩]

بۆ نمونە ئێستاش لەم سەردەمەدا ڕۆژانی هەفتە هەر ڕۆژەو ناوی تایبەتی خۆی هەیە. کـە پـاش ووردبونەوەیـەکی زۆر مانـای ناوەکـانم کەوتـە دەسـت بـۆ

(٢١٨) فاضل قەرەداغی– مێژووی دێرینی کوردستان ١٨١ ١٨٢.

(٢١٩) ئەم (٢١) مەلیکە گوتیە بە هەڵبژاردن هاتوونەتە سەر حوکم یەکەم پرۆسەی دیموکراتیەت و شۆڕشی دژ بە کۆیلایەتی و ئەژدیهاکی سێ سەرە بە سەرۆکایەتی (گوتی گاوەیی–هیندۆ ئاری) دوور لەیاسای خاوەندایەتیفرعەونیەکان بڕوانە هەمان ئەو سەرچاوانەی سوودم لێوەرگرتوون دەربارەی گوتیەکان.

میللەتەکەمی شی دەکەمەوە کە بەم جـۆرە خوارەویـە پێشـەکی لەبـەر ئـەوەی ژماردنی شەو ڕۆژ بەهۆی مانگەوەیە لە ئاینی ئیسلامەتی کەواتە ئێوارەکـان بـە هـۆی مانگـەوە ڕۆژەکـە دەژمـێردرێ وەك ئێـوارەی یەکـەم ئێـوارەی دووەم ئێوارەی سێهەم هەتا دوایی

١. شەممە: لە (شام ماه) ەوە هاتووە شام بەمانای ئێوارە ئەوەش لە ووشەی شیویی دەخۆم- شیو- شیڤ-یان شامی دخۆم بەمانای نانی ئێوارە (ئـاق شام) بە تورکی ئاری یان فارسی- کوردی بە مانای (شەوی سپی) دێت کە مەبەستی ئێوارەیە. شام- لێرەدا بەمانای ئێوارە مانگ دێـتن. وەك لـە ڕۆژ ئێوارەکانی دیکە زێتر ڕوون دەبێتەوە.

| کوردی | سۆمەری | ماناکەی خواوەندی | انگلیزی |
|---|---|---|---|
| شەمو | ننورتا | زحل | Saturday |
| یەك شام | ئۆتۆ | هەتاو | Sunday |
| دوو شام | ننار | مانگ | Monday |
| سێ شام | ئان | (ئاسمان) مریخ | Tusday |
| چوار شام | انکی | (خاك) عطارد | Wednisday |
| پێنج شام | انلیل | (خواوەندێکە)مشتری | Thursday |
| هەینی | إنانا | (خواوەندێکە) زهرة | Friday |

٢. یەك شام: بەمانای ئێوارەی یەکەم.

٣. دو شام: بەمانای ئێوارەی دووەم.

٤. سێ شام: بە مانای ئێوارەی سێهەم.

٥. چوار شام: بە مانای ئێوارەی چوارەم.

٦. پێنج شام: بە مانای ئێوارەی پێنجەم.

٧. هـەينى[٢٢٠]: بـە مانـای (ئـاينى) رۆژى (ئـاين) و جمعـەو جەماعـەت وەك عەرەبى (جمعە)ى پێ دەڵێن كە كينايەيە بۆ نوێژى جەماعەتو كۆبوونـەوە كەواتە هەينى لە ئاينى هاتووە بە جێگۆركێ كردنى (ها) لە (گەڵ) (ئا) وەك هەيرۆ– ئەى رۆ.

تێبينى: ماناكانى رۆژانى لاتينى زۆربەى ناوەكان هەمانماناى كوردى سۆمەرين وەك رۆژى خـۆر، رۆژى مـاه (مـانگ) رۆژى ئەسـتێرە و ئاسمـان و خـاك و خواوەندەكانى ديكە.



طبل الـ (بلاكو) الذي يستعمله كاهن الـ (كالو)

دهۆڵ و زورنا لێ دان بۆ جەژنى بەهار و گەنم چاندن و دورويێنەوە، سەيرى سمبولە گەنمى سەرەوە بكە ماناى چاندن

(٢٢٠) بۆ ناوى رۆژەكانى هەفتەى سۆمەرى بروانە متون سومرية، خزعل الماجدي، ص٣٥٢.

## سێ سەرنجی پێویست

١. ئاشكرا بوو بەهۆی هەڵبژاردنی بیست و یەك مەلیكی گوتی دەكاتە بیست و یەك ئاهەنگ كە بیست و یەكی ئازاریش لەوەو لە رزگاربوون لە كۆیلایەتی هاتووە گوتیەكانی كورد یەكەم كەسێكن خاوەنی پرۆسەی هەڵبژاردنن لە مێژووی هەموو جیهاندا دژ بە دیكتاتۆرییەت لە هەموو سەردەمێكدائەمەش سیمای چیانشینەكانی زاگرۆسە جێگای زۆر میللەتی تری لەلا بووەتەوە وەك بەڵگە لەگەڵ فرەئاینی و مەزهەبی تاكو ئێستا.

٢. لەكتێبی اللور الكورد الفیلیون ی– عبدالجلیل فەیلی دا هاتووە كەوا (لە ڕۆژی نەورۆزی ئاشوری لە مانگی نیسان لە ساڵی ٦٧٣ پ.ز) میدیەكان دەستیان بە شۆڕش كرد بە سەرۆكایەتی خشترین (مامی تیارپو) و دوسانتی حاكمی دهیوپاتی *Dehyupati.*

بوون لە ناوچەی مادایو سپاردا لە میدیاو ماننـاو گیمریەكان كە دیاكۆنۆف ص ٣٧٤ دەڵێ هەموو ناوچەی میدیا ڕاپەری)) ئەم پەرگرافە لاونیو تێمان دەگەینێ ئاشووریەكان نەورۆزیان هەبوو بەڵام ناوەكەشی هی ئەو سەردەمە نیە وەپێش ماددەكانیش ئەم جەژنە هەبوو بەڵام ناوی نەورۆز نەبووە بەڵام بەهەمان ماناو هەمان ناوی (كاوە) هەبوە كە ئێمە باسی جەژنی سەری ساڵی ئاشوریەكان دەكەین دەبێ ئەوە بزانین ئاشوریو بابلی پاشماوەی شارستانیەتی سۆمەریەكانن چونكە ئەوان هاتنە سەر حازرەكی شارستانیەتو هێڵی بزماری هونەری سۆمەریەكان جەژنی بەهار چاندن و ڕزگاری كۆیلەكان كە هەمان جەژنی كاوە گودیایە وەك هەموو هونەرو نەریتوو شارستانیەتەكانی دیگە لە سۆمەریەكانەوە لەسەری هەڵداوە وە بەتایبەتی لەسەردەمی حوكمی

گوتیـەکان‌و بـو لەناوچـەی سـۆمەر بەتایبـەتی لەناوچـەی رۆژهـەڵاتی ناوەڕاســتدا بەگشـتی بۆیـێ ئاشـوریەکان جـەژنی (بـەهار هاتنـەوەو چاندنیـان) (نـەورۆز ) بــە کوردیەکەی لە گوتیەکان بۆ ماوەتەوە بـە هـۆی سـۆمەریەکانەوە یـان بـابل یـان ڕاستەوخۆ.

٣. گاوە– گۆدیا بەهاوکاری گوتی‌یەکان و کۆیلەکانی‌کورد لە بین النـهرین یەکەم شۆرشی دژ بە کۆیلایەتی و رزگاری لەدەست خواوەندەکـانی مـار لەسەر شان و قۆچ لەسەر سەر بەرپا کـرد بـە بەڵگـەی (گـاوە – گۆدیـا) قۆچی لەسـەر نەنا داوای مەلیکایەتی نەکرد بـاجی دەدا گوتیـەکان زاوای سۆمەریان بوو جەمەدانی لەسەرو پیستەی گا لەبەر بـوو، ئەژدیـها کـوژو هەژار پـەروەرو ئاشتی خوازو پەیام بەری برایەتی بوو.

# ئاگرو نەورۆز

ئاگر كردنەوە بۆ سەرما ئاگر كردنەوە بۆ پەرستن ئاگر كردنەوە بـۆ ڕێگـا ڕۆناكردنـەوەوهاتو چـۆی شـەوان ئـاگر كردنـەوە بـۆ ئاهەنگـەكانی ئۆلۆمپـی یـا جەژنی لەدایك بوونی مەسیح وەك (مۆم) یان ژمارەی ساڵەكانی هـەر مرۆڤێـك و ساڵی لەدایك بوونی ئاگر كردنەوە وەك (ئیشارەت) بۆ كۆبونەوەو ڕوودانـی هـەر مەترسیەك، ئاگر كردنەوە وەك ئیشارەتی سەركەوتن و لەسەر لوتكەیەكەوە بـۆ سە ر لوتكەیەكی دیكە لەوانە ئەو ئاگر كردنەوەیەی وەك سەركەوتنێك نەورۆزیان بە دانیشتوانی دۆڵو قەد چیاكانی كوردستانیان ڕاگەیاندبێ لەكاتی سەركەوتنی گودیەكان (گوتیـەكان) بـە سـەر سـیمبولی خواكـانی دیلیـەتیو ئەژدیهاكـە سێ سەرەكانی بابلو (مار) لەسەر شانەكان، بەڵام (ئـاگر) لـەو كاتـەدا زێـتر بـرەوی ساندو پەرەی پێدرا كە بـوە سـیمبولێكی پەرسـتن ئـەویش لـە دوای گوتیـەكان سەردەمی هاتنی ئاینی گوتیەكانە عبیدوڵلا ئـەیوبیان لەبەشـی (ئـاگرو پیشـەی ئاگر) دەڵێ:

ئاگر زاراوەیەكی ڕەسەنی ماددیە لە ئاڤێستادا بـە ئـاتر Ater فارسـی كۆن (Ater) پهلوی ئاتۆر atur لە فارسی ئازەر ئـادەر ئاتـەی لـە كوردیـش (ئاگر) (ئاور).

(ژوستن) لە نوسینەكەی خۆیدا دەڵـێ نـاوی سـەرداری مـاددی بچـوك بـە ئازەربیجانی بە ئاگر پات نوسیوە، (ئاگر پات) مەبەستی ئازربیجان بـووە– كـە دەكا میدای بچووك شوێنی سـەرهەڵدانی ئـاگرو ئـاینی زەردەشـتی لـە ڕەزاییـە (ئارومی) (ئورمێ) شوێنی سەرهەڵدانی ئۆلی زەردەشتی، ئەوكاتە ئاگر كردنەوە

برەوی ساند کە شاهنشاهی هەخامنشی (خشیارشـاه) (٤٨٦– ٤٦٥ پ.ن) [٢٢١]. شای (شوشیو هەمەدان)و هەموو ناوچەکە کـە دەولـەتێکی میـدی هەخامنشـی هاوبەشی بوو فەرمانی دا لە جێگا بەرزەکاندا بە ئەندازەیەکی دیار بورجی بڵندو بەرزیان دروست کرد تا لەسەریان ئێشگ پاسـەوانان دابنێـنو تـا بەشەوسـوود وەرگـرن لـە ئـاگر بـۆ ئیشـارەتدان بەیـەکتری لـەم سـەر تـا ئـەو سـەری سـنور هـەواڵیان دەگایـەندە پایەتـەوخت، لـە شـانامەدا هـاتووە کـەوا بـە هـۆی ئـاگر داگیرسان سوپاکانیان کۆ دەکردەوە ، ئێستاش بەهۆی ئاگر خەبەری ڕەمـەزانو ڕۆژو شکاندن لە دێهاتەکان یان پێش ڕادیۆ داهینان بە ئاگر ئاگاداری میللەتیان دەکردەوە کەواتە پەیوەندی ئـاگر بـەم شـێوە بـوو بـە هـەمان شـێوە ئاگریـان دەکردەوە لە کاتی جەژنی نـەورۆزو ئاهەنگـەکانی کـە بـە شـەوقترین دیـاردەی سروشتی لەبەر دەستی مرۆڤە کە مرۆڤ نەشئەی لـە ڕووناکیەکـەی وەردەگـرێ بە هەمان شـێوە لـەکاتی سـەرکەوتنو ئاهـەنگو هەواڵـە خۆشـەکان ئـاواش بـە کەڵکی هاتووە لەکاتی فریاکەوتنو هەواڵە ناخۆشەکان. تەنانەت زاگر– زاگـور– (ئاگور) جۆرە موسیقایەکی ئاگری تێدادە دۆزیتەوە وەك چۆن (ئـاگر پایگـان) کە ئاتر پایگانە (ئازربیجان) هاتووە بـۆی هەیـە (زاگـور)[٢٢٢] لـە شـوێنی زاینـی ئاگرەوە هاتبێ یان چونی چیاو ئاگر لە بەرزبوونـەوە وەك (گـڕ) (گـرد) بونـەوە یان هەر ئاگر لەم شوێنەدا بـەرەو ڕێـزو جـۆرە پیرۆزیـەکی هـەبووە بـۆی هەیـە ڕەنگدانەوەی هەمان مانابێ، بە هەر حالْ ئاگر لە هەموو سـەردەمەکان نـەك بـە تەنیا بۆ نەورۆز بۆ زۆر کاری تر بەکارهاتووە بەڵام لایەنی کردنەوەی ئـاگر وەك

---

(٢٢١) نەورۆز درکردستان (ئاگر).

(٢٢٢) بەڵام کە دواتر رایەکی دیکەمان بەلا راستترە کە لە (زەردکۆر) دوە هاتبێ کە (زەرد) بە هـەمان شێوە کینایەیە بۆ (ئاگر).

هەواڵی سەرکەوتن‌و شادی لەگەڵ نەورۆز یەکتریان گرتۆتەوە وەك یەك جەستە ئینجا لەهەر سەردەمێك دابێ. کە تێکەڵ بە یادکردنەوەی نەورۆزبووە.



دروشمی کاوە کە بازێکە نزیك لە هەمان بازی سۆمەری دواتر پێ بەپێ دروشمی دەوڵەتە ئارییایی و کوردەکان بوە تا دەگاتە دەوڵەتی ئەیوبی، بە جیاوازی باڵ بۆ خوارەوە چەماوە.



ئالای کاوە یان (درەفشی کابیان) لە هەمان ووشەی گابانی نزیکە چوار رەنگی خوارەوەی سەوزو زەردو سپی و سور هەمان رەنگی ئالای کوردستانە کە پێوەی شۆر بووەتەوە لەناوەوەش خۆری وەك نێرزگزو پڕ لە مرواری.

ئەم دوو وێنەیەم لە کتێبی فروهەر یا شاهین نوشتەی م. اورەنك وەرگرتووە



- سۆمەری .

رمز الإله ننورتا (طائر الصاعقة)
















**کاریگەری دروشمی کاوە- گۆدیا گوتی بە درێژایی مێژوو**

**سەرچاوەی وێنەکان: ١- فروهەر٢- متون سۆمەریە (خەزعەل) ٣- سەلاحەدین ئەیوبی من جدید (سەرسام)**




**ناوچەی گوتیان و زاگرۆس و ئیراقی کۆن و سۆمەر**




**قەبارەی ئێراق لە سەردەمی عەباسیاندا**




مخطط (٢)

مخطط مقترح للأصل الرافديني الشمالي (العراقي) ولكيفية تشكّل أجداد السومريين في الجنوب الرافديني

## هێڵکارییەکی خەزعەل ماجدی کە شوێنی سۆمارو سامەرا بە سەروچاوەی سۆمەرییەکان دادەنێن واتا سۆمەرییەکان زاگرۆسین



گەنم و ئاهەنگ لە وێنە قورپینەی سۆمەرپیدا



٢٨١ ـ اور : مسلة اورنمو مفصلة ـ الملك يصب الماء المقدس امام الالهة لتكال ـ متحف الجامعة فلادلفيا



[illegible]

## گەنم و گا لە (موجز تاريخ العالم ) لا ٧٩-٨٠ هـ. جـ. ویلز دەڵێ

(**ئارییەکان**) گەنمیان هێنا بەرهەم وە خاکیان بە (گا) دەکێڵا یەکەم کەسێک بوون توانەوەی ئاسنیان دۆزییەوە

**سەیری وێنەی (١) چەپڵە لێدان و گەنم ئاودان و ئاهەنگی پیرۆزی ئازار (نەورۆز)**



(گۆدیا- گاوە) لەکاتی نوێژ کردندا سەیری جل و بەرگ و چۆنیەتی دەست گرتنی



نرام سن و ئەنفال کردنی چیا نشینەکانی ناوچەی شارەزورو کەرکوك قوولایی لولو و گوتیەکان

(٤)




**ئەژدیهاکی سۆمەری و گودیای وەرزێر لە تابلۆ قوڕینەکەی ڕەسەندا**

**سەیری دەمی کراوەو هەڕەشەی مارەکەو توند دەستگرتنی گۆدیای بچووك و سەری خوراوی و پیستەی گا لەبەری و خواوەندە سۆمەریەکان چیخ لەبەرن کە ناوچەیان گەرمەو گوتیەکانیش چیانشینن.**



وێنەی جەژنی ( ٢١ )ی ئازار و دارچاندن سەیری دەستی مەلیکی کڵاو لەسەری گوتی بکە بەرامبەر بە خاوەندی سۆمەر چۆن شتڵە گەنم ئاو دەدات لە وێنەی خوارەوەش وە بیناکاری و بیناسازی وەك هەموو نەورۆزێکی کورد سەیری دوو دەستەکەی پشتەوە بکە چەپڵە لێدەدا – مانای ئاهەنگە لە وێنەکان



ئەژدیهاکی سێ سەر وەك لە ئاڤێستادا هاتووە سەیری ئەو دووگە نجەی چاوەوڕێن مێشکیان دەرخواردی دوو سەرکەکەی سەر شانی ئەژدیهاك بدرێت یەکیان مێشکی شەق بووە مێشکی دەرهـاتووە لـە دەستی ئەژدیهاکە دەرخواردی سەرکەکەی سەر شانی دەدا دووماریش وەك داکانەی ئەفسانەکە هەڵواسراوە وەك سەرو چاوەی ئەفسانەکەیە کە پاش ٤٠٠سالٚ لە مێژووی وێنەی یەکەم کە(مار)ە.



**چۆنیەتی دەست گرتن لەکاتی نوێژدا لەسەر دەمە جیاجیاکاندا:**

١. مەلیکە بێر عیلامی ١٢٥٠ پ. ز

٢. وێنەی دووەم لەسەرەوە ( دەست گرتنێك لە لای یابانیەکان )سەدەی ( ١١ )

٣. چۆنیەتی دەست گرتن ( ماری نیوەی سەدەی سێیەم پ.ز)

٤. سووسە عیلام هەزارەی سێیەم پێش زاین

- وێنەکان لەکتێبی ( سومر فنونها ) ( اندری بارو ) وەرگیراو.



نووسەر دووەم کەس لە دەستە راست لە بابل لەگەڵ چەند نووسەرێکی بیانی



نووسەر لە دەستەڕاست لە پێشەوە لە تەك د. غەزعەل ماجیدی

لە پێشوازی نووسەرانی مەغرب لە هەولێر

# دەرئە نجامی گشتی

دوا بەدوای بڵاو کردنەوەی درەفشی کاویان جابیان واتا ئالآی کاوەییان لەبەرگی هەفتە نامەی گوڵانی ٤٧٧ لە ٢٠٠٤/٣/٢٥ بەرەنگاو رەنگی وەك ئاگاداری بۆ دەست پێکردنی ئەم لێکۆلینەوەیە هەر دوا بەدوای قۆناغەکانی مێژووم یەك لەدوای یەك پشکنییەوە بەرەو ناوچەی بابلیان بردن کە شوێنی ئەژدیهاك و کاوەو رووداوەکەیە لە نێو وێنەکانی سۆمەری سەردەمی گوتیەکان گەیشتمە وێنەی ئەژدیهاکی دوومار لەسەر شان و یادی جەژنی ٢١ی ئازارو (کە بەسۆمەری بە (ئێزن)ی سەری ساڵ ناو زەند کراوە کە رزگار بوونە لە کۆیلەتی و هاتنی ساڵی تازە یەکەم رۆژی نوێی ساڵ کە بەکوردی دەبێتە نەو رۆز بەکۆی زانیارییەکانی زمانەوانی و ئەرکرلۆژیاو سەرچاوەی مێژوویی و بەراورد کاری هونەری وێنە کێشان لەیەك کاتدا بۆمان ئاشکرا بوو ئێراق لە ئارۆکی سۆمەری و ئاری واقی کوردان هاتووە هەمیشە گوتی و کاشی و عیلامیەکان بالآ دەست و زۆرینە بووینە بەرامبەر بە ئاشورو ئەکەد و بابل کە بۆ ماوەی کەم کەم توانیویانە لە فورات بپەڕنەوە پاشان بەدەستی میدیاو گوتی و عیلامی لەناو چوون). سۆمەرییەکان جۆرە گرووپێکی زاگرۆزی هیندۆ ئاری ئەو رووپی بوون وەك لە زمان و ئایینیان بەدیار دەکەوێ لە کوردو هیندۆ ئارییەکان نزیکن لە (سندەوە تاکو فورات) کە یەك مەودای جوگرافی بێ گرێ و سنوورە، شارستانیەتی (گاو) گا پیرۆزی و ئاینی براهمایی سەر بە ئایینە خاکیەکان بلاو کردۆتەوە

قۆچی گا سومبول و تاجی خواوەندایەتی و مەلیكایەتی بووە لە (بەینە نەهرەین) بەڵام لە رۆژ ئاوای فورات لە (نیل)ەوە فیرعەونیەكان سومبولی (مار)یان لە نێچەوانی خۆیان داوە وەك لە وێنەكانیاندا بەدیار دەكەوێت. داوای خوایەتی و یەك رەنگی بیابانی دیكتاتۆریەتی ئاییتیان كردووەژەهری مرۆڤ كوژی ترس و تۆقاندن سیما و میتۆدی تایبەتمەندیان بووە كە ئاشكرایە ماری گەورە بە كوردی پێی دەڵێن (ئەژدیهاك) یان هەر دڕندەیەك كە لە سەرێك زێتری هەبێت. لێرەوە زۆرانبازی لە نێوان دوو شارستانیەت بەدیار دەكەوێت شارستانیەتی سۆمەری سەردەمی گوتیان گاوەی گۆدیایی لەلایەك و ئەژدیهاكی (مار) لەلایەكەی تر كە مەبەست دوومارى سەرشانی ئەژدیهای (ننكیشزیدا)یە سەری گەنجەكانی گۆدیاكانی گاوەیی و گوتی دەخوارد گاوەو گۆدیا یەك ناو و یەك چیرۆكن ئەژدیهاك هەر ئەژدیهاكە لە هەر سەردەمێك هەرچی ناوێكی هەبێت ووشەیەكی كوردییە واتا مرۆڤ خۆر. لە وێنەكان سیمای هەمان چیرۆكی كاوەیە كە وێردی سەر زمانی كوردە كاوەی مەلیكایەتی نەویست پەیامبەری ئاشتی و برایەتی جوو وەك گۆدیا لەپاش مردنی بووە خۆشەویستی هەموو لایەك بە نەمری مایەوە چونكە رزگار كەری كۆیلەكانە لە سۆمەرو بابل سومبولی ماریش بووە ئەهریمەنی نەفرەت لێكراو كە مرۆڤی لە فردەوسی بەهەشتی ئیلام (ئیرەم) بەدەر كردندا بەم جۆرە لە سفری تەكویندا (٢ ، ١٤ ) باسی بەهەشتی چوار روباری زاگرۆزی كوردستانی كردووە دەڵێ: (خواوەندی گەورە بەهەشتێكی لەلای رۆژ هەڵاتەوە رواند، لە عەدەن چاوی

پێدەگەشایەوە بۆ خواردن دەشیا، رووبارێك لە عەدەن ئەم بەهەشتەی ئاو دەدا، پاشان دابەش دەبووە چوار سەر ، ناوی یەكەمیان (بیسون) بووە وە رووباری دووەم (جەیحون) و ناوی رووباری سێهەم (حدقل) بوو كە بەرەو رۆژ هەڵاتی ئاشور دەچوو رووباری چوارەم (فورات ) بوو) ئەمە وەسفی كوردستانە پاشان بابلیەكان تیشكیان لەجیاتی مار لەسەر شانی خواوەندی بابل دروست كرددوای ئەوە هزری فریشتەی سەر شان پەیدا بوو خێرو شەڕی گەراندەوە دەست خوودی مرۆڤ خۆی خۆی خاوەنی خۆی و كردەوەكانی بێت لێرەدا مەبەستمان دۆزینەوەی راستیەكانە بەهۆی كلیلەكانی بەردەست لەوانەش كاوە كە هەزاران ساڵە لەلای كورد چیرۆكی پارێزراوە، هەروەها دۆزینەوەی پاشماوەی باپیرانمان لەوانەش كە پاش ماوەی گوتیەكانە هەروەها لادانی لامژەكانی سەر شارستانیەتی رەسەن وە گریێ دانی رەوشی پۆڵەكانی ئێستای كورد لەگەڵ باپیرانی دێرین بە شێوەیەكی زانستیانەی هەمەلایەنی بونیەو یانە كە ناوی لێدەنێم (مێژوو نووسینەوەی بونیەوی) هەمەلایەنی بەرجەستە كراو وەك قوتابخانەیەكی تازە لە جیهانی مێژوو نوسینەوەی زمانەوانی ئەركۆلۆژی مێژوویی كە لای ئێمە باو نەبووە مانەوەی ئەم چیرۆكەش كە لە چەند دێرێك زێتر نەبوو لە نێو كوردان بەڵام بەڵگەی ئەوەیە كە كورد هەڵقەی تەواو كەری شارستانیەتی سۆمەری و گوتی یە میرات هەڵگری هزرو كلتووری ئیراقی كۆنە خاوەن ناوچەكەی رەسەنە لە نێو هەموو میللەتان و هاوردەكان كە پاشماوەی ئیمپراتۆریەتە داگیركەرەكانن.

# دەرئه نجامی مێژوویی

طاوانیەکان ئاشماوەی طوتیەکانن

لەگەڵ بیروڕای ئو.ل. ڤیلچیڤسکی دەربارەی گوتیەکانی کورد لەناوچەی بابلدا.

**کاتێك گەورەترین مێژوو نوسی کورد پرۆفیسۆر ئەمین زەکی و پرۆفیسۆری دانیشگای بینسلڤانیا ی. ئا. شپێزەر گوتیەکان بە باپیرە گەورەی کوردەکانی ئێستا کە دادەنێن، ئەوا هیچ دژی ڕاکەی ی. م دیاکۆنۆف نیە سەبارەت بەوەی خێڵەکانی گوتی بەشداریان لە دروست بوونی ئیتنۆسی میدی داکردوە. ئەگەر مەبەست لە گوتیەکان خێڵی گوتی واتا مانای ئەم زاراوەیە بێت، ئەوا دەمێکە وون بووە[٢٢٣]. ((منی سەرسامیش بەختەوەرم بەوەی دۆزیمەوە جافی گاوانین (جابانی) هیچ دژی ڕاکەی ئێمە نیە کە گوتیەکان باپیرە گەورەی کوردن لەوانەش جافەکان))[٢٢٤] کە بە شێکن لە کورد.**

چونکە مەبەستەکەی ئێمە دۆزینەوەی ئەو کۆنفدراسیا گەورەیەیە کە گوتیەکان دایانمەزراند، فیدراسیۆنەکە ئەگەر چی نەما بەڵام هۆزە سەرەکیەکان پاشماوەیان ماوە لەگەڵ پاشماوەی ئەوانی دیکە کە لەژێر ناوی جیا جیادان لە هۆزی سەربەخۆی هەموو پانتای کوردستان کە دەچێتە خانەی لێکۆڵینەوەکەمان .

لێرەدا دەپرسم: ئەگەر گوتیەکان باپیرە گەورەی هەموو کورد بن ئایا نابنە باپیری هۆزی جافی جابانیش؟ بۆچونەکانمان بەهێز تربکا؟!

---

(٢٢٣) ئو.ل. ڤیلچیڤسکی– نەژادی کورد، و رشاد میران ص ٥٨.

(٢٢٤) (گاڤسواری) بڕوان ەل١٩٤ زۆرنزیکە لە گاڤانی گاف جاف، کە هەمان سەرچاوەی ئاماژەپێکراو دەکات یان بڕوانە ی.ێ.ڤاسلیەڤا، ل١٧٢، و. ڕەشاد میران کە مەبەستی گاسواری و شوانە.

ڤیلچیڤسکی دەڵێ: گوتیەکان هەمان چارەنووسی ئاسایی ئەو خێڵانەیان بەرکەوت کە سەرکردایەتی کۆنفدراسیای گەورەی سوپاییان کردوە.

داگیر کردنی نێوان (دوو زێ) (بین النهرین خوارووی ئێراقی ئێستا)، گوتیەکانی خستە بارێکی تری بەرزتر وای کرد ببن بە خاوەنی ڕاستەقینەی وولاتەکە[٢٢٥].

ئەو ڕایەی م. دیاکۆنۆف دەربارەی ئەو کۆنفدراسیا خێڵەتیە گەورەیەی گوتیەکان بۆ هێرشکردنە سەر (ئەکاد) پێکیان هێنا بوو. گروپەیەکی خزمی یەکتر بوون[٢٢٦]. شێوەی پێشکەوتووی بنەمای خێڵەتیو بنەماڵەیان هەبوو[٢٢٧].

هەڵسان بە کارێکی گەورەی وا گەورەی وەك هێرشی بردنە سەر نێوان دۆزێی کۆیلەدار لە توانای خێڵە گوتیەکان بە تەنها نەبووە.

بەڵکو بەشی زۆری خێڵە چیایەکانی میسۆپۆتامیای سەروو ناوچەکان دەوربەری بەشداریان تیایدا کردوە، ئەو کۆمەڵە خێڵانەی گوتیەکان سەرکردایەتیان کردوە.

لە یەکێتی‌یەکی تەنها خێڵەکانی خزمی یەکتر گەلێ فراوانتر بووە.

بەهێزی خێڵە ڕەسەنە چیاییەکان بوو لە ڕووی زمانو ڕەسەنو ئینتنیکەوە ناوی گوتی ئەگەر نەبووبێتە ناو بۆ هەر یەك لە خێڵەکان ئەوا بوەتە ناوی هەموو گوتیەکان کە سەرکرادیەتیان دەکرد([٢٢٨]). ئەمەش لەکاتی داگیرکردنی نێوان دۆزێدا (بین النهرین).

–هێرشی کاسیەکانیش (کە چەندین سەدە لەناوچەی بابل ژیانو نیشتەجێبوون دوای گوتیەکان) لە ناوچە چیایەکان ڕۆژهەلاتی باکوری بابلدا پێشتر دەژیان لەوانەیە خەڵکی ڕەسەنی ئەوێ بوبن[٢٢٩]. هەندێ ووشەی کاسیان دەگەڕێتەوە

---

(٢٢٥) هەمان سەر چاوە ص٥٨.

(٢٢٦) ئێستا هۆزەکانی جاف بە یەکتر دەڵێن خزمانی جاف.

(٢٢٧) هەمان سەرچاوە ص٥٦.

١(١) هەمان سەرچاوە ص ٥٧.

(٢٢٩) هەمان سەرچاوە ص٦٨.

سەر زمانی هیندیەکان لێرەدا ئەم ووشانە دەتوانین بەڵگەی ئەوەبن کە لەناو خێڵەکانی کاسیدا لە ڕۆژگارێکدا خێڵێکی هاتووی نارەسەن دورێکی سەرەکی ببینێت بە زمانێکی هیندی دوابێت.

ئەو خێڵەش دەبێ سەر بە خێڵە شوانکارە کۆچەرەکانی دەشتایی بوبێ[٢٣٠].

داگیر کردنەوە بەناوبانگەی بابل لەلایەن کاسیەکانەوە لەساڵی ١٥١٨ پ.ز داو سەدان ساڵەی فەرمانڕەوایان لەسەنتەری جیهانی کۆیلەداری ئەو ساکە کە لە دووبارە بوونەوەی هێرشی (گوتیەکان) بۆ سەر نێوان دووزێ دەچوو[٢٣١].

چونکە یاسای بنەماڵەی هێرش دەکەنە سەر کۆمەڵگای چیندار کە لەئاستێکی پێشەکەوتنی کۆمەلایەتی بەرزدا بوون. بۆیێ بزوتنەوەی گوتیەکان وەکو دیمان پەیوەندی بەڕاستەوخۆ ڕاپەڕینی کۆیلەکانەوە هەبوو[٢٣٢].

گوتیەکان کە بەکۆیلە بۆ نێوان دوو زێ دەبردران بنەمای دانیشتوانی ئەویان لە ڕووی ئنتیکیەوە گۆڕی، بەڵام هێرشەکەیان لەم ڕوەوە لەوە دەچێ گۆڕانکاریەکی وای نەکردبێ، کەچی کاسیەکان لەکاتی دەسەلاتیاندا بەسەر بابل کاریان کردوە سەر بنەمای ئینتیکی ناوچەکە، بەلام کاسیەکان، تەنها بۆ بابل نەچوون کە تیایدا لەگەڵ دانیشیتوانەکەیدا تێکەڵ بوون بەڵکو بەشێکشیان بەرەو سەروە چوون بۆ ئەو ناوچە چیاییانەی خێڵی ڕەسەنی گوتی خزمەکانیانی لێ بوون[٢٣٣].

---

(٢٣٠) هەمان سەرچاوە ص٦٩.

(٢٣١) هەمان سەرچاوە ص٦٩.

(٢٣٢) هەمان سەرچاوە ٦٩، کاسیەکانی کورد لەساڵی ١٥١٨ پ.ز یان ١٧٦٠ پ.ز (اللور – جلیل) خوارووی ئیراقیان داگیر کردو لێی جێنشین بوون، بەهەمان شێوە گوروتیەکانیش بەهەمان شێوە جێنیش بوون کەواتە کوردەکانی خوارووی ئێراق لەوانەش گاوانییەکان لەوانەن لەوانیش کاوە گۆدیا کۆیلەکانی بەشداری شۆرشی کاوەیان کرد لەناوچەی سۆمەرو بابل بە هاوکاری گووتییەکان.

(٢٣٣) هەمان سەرچاوە ص٧٠، و. ڕەشاد میران.

هەر ئەمە بووە هۆی پەیدا بوونی توخمەکانی هیندو ئەوروپایی یان باشتر بڵێین توخمە هیندیەکان، وادیارە لەناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پ.ز دا کۆمەڵە خێڵێکی شوانکارەو هەڵگری زمانێکی هیندی هاتە ناوچەی بەیەکگەیشتنەوەی ڕێزە چیایەکانی ئاسیای بچووكو ئێران، هونەرێکی بەرزی بەخێو کردنی ئەسپ بەکارهێنانی لە ئابووری‌و لە جەنگدا لەگەڵ خۆیدا هێنا[٢٣٤]. لێرەدا منی سەرسام هەستم کرد کە نووسینەکەی ئەم زانیاریە هەمووی لە ڕوانگەی چینایەتیەوە نووسراوە، بایەخی کاریگەری بە هزرو ئاینی نە داوە کە دەورێکی گرنگی هەیە لەسەر دروست بوونی میللەتان‌و تێکەڵ بوونیان بەیەکتر هەروەها دروست بوونی شارستانیەتەکان ئەوەی لە هەمووی گرنگتر بوو ڕێك لەگەڵ لێکۆڵینەوەو دۆزینەوەو بوو چونەکانم گونجاوە بوو کە گووتیەکان بە باوکی کورد ڕەگی سەرەکی‌دا دەنێن، هەروەها ئەو کۆنفدراسیایەی کە گوتیەکان دروستیان کرد، بە زانیاریەکی دیکەی تازە کە زانای نووسەر هەستی پێ نەکردوە لایەنی زمانەوانی دۆزینەوەی پاشماوەی گوتیەکانە کە دەبنە پاڵپشت بۆ زۆر لە زانیاریەکانی دیکە لە هەمووش لەمانە گرینگتر لەلای من هەستکردنی ڤیلچیڤسکی‌یە بەو گۆڕانکاریەی کە گوتیەکان لە ناوچەی (بین النهرین) دروستیانکرد لە کاتی بە کۆیلەیی لە چیاکانەوە بە زۆری دەبردران بۆ نێوان (دوزێ) (بین النهرین) سوخرەو کاری کۆیلایەتیان پێ دەکردن، ئالێرەدا لەلای منی سەرسام سیمای کاوەو شۆڕشەکەی دروست دەبێ دژی خواوەندە سامیەکان‌و سەرهەڵدان‌و ئاشکرا بوونی ئاینی گا پەرستی (گووتی)یەکان (جود) کە بەزمانی سۆمەری بەمانای (گا) دێت وەك باسمان کردوە لە نێو سۆمەریەکاندا چونکە لە نهێنی‌و لایەنە لاوازەکانی ئەم کۆمەڵگایە دەگەیشت تا بە هاریکاری قولایی گوتیەکان زاڵ بوون بەسەر ئەکەدو سۆمەرو لە دوا جاردا

(٢٣٤) هەمان سەرچاوە ص٧٠ ، و. ڕەشاد میران

دوای شەپۆلێ یەك لە دوای یەکی گووتی؛ کاسی، ئیلامی، کە سۆمەریەکان بتوێنەوە لە نێو توخمی کوردا ناوچەکە هەمووی ببێ بە کورد تا هاتنی عەرەبە موسڵمانەکان و داگیر کردنی ناوچەکەو دەرکردن و بە عەربکردنی گاوانیەکان لە (بین النهرین)دا، واتا خواروی ئیراقی ئێستا کە لە بەغداوە دەست پێ دەکا تا (ئوبلە) کە بەسرای ئێستایە.

لێرەدا هەروەها لە هەموو بەڵگەکان بۆمان روون دەبێتەوە دوای سەردەمی زێرینی سۆمەریەکان لە کاتی حوکمی گوتیەکان بە کۆتایی هاتنی حوکمی گووتیەکان کۆتاییان هات بەڵکو سۆمەریەکان لە نێو ناخی کورد توانەوەو بوون بە کوردی گووتی بە هەمان ناو کە (گاوانیەکانی ) نێوان دووزێ لەگەڵ شوێنی سەرهەڵدانی گوتیەکان کە شوێنی ئێستای جافەکانە بەهەمان ناو وەك شیمان کردەوە کەواتە ئەگەر چی زۆربەی کوردی ناوەڕاستی کوردستان پاشماوەی گوتین بەشەکانی دیکەش لە پاشماوەی (کاسی) و ئیلامییەکان بوون بەبالا دەستی گاوانییەکان بە تایبەتی ئەم کۆنفدراسیایە سەرەکیەی دەسەلاتدارە بە درێژای مێژوو کە گاوانیە پاشماوەو هەڵگری ناوی گوتیەکانن وەك جافەکانیش گاوانی گوتین.

# کۆنفدراسیای گوتی و کۆنفدراسیای جافەکان و دووبارە بوونەوەی مێژوو

یـان چـۆن جافـەکان گـاوانین‌و گاوانیـەکان گوتـین، گوتیـــەکان باپـــیرە گـــەورەی جافەکانن.

ئو.ل. ڤیلچیڤسکی دەڵێ:

((شارەزایانی زمانی کاسی دەبەنەوە سەر زمانە هیندیەکان ئەو خێڵەی لێکسیکای هیندی هێناوەتە ناو زمانی کاسی دەبێ سەر بە خێڵە شوانکارە کۆچەرەکانی دەشتایی بووبێ داگیر کردنی بابل لەلایەن کاسیەکانەوە لە ساڵی ١٥١٨ پ.ز و سەدان ساڵەی فەرمان ڕەواییان لەسەنتەری جیهانی کۆیلە داری ئەو ساکە لە دووبارە بوونەوەی هێرشی گوتیەکان بۆ سەر نێوان دووزێ دەچوو))

کەواتە ئەمە دووبارە بوونەوەی مێژووی کوردەکانە لە نێوان دوو ڕووبارو خوارووی عێراقدا.

بەڵام بزوتنەوەی گوتیەکان وەکو دیمان، پەیوەندی ڕاستەوخۆی خۆی بە ڕاپەڕینی کۆیلەکانەوە هەبوو، ئەمەش مایەی سەرکەوتنی بوو، گوتیەکان لەگەڵ ئەوەی سەرکردە خێڵەتیەکان لەئەنجامدا بوو ئەکادی بەلایەنەوە باشتربوو فەرمانڕەوایەتی مێسۆ بۆتامیا لە ڕێگەی میرو نەجیبزادە کۆیلە دارەکانەوەو بکەن و خۆیان هەڵیاندەبژاردن، هەرچی کاسیەکانە لە هێرشیان بۆ سەر بابل پشتیان بەجەماوەری خوارەوەی کۆمەڵگا بابل نەبەست، بەڵکو سوودیان لە کزبوونی بابل وەرگرت، تەواو لەهەمان لاپەڕەی دەڵێ (**گوتیەکان کە کۆیلە بۆ نێوان دوزێ دەبردران بنەمای ئەو پێیان لە ڕووی ئیتنیکەوە گۆڕی پێش هێرشەکەیان دەست پێ بکا،** لێرەدا ئەگەر بەووردی سەیری ڕایەکەی ئو. ل. ڤیلچڤیسکی لە کتێبی نەژادی کورد ص ٦٩ و. ڕەشاد میران بکەین دەبینین بە ئاشکرا شۆڕشی

کۆیلەداری گوتیەکان لە نێو کۆمەڵگای کۆیلەداری سۆمەری بەدیار دەکەوێ یان چۆن گوتیەکان کە مانای سەربە کوردی گوتی و گوتی بوینەو هانیان دەدەن پشتیان دەگرن- کە ئەمەش بە ئاشکرا شۆڕشی کاوەی کوردی گوتیمان بۆ دەدۆزێتەوە کە سۆمەریەکان پێی دەڵێن (گودیا) کە زاوای سۆمەریەکان بووە بە واتا لەوی جێنیشن بووە پاشان حوکمی (لگش)ی کرد خۆی نەکردە (مەلیك) باج خەراجی دەدا بە گوتیەکان بە ئاشکرا سەروو سیمای کاوەی ئاسنگەرو شۆڕشەکەیمان نیشان دەدا دژ بە خواوەندەکانی سێ سەرو حەوت سەر کەواتە (گودیا) کاوە، لەلایەن گوتیەکانەوە هەڵبژێردراوە کوردێکی حوکمی لگش بکات، نەبوو بەمەلیك چونکە مەلیکی گوتی هەبوو یان مەلێکایەتی نەکرد چونکە خاوەن فەلسەفەو ئاینو ئاشتی خواز بوو پاشان ئو.ل. ڤیلچڤسکی لە لاپەڕە ٥٨ دەڵێ:
**((جابۆیێ کاتێك مێژوو نوسی کورد پرفیسۆر ئەمین زەکیو پرۆفیسۆری دانشگای پێنیسلڤانیا ی. ئا شپێزەر گوتیەکان بە باپیرە گەورەی کوردەکانی ئێستا دەزانن))کەواتە بەبێ هەندێش گوتیەکان باپیرە گەورەی جافەکانی ئێستان .**
لە لاپەڕەی (٥٧) دەڵێ هەڵسانی گوتیەکان بە کارێکی وا گرنگی وەکو هێرشی بردنە سەر نێوان دوزێی کۆیلە دارا لە توانای خێڵە گوتیەکان بە تەنها نەبوو، بەڵکو بەشی زۆری خێلە چیایەکانی میسۆپۆتامیای سەرو ناوچەکانی دەووروبەری بەشداریان تێدا کردوە، ئەو کۆمەڵە خێڵانەی کوتەیەکان سەرکردایەتیان دەکرد[٢٣٥]، لەیەکێتیەکی خزمایەتی گەلێ فراوانتر بوو. پاشان دەڵێ:
(ناوی گوتی ) ئەگەر نەبوو بێتە ناو بۆ هەریەك لە خێڵەکان ئەوا بوەتە ناوی هەموو کونفدراسیاکەی گوتیەکان سەرکردایەتیان دەکرد، کەواتە گوتیەکان

(٢٣٥) لێرەدا بە تەواوی بۆمان روون دەبێتەوە کە باسی گووتی دەکەین مەبەستمان (کورد)، ناوی کوردە لەو سەردەمەدا ناوی (گووتی) بەلام (جاف) هەلگری پاشماوەی ناوەکەیە بەلام ناوی کورد نیە بە گشتی ئێستا سەرکردایەتی کوردنا کا سەردەم گۆڕاوە ناویشی گۆراوە.

فەرمانڕەوایەتی میسۆپۆتامیایان بە هۆی گوتیەکان نێو وولاتی سۆمەرو بابلی دەکرد نەك بە هۆی سۆمەریەکان ڕاستەوخۆ وەك فیلڤیسکی دەڵێ بۆ بەڵگەشمان لەوانەش (گودیا)یە کە ناوەکەی بە بۆچونی ئێمە و ئەنجامی لێکۆڵینەوە لە گوتیاوە هاتوە کە هەمان سەرچاوەی چیرۆکی کاوەیە.

وە لەلاپەڕە (٥٨) دەڵێ : (چارە نووسی دەمەزرێنەرانی کۆنفدراسیاکە واتە کوتیەکان. بە مانای تەسکی ئەم زاراوەیە داگیر کردنی نێوان دوو زێ کوتیەکانی خستە بارێکی تری بەرزتر وای کرد ببین بە خاوەنی ڕاستەقینەی ولاتەکە، هیچ سەیر نیە کاتێك ئەم خێڵە بچووکە هەوڵیدەدا، بچیتە ناو سیستەمی کۆمەڵگای کۆیلەداری، کە ڕووخان چونکە گوتیەکان بۆیان نەکرا جێگەی جارانی خۆیان لە کۆنفدراسیاکە بپارێزن). بە رای ئێمەش سەرکردایەتیەکەشیان نەما ناوەکەشیان چیتر نەبووە ناوی هەموو کوردن تەنیا بووە ناوی هۆزە هاوپەیمانە سەرەکییەکان هەر ۆزێکی جیاش بووە و بە درێژایی مێژوو ناوی تایبەتی خۆی پەرەپێداوە لە شوێن و سەردەمی جیاجیا.

## کۆنفدراسیای جافەکان لە ناوچەی جوانرۆ لەسەدەکانی ( ١٥ ) ( ١٦ ) سەرو سیمای کۆنفدراسیای گوتیەکان بەدیار دەخاتەوە

لەلاپەرە (٣٣٤) نەژادی کوردو رەوتی مێژووی دروستبوونی میللەتی کوردی داهاتوو (خاکی دێرینی جافەکان لە ئەردەلانە لە ناوچەی جوانرۆ لە کوردستانی ئێراندا کۆنفدراسیای بە هێزی زۆربەی خێڵەکانیکوردستانی خوارووناوەراست لەژێر سەرکردایەتی خێڵی جاف لە سەدەکانی پانزەو شازدەو پەیوەندی خێڵیەتی جارانیان Barth) رەوایانە لە سترۆ وکتورای ئەم کۆنفدراسیایەدا گەلی سیمای یەکیەتیە تیورکی مەنگولی دەردەخا چونکە لە راستیدا هەموو رێکخراوە خێڵەتیەکانی کوردی، لەسەدەکانی سێزدەو چواردەوە، گۆرانی زۆریان، بەسەر دادێ لەبەر ئەوەی کوردەکان لەناو یەکێتی کۆنفدراسیای خێڵیەتی ئەماندا بوون، لەسەدەی حەڤدەم جافەکان پشتگیری هێرشەکەی سولتان موراد‌ی چوارەمیان کرد لەو کاتەی دەسەلاتیان بەسەر کوردستانی ناوەراستدا دەروا بروانە (دەربارەی جافەکان B. nikitinles kurdes) رەچەڵەکی جافەکان دەباتەوە سەر گۆرانەکانو سیمای دیالیکتەکەیان تەنیاهی بەشە سەرکردە کەیەتی کۆنفدراسیایی جافی خێڵە کوردیەکان دایە هەر چەندە سەدەی سەرکردایەتی جافەکان وای کرد کە دیالێکتەکەیان لە بەشی چیای کوردستانی ناوەراستدا بایەخی سەرەکی وەربگرێت ئەمە بە سەیرێکی لیستی ناوی خێڵە کوردیەکان ئەمین زەکی بەگ خستۆیەتیە نێو پاشکۆی کتێبەکەی– بۆ ئەوەی دڵنیا بین (( لەوەی ژمارەیەکی زۆری کوردی جۆراو جۆر رەسەنو جیاواز کۆچەرو نیشتە جێ دەکەونە ناو کۆنفدراسیای جاف)) دەقەکە تەواو بوو گەربەووردی سەیری هەردوو کۆنفدراسیای گوتیەکانو جافەکان بکەین لە هەمان

شوێن كە لەناوەڕاستی كوردستانە بەڵام لە دوو سەردەمی جیادا لەناوچەی گاوانرود زۆر بە ئاسانی بۆمان ئاشكرا دەبێ جافەكان گاوانرودی گاوانین جافەكان پاشماوەی هەمان كۆنفدراسیا گوتیەكانن جافەكان كە گاوانن جافەكان كە گوتیەكانن كەواتە گاوانیەكان پاشماوەی گوتیەكانن- ئێستاش گەر بچیتە نێو لق و بەشەكانی ئەم هۆزە چەندین شێوە زمان و كۆچەرو نیشتەجێی بە خۆیەوە دەگرێ هەمان سیماكانی مێژوویی پێوە دیارە سەرباری هەموو بەڵگەكانی دیكە. ئەم دۆزینەوەیە كە ڕیشەو نەژادی كورد بەدیار دەخا. جگە لە كاوەو نهێنیەكانی سەر هەڵدانو پەیدا بوونی نەورۆز: كە دەڵێن جاف مەبەستمان سەركردایەتی كوردە كە سەردەمێك جافەكان بوون راستر (گوتیەكان)

پاشان هەر لەم كتێبە كاتێ بابەتی ئەم ناونیشانە لەسەر جافەكان[٢٣٦]. دەخوێنێتەوە زۆر لایەنی دیكەتان بۆ ئاشكرا دەبێت.

١. هۆزی جاف خەڵكی ناوچەی جاوان رودی پاشماوەی جابانەكانن.

لەگەڵ : پێناسەیەكی هۆزی جاف لەم سەردەمەدا: یان ی. ئی. ڤاسیلیەڤا[٢٣٧].

## دەرەنجامی زمانەوانی مێژوویی

پێشەكی لەبیرمان نەچێ هەموو بەڵگەكانی دەوروبەری كاوە لەدەوری گودیا كۆبوونەوە چیرۆكو سمبولەكان لێكیان دا. وەك وێنەی ئەژدیهاك كوژتن، یادكردنەوەی بەهارو گەنم چاندن و ئاهەنگ گێڕان. ئەژدیهاك و مێشكی گەنج

(٢٣٦) بۆ لایەنێكی دیكەی مێژووی هۆزەكانی كورد بەتایبەتی جافەكان بڕوانە (گوایف و عشایر كرد) سندی جالب از روزگار ناصر الدین شاه قاجار – بە كۆششی سید صمدی (فارس) مهابادیان.

(٢٣٧) ی.ئی. ڤاسیلیەڤا- كوردستانی خوارووی ڕۆژهەڵات لە سەدەی حەڤدەوە تا سەرەتای سەدەی نۆزدە.

لەورگێرانی ڕەشاد میران لە ڕووسیەوە، ١٩٧٠ حكومەتی هەرێمی كوردستانی وەزارەتی ڕۆشنبیری.

خواردن لەلایەن مارەکانەوە کە هەموو دەبنە سەرچاوەی ڕوداوەکانی ئەفسانەی کاوەهەموو ئەمانە ئێمەیان برد بەرەو کەئێمە بەم لێکۆڵینەوەیە سیمای ئاینێکو مێژوویەکی تازەمان بدۆزینەوە کە لەبەر شێوانکاری ناوەکانو ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەریدا هاتووە بە درێژایی مێژوو لەلایەن مێژوو نووسانی بێگانەوە نەدەناسرانەوە بىن بەیەك یان مێژوو تەواوکەری یەکتر، جگە لەوە کە ئاینەکانی دوای گوتیەکان وەك زەردەشتیو موسڵمانەتی زۆریشی لەم ئاینە قەدەغەکردو زۆر سیمای وونکردو زۆر مانای لەسەر ڕەتکردەوە، بۆیێ (گاوەیی) تەنیا لایەنی کویلە ڕزگار کردنو جەژنی بەهاری ڕێگا پێدراو بمێنێتەوە لایەنەکانی دیکەی فەرامۆش کردراو وون بوو، جگە لەو زێدە بابیانەی کە خرایە سەری وەك بەدەیەها چیرۆکی ئەفسانەییو چیرۆکی تازە ڕووداوی دوای خۆی بە درێژایی چوار هەزار ساڵ- وەلەبەر ئەوەی سۆمەرییەکان بوون بەکورد وە بوونە میراتگری چیرۆك و ئەفسانەی کاوە لەنێو کوردەکانی گوتی کێشی کە چوار سەد ساڵ زێتر ناوچەی بابلیان حوکم کرد واتا ناوچەی خواروو ئیراقی ئێستا وولاتی کۆن سۆمەرو بابل.چەند هەزار ساڵێکە بابل کاولگەیە بەڵام سامیەکان تەنیا تیشك دەخەنە سەر چەند ساڵەی حوکمەکەیان کە لەناوچەکەیان کردوە . باسی هۆزە کوردەکان یان فدراسیای حوکمی هۆزە کوردەکان ناکەن کەتا دەگاتە ساسانی و ئیسلام کەتەنانەت ساسانی ئاینی زەردەشتی هەزار ساڵی خایاند تا هاتنی عەرەبی موسڵمان بۆ ناوچەکە هەر کوردی گاوانیو هۆزی دیکەی کوردی لێ بوو، بۆیێ بە هۆی سمبولی کاوە کە کلیلێکی کاریگەر بوو بۆ ڕاستی دۆزینەوەی کە نهێنی گرینگی پاشماوەکەی هۆزەکەو زمانی کوردی تێدا دابوو گەیشتینە ئەم دەر ئەنجامەکە:-

١. ئێمە زانیمان سەروسیمای کاوەمان چۆن تەنیا لەسەردەمی گوتیەکانی کورد دۆزیەوە لە هونەرو وێنەکانی کە (گودیا)

بەجێی هێشتبوو لەمەسەلەکەی کە باسی لە جەژنێك جموجۆڵی پاشا دەکا, ئەویش لەناوچەی سۆمەری کە لەژێر حوکمی گوتیان دابوون گودیا پیاوو باجگری ئەوان بوو, جکە لە ئەژدیهاك کە خەڵکی (بابل) بووە. کە بەڕای ئێمە گودیا لە گودیی و جودیەوە هاتووە بەمانای گوتی کە کاوەیە.

٢. وتمان (کاوە)و (گودیا) یەك کەسن لەبەر پێك چونی ناوو مانای ناوو سەراپای چیرۆکی ژیانیان لە داوای مەلیکی نەکردن‌و ئەژدیهاك کوژی لەگەڵ چەندین بەڵگەی شوێنەواری‌و زمانەوانی‌و مێژوویی هارمۆنی ڕەسەن ئیتر چوار هەزار ساڵ دەبێ چەند لەم زانیاریانەی لە ڕێگادا وون بکات زۆر تۆزو خۆڵی ڕێگاش وەك خلتوخاش هەڵگرێ بەبێ وون بوونی بنەما سەرەکیەکان- ئیتر فردوسی یان ڕاکانی دیکەی دەچنە نێو زیادو کەمی سەردەمەکان کە کاریان کردۆتە سەر چیرۆکەکە یان ڕووداوە سەرەکی‌و ڕەسەنەکە...

- ووتمان گودیا لە گودی (جوودی) گوتیەوە هاتووە لەقەبە ناونیە وەك (کیسری)- (قەیسەر)- (فرعەون).......... هتد. کەواتە جودی گودی گوتیە گاوانیە جاڤانی جافە تەواو معادەلەکەو سەردەمەکەیە.
- لەبەر ئەوەی شوێنی ئەژدیهاك و جەژنی چاندن و گودیاو گوتی کوردو کرداری ئەژدیهاك کوشتن و سمبولەکانی چیرۆکی کاوە هەمووی لە بابل و سۆمەر لەیەك کاتو سەردەمن کەواتە (گودیا).
- وتمان (کاوە)لە (گاوە)گاوانی - گوتی- ((گودی))یەوە هاتووە لەقەبە ناونییە بەهەمان شێوە گودیا, گاودیا- (گاو)دی (گاوی) گاوانی‌یە کە (گود) بە مانای (گا) الثور دێت.

- لەبەر ئەوەی پێشترو بەتەنیاو ڕایەکی مینۆرسکی هەبوو کە جافەکان گاوانین‌و منیش بە لێکۆڵینەوەیەکی تەنیاو سەربەست لە بەندێکی ئەم کتێبە ئەمەمان بە زانستیانە سەلماندوە. کەواتە جافەکان گاوانین- کەواتە کاوە- جافە. گاوانیەکان گوتین بەمە جافەکانیش گوتین وە لەهەمان شوێنی ژیاون‌و دەژین‌و کوردن‌و کورد بوینە پاشماوەکانشیان ماوە. شان بەشانی بەڵگەکانی دیکەی دەوروبەری گودیا- کاوە
- لەبەر ئەوە ناوی (جاف)و (گاوە) یەك ماناو یەك ناون (گاو) جابان گاوە- جاف- جاڤان گاف گاڤان- حەرفی (گا) بە (گاف) دەخوێندرێتەوە (ف) (ب) (و) جێگورکێ دەکا لە زمانی ئاریای و کوردی وەك ئاڤ، ئاب، ئاو، کەواتە (گاف) ( گاو)ە ئەمە دوور لەهەموو بەڵگەکانی دیکەو بەتەنیا کە بەڵگەی ڕەسەنایەتی‌و ڕاستی ناوەکەیە، چونکە ئەم زانستیە یەکەم جارە بۆ ڕاستی دۆزینەوەی دەیکەمە (کلیل)و کەس درکی پێ نەکردوە بەم جۆرەی ئێستا. کارێکی مێژوویی و ئەرکۆلۆجی و زمانەوانیە مێژوونووسەکان لە دوولایەنی نەشارەزا بوون یان هەرسێ زانیاریان بەردەست نەبوو وەك وتمان، بۆیێ بە ئاشکرا دیارە گاو گاف گاوەیی کاویان- مەبەست لە هۆزی کاوەو پاشماوەی کاوە وەك بە زانستیانەش سەلمێندرا نەك هەر بە پێك چوونی (جاف)و (گاو). و گاوەو گودیا و گاوانی و گوتی.
- لەبەر ئەوەی ناوی (گاو) بە هێندی‌و فارسی بەمانای (گا) دێت (گ) بە کوردی کە بەحەرفی (پیتی) (گاف) دەخوێندرێتەوە. لەعەرەبی‌و بە حەرفی عەرەبی لە کوردی نوسیندا. یان گاف- گاڤانی کەواتە حەرفی (گاف) لەبەر نەبوونی پیتی (گ) کوردی‌و فارسی یان ئاری بە نووسینی عەرەبی بوەتە (جاف) لە گاوە هاتووە لەسەر زمان

سواوە لەلای کورد بۆتە (کاوە)- بۆیێ (کاو) (جاو) (جاف) یـەك ڕەگـو مانـان کەواتـە کـاوە جافـە لەهـەمان کاتیشـدا هـەمان ووشـەو هـەمان سـەرچاوەو هـەمان مانـان وەك باسمـان کـرد لەمـەوپێش، بۆیـێ کـاوە جافـە- جافـەکان گـاوانین- گاوانیـەکان گوتـین کـە حوکمـی ناوچـەی سـۆمەریان دەکـرد لـە دوای گرتنـی بـەهۆی گودیـا کـەوتمان هـەمان کەسایەتی (کاوە) پێش گۆڕانکاری کە زێترە ٤٠٠٠ چوار هەزار ساڵ بـەر لـە ئێسـتابووە- کـە کـاوە بـە کـوردی گودیـا بـە سـۆمەری کـە زاوای مەلیکی سۆمەریەکان بووە بەڵام ئەوە ناگەێنێ گوتی نەبوە. کـە دیـارە کوتیەکی دانیشتوانی سۆمەر بووە یان لـە کۆیلـەتی ئـازاد بـووە نـهێنی بنەماڵەی مەلیکەکانی سۆمەر بابلو ئەکەدی ناسیوە لێ یان نزیك بـوە- گوتـی بـوە زاوایـان بـوە یارمـەتی گوتیـەکانی داوە گوتـی بـوە بـۆ سـەرکردەیەکی گوتیـەکان یـان متمانـە پێکـراو بـۆ داگـیرکردنو ڕزگـار کردنی گوتیە کۆیلەکانو ئەوانەی گایـان لـەلا پـیرۆزبووە- کـە ئەمـەش جـەژنێکی ڕزگـار بونـە لەدەسـت (ئەکەدیـەکان) کـە بەمـەش کـوردە گوتیـەکانیان ئـەنفال دەکـرد دەیانـبردن بـۆ کۆیلایـەتی لـە نێـوان دووڕووباردا- لەهەمان کاتدا جەژنی بەهارو بوژانەوەوگـەنم و دانەوێڵەو چاندنو کوشتنی ئەژدیهاکی ئەکەدو بابلە (ئەژدیهاکی سـێ سـەر ) وەك لە وێنەکان زۆر لایـەنی دیکـەتان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە. زاوای سـۆمەریان سەربە گوتی دژ بەئەکەدی لەگەڵ گوتی ڕزگار کەربوە.

نـەورۆزیش دووبـارە وەك جـەژنێك لەوێنـەکان بـەدی دەکرێـت بەشـێوەی سەرەتاییو لەسەردەمی سەرکەتنی گوتیە کوردەکـان بەسـەر ئەژدیـهاکی ئەکـەدو بابل وك بەدوورو درێژی بەند بەند باسمان کردوە. جگە لەبەلگەکانی مێژوویـی کـە ئامـاژە بـە بـابلی بونـی ئەژدیـهاك دەکـا و بـەبونی گوتیـەکان لـەو سـەردەمەدا

لەناوچەی سۆمەر و بابل کە هەمووی لەگەڵ بەڵگەکانی پاشماوەی ئێستا یەکتر دەگرنەوە. لەهەموو لەمانە گرینگتر ئەگەر بە زیادەیی دوبەڵگەش بێت:

بەرامبەر بەنەبونی هیچ بەڵگەیەك بەم جۆرە کەلە سەریەك کۆبویتەوە لەهیچ سەردەم و شوێنێکی دیکەدا لە جیهان، بەتایبەتی کوردستان.

تا لێکۆلینەوەی لەسەر بکەم یان ببێتە سەرچاوەو بنەمای سەر هەڵدان و پەیدابونی ئەژدیهاك و کاوەو جەژنی بەهارو چاندن و یەکەم رۆژی نویێ بونەوە لەهەمو سالێکدا ئەویش بکەوێتە پێش مێژووی سەردەمی گوتیەکان لە ناوچەی سۆمەردا واتا پێش ٤٢٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا چونکە رووداوەکانی دوای سەردەمی گوتی لە ولاتی سۆمەردا. واتا دوای ٢٢٠٠ ساڵ پ. ز هەلقەو پابەندی روداو سەرهەڵدانی نەورۆزی گۆتیەکانە ئەوەی دوای ئەو دێت رەتدەکرێنەوە سەرەتانێن بەبنەماو خالّی سەرهەڵدان نا ژمێردرێن دەبنە لاسایی کردنەوەو دوبارەبوونەوە، بەمە بۆ چونەکەمان دەچەسپێنێ وەك لێکۆلینەوەیەکی زانستیانە بۆ سەرچاوەی روداوێکی مێژوویی سەرەتا دیار و ئاشکرا.

# ٢١ی ئازار جەژنی بەهارو سەری سالّی سۆمەری گووتی کوردی هاوبەش و سەرچاوەی نەورۆز

پاش ئەوەی کاری کۆمپیوتەر بۆ لەچاپدانی کتێبەکەم لەسەر کۆتاییدا بوو، پێشانگایەکی کتێب لە کتێبخانەی زانکۆ کرایەوە بە سەدان کتێبی تازەو نایابیان هێنابوو، هەر بۆ کرینی تازەترین کتێب لەسەر سۆمەر، بەپەلە چووم بەلاّم هەندێك لەو کتێبانە هەموو دانەکانی فرۆشرابوون وەك: (انجیل سۆمەر و متون سۆمەریەی خەزعەل ماجدی) کە زانیم کاك ممتاز حەیدەری کریویەتی گەیشتمە لای بە سوپاسەوە کتێبەکە زۆر لایەنی دیکەی بۆ ئاشکرا کردم.

دەبێ ئەوەش بۆ مێژوو تۆماربکەم پانزە ساڵە ناتوانین بچینە بەغدا کە کاتی خۆی لە ساڵێکدا چەندین جار دەچوین بۆ کتێب کرین، ئێستاش لەهەمان شوێنی (حیرە) و کەربەلا نەجەف هەمان سەربرینی حەسەن و حوسێن و دووبارە دەبێتەوە، لە موصل خەڵکی (ملعثایا) لەدار دەدەنەوە؟!! گووتییەکان خەریکی دووبارەبوونەوەن، د. خەزعەل ماجدی هاورێی کۆنم وەك شاعێرێکی نوێخواز ئێستا لە ئوردن خەریکی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانەیە بەبێ ئەوەی هیچ حیسابێك بۆ گووتی و کاشی و لولو و ئیلام و ساسانی بکات.

ئێمەش هیچ دەستکاری نووسینەکانی خۆمان نەکرد کە بە کەرەستە مەعریفییەکانی بەردەست بینامان کردبوو و بەهەمان شێوەش سوودمان لە زانیارییە تازەکانیش وەرگرت کە زێتر بۆچوونەکانمان سەقامگیرتر کرد کە دەربارەی سەرەساڵی سۆمەری لە لا ٣٥٣ متون سومەرییە دەڵێ:

"سۆمەرییەکان ئاسمانیان دابەشکردبوو دوانزە بورج بۆ نەخشەی هاتووچۆی مانگ لە ساڵێکدا، سەری ساڵیان لە (٢١) بیست ویەکی ئازارەوە دەست پێدەکرد"[٢٣٨].

(٢٣٨) متون سومەرییە، خزعل الماجدی، ص٣٥٣.

هەر بورجێك وناوی خواوەندێكیان لێ نابوو بۆ نموونە بورجێكیان خۆیان ناویـان لێ نابوو (گۆ) بە مانای (گا) (الثور) بەعـەرەبی هەسـت دەكـەین خەزعـەل بـۆ یەكـەم جـار پیتی (گ) كوردی بەكاردەهێنێ و ناوی (گۆ) دەبینی هەمان وشـەی (گـا) (گـاوە)یـە بـە زمانی هیندی و فارسی و كوردی ئێستا. هەروەها (گود لولو) یان (گۆلولو) كە ناوی ئەو گایەیە كە گودیـا لـەلای بـوو.. كـە كـڵاوی خواوەنـدی لەسـەر خـۆی نـەناوە وەك دیـارە لەسەری نیە بەمانای ئەوەی گایەكەی بە خواوەند دەزانی كڵاوی خواوەندایەتی لەسەرە (كۆمەڵە قۆچێك پێك دێت وەكو تانج)[٢٣٩] بەڵگەیەكی گرینگی پەیوەندی نیوان (گۆدیا و گاوەیە) كە دەیسەلمێنێ سەروچاوەی ئەفسانەی (كـاوە و ئەژدیـهاك) دەگەڕێتـەوە بـۆ سەردەمی سۆمەری گوتی لەپێش دوو هەزار ساڵی پێش زایین. كە زێتر لە چـوار هـەزار ساڵی بەر لە ئێستایە. كە (گا) وەك بورجێكە لە ئاسمان و ساڵیان كردبووە دوانزە مانگ و مانگیش بە چوار هەفتـە. ڕۆژەكـانی هەفتـەش لەیەكشـەممەوە ئەمانـەبوون: ١. ئۆتـۆ ٢. ننـــــــــــــــار ٣. ئـــــــــــــــان ٤. انكـــــــــــــــی ٥. انلیل ٦. انانا ٧. ننورتا جگە لەمەش:

١. بەهەمان وێنەی ئەژدیهاكی مار لەسەر شانیان دەگوت (ننكشزیدا) كە ووشەكە نزیكـە لـە ئەژدیـهاك. هـەروەها چونكـە (ش+ز) دەنگـی (ژ) دەردەهێنـێ بـە پێچەوانەوە بیخوێنەوە دەبێتە ادیژك (اژیدك).
٢. دەبینین بە جەژنی (ایزنمـاخ) یـان دەگـوت (Ezen-mah) ئـێزن نزیكـی هـەمان ووشەی كوردییە (جێژن)–(جێژن)(جێزن)(ئێزن) یان بە پێچەوانەوە.
٣. خەزعەل ماجدی دەڵی: (گودیا)ی بە (النـبی) پەیامبـەر لەقەڵـەم دراوە[٢٤٠] كـە ئێمە بەهۆی دەرئەنجام گەیشتووینەتە ئەم قەناعەتە جگە لەوە كە بە (مرۆڤـی گا) یان ووتووە (گولولو)[٢٤١] كە وتمان گۆ (گا) یان (گۆلولو) كە گۆ + لولو یـە كە (لۆلۆ) بە مانای مرۆڤی یەكەم (الانسان الاول) یان (الانسان الثور) گۆد لۆلۆ

(٢٣٩) هەمان سەرچاوە، سەیری وێنەكان بكە .
(٢٤٠) هەمان سەرچاوە، ص١٧، متون سومریە.
(٢٤١) هەمان سەرچاوە، ص ١٤٣ یان ١٤١گۆد.

گۆدیا هاتووه له زمانی سۆمەریدا[٢٤٢] یان (گۆلك) (گۆلی) گای بچووك و سەرتایی بەکاردێت بەکوردی بەڵام لەو سەردەمیدا بە گای مرۆڤی یەکەم لە قەلەم دراوه کەواتە (لولو) وەکانی کورد کە پێش گوتیەکانیش ناویان هاتووه بۆی هەیە بە مرۆڤی یەکەم ژمێردرابن. کە هەر خۆی واتە خەزعەل ماجدی لەسەرەتا دەسەلمێنێ کە دەڵێ (ئەو میللەتانەدا لە باکوری عێراق و دەوروبەری کانگەی ئۆیوکۆمێنی کشتوکاڵی بوون کە میللەتی دیکەی هاوسێ بەشدارییان تێدا کردووه. بە دەسکەوتە کشتوکاڵییەکان زەمینەیان خۆش کرد بۆ سەرهەڵدانی شارستانییەت و رەوشەنبیری جیاجیا تا دواییان گەیشتە سۆمەرییەکان)[٢٤٣] . کەواتە هەر لولوەکان وکاسی و کاشی پاشان گوتییەکان ومانناکانی کورد دەگرێتەوه، ئەمەو لە لایەکی دیکە دەڵێ: ناوی سۆمەرییەکان کە بە میللەتی قەمیشەلان (قامیشەڵان کیز ان. جی، کیجی) ناوداربووه سامییەکان بەم جۆره ناویان لێناون (سۆمەر)[٢٤٤] بە پێچەوانەی خۆی دەگەڕێتەوه دەڵێ ناوی سۆمەر بەهیچ شێوەیەك لە مێژوودا نەهاتووه[٢٤٥]. وه دوبارە دەڵێ سۆمەرییەکان لە هەزارەی پێنجەمی پ.ز لە چیای حەمرین و سامەررا (کە لەسۆمەرا هاتووه) چوونەتە خوارووی عێراق. ئەمەش بە پێچەوانەی رایەکەی خۆیەتی بەڵام لەهەمان کاتدا دەیسەلمێنێ کە سۆمەرییەکان لە چیاکانی کوردستانەوه چوونەتە دەشتەکانی خوارو یان لە کوێستانەکانەوه چوونەتە گەرمیانەکان. ئەمە و خەزعەل سەرنجی ئەو دوو مارەی سەرشانی (ننکشزیدا–Ningishzida) [٢٤٦] راینەکێشاوه کە چۆن دەمی

---

(٢٤٢) هەمان سەرچاوه، ص٨٧.

(٢٤٣) هەمان سەرچاوه، ص١٣.

(٢٤٤) خزعل متون سومریه، ص٢٢.

(٢٤٥) هەمان سەرچاوه، ص٢٤.

بۆ گودیاییەك کردۆتەوە یـان سـەری خـواردووە لەهـەمان کـاتدا دەسـتی تونـد گیراوە بۆ سزادانی ببەن وەك بەندەیەك بـەڵام مـاری لای خواوەندەکـەی دیکـە دەمی نەکرایەوەیە بەڵگەی ئەوەیە کە نییەتی خراپ نییە بۆ ئـەو واتـا نایـەوێ سەری خواوەندەکەی دیکە بخوا، بەڵام دەربارەی ژمارە ٢١ دەڵێ:

"ئەفسانەی ئەکەدی دەڵێ: (ئان) ی خاوەند لە نـەوەی سـولالەی ٢١ خواوەنـدەوە هـاتووە"(٢٤٧) ئەمـەش پەیوەندییـەك دروسـت دەکـات لـەنێوان ژمارەی ٢١ی ئازاری جـەژنی سـەری سـاڵی سـۆمەری و ٢١ی ئـازاری جـەژنی نـەورۆزی کـورد(٢٤٨) وە هـەروەها ٢١ پاشـای گووتـی بـە مانـای ٢١ مێـژووی سەرکەوتن لەناوەکەدا واتا سـەرکەوتنی گوتییـەکان و مێژووی حوکمیـان کـە ٢١ حوکمە بە رای من ٢١ی ئازار لە ژمارەی پاشاکانی گووتییەکانەوە هاتووە کـە بەهـەمان شـێوە وەك خواوەنـدی ناوچەکـە بـوون یـان جێگـای خواوەندەکانیـان گرتـەوە لـە مـاوەی ١٢٥ سـاڵ حوکـم، کـە مـیراتگری سۆمەرییەکان و هاوبەشی پێکەوە ژیانن ئەمـەش دەمـان گەیەنێتـە بەڵگەیـەك کە جەژنی نەورۆز دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سۆمەری گۆوتیی هاوبـەش نـەك هەخامنشـی کـە سـەردەمی گووتـی جـەژنی سـەری سـاڵ و ژیـانی نـوێ و

(٢٤٦) هەمانە سەرچاوە، ص٨٣. ننکشیزیدا خواوەندی جیهانی ژێرخاکە، کەواتە خواوەندی تاریکییە وەك ئەهریمـەن لـە زەردەشـتیدا.سـەرەتای دروسـتبوونی ئـاهورامزدا ئەهریمەنـە هێـزی چاکـە و خراپە.

(٢٤٧) هەمان سەرچاوە، ٩١.

(٢٤٨) ئێمەش لەوباوەڕەداین وەك باسمان کردووە دەگەڕێتەوە بۆ ٢١ پاشـای گووتـی کـە ناوچـەی سۆمەرییان حوکم کـردووە دەکاتـە ٢١ سـەرفرازی واتـا ٢١ نـەورۆز و سـەرکەوتن. خواوەندەکـانی سۆمەری هەر مەبەستیان پاشاکانن بوو کە پلەی خواوەندییان هەبوو.

لەناوبردنی کۆیلایەتییە گۆدیای پەیامبەر و هەڵگری بیر وبڕوای ئاشتی وبرایەتی بووە.

گودیا مەلیکایەتی نەویستووە هەمان گۆدیا سەرچاوەی دروستبوونی چیرۆکی یان ئەفسانەی کاوەیە کەمەلیکایەتی نەویست.

جگە لەمانەش هەمووی خەزعەل ئەو مارەی خستە روو کەوا بە (ئۆریۆس) واتا دایکی جیهانی یەکەمی داناوە[٢٤٩] کە لە شێوەی مارێکە کلکی لە دەمی خۆی ناوەتەوە کە مار لەلای سۆمەرییەکان دیارە پیرۆز بووە. نەك هەر هێندە بەڵکو دوو هەزار ساڵێکیش لەپێش سەردەمی هەخامنشینەکانە. بەڵام لەلای گوتییە کوردەکان پیرۆز نەبووە کەواتە کودەتای کاوە (ئینقیلابی کاوە) دژی ماری سۆمەریش بووە مەسەلەیەکی دیکەی زمانەوانی مەسەلەی (سێکسی) شوێنی رابواردنی ناولێناوە (گاگۆ)[٢٥٠] کە زۆر لە (گان کۆ) یان (گون و گانی) کوردییەوە نزیکە و هەمان مانا بەخشە وەك چۆن (گەنم و گا) لەلایان گرنگ وپیرۆزی بووە لەوسەردەمەدا یان چەکوشەکەی پیرۆزیان[٢٥١] کە هەمان چەکوشی کاوەیە ئەمانە هەمووی ئەو شارستانیەتە دەسەلمێنی بە زمانی ئاری کوردییە و تۆمارکردووە کە لە دۆڵی سندەوە تا فورات جێگای سەرهەڵدانی هیندو ئاری وهیندو ئەورووپیەکان بوو. بەرامبەر بەمە جیاوازی ئەوەی بابلییەکان یان سامییەکان کۆیلایەتییان هێنا نێوان چوار رووبارەکە(دیجلە، فورات، کەرخە،

---

(٢٤٩) هەمان سەرچاوە، ٦٩.

(٢٥٠) هەمان سەرچاوە، ٢٧٥

(٢٥١) هەمان سەرچاوە، ١٥٥، سەیری وێنەی چەکوشەکە بکە لەنێو کتێبەکەدایە، دەبێتە بەڵگەی پەیوەندی کە لەئەفسانەی (کاوە) جەختی لەسەر دەکرێ.

کارون) کە سەرچاوەیان چیای زاگرۆس وکوردستانی گەورەیە. ئەگینا یاساکانی سۆمەری چاکسازی بوو تۆڵەساندنەوە و کوشتن وبرینی تێدا نەبوو کە کاری کردە سەر هەموو میتۆدو میتۆلۆژیاکانی دواتر لەوانەش سۆمەرییەکان سەررەش کە هینیدو ئاری رەگەز بوون وەك هیندۆئەوروپییەکان کە پێش سۆمەرییەکان لەناوچەکە بوون وەك سبایزەر باسی*گوتییەکان دەکات هەر گوتییەکانیش بوونە هۆی دروست بوونی شارستانییەتی سۆمەری سێهەم. کە لە سندەوە تا فورات یان ئەوان نێوانێك بووینە بۆ گواستنەوەی زێدە مرۆڤی ناوچە گەرمەکانی لێوار ئاوەکانی هیندو و ئارییان بۆ ناوچەی زاگرۆس و خوارووی چوار رووبارەکە کە لە هەندێ وێنەی هەڵکۆڵدراوەکان بە ئاشکرا هەست بە هێمای هیندی و چینی دەکەیت[٢٥٢] ئەمەش مانای ئەوە نییە کە خوارووی عێراق کەسی لێی نەبووە کە نزیکترین شوێنە لە زاگرۆسییە رەسەنەکانی هیندۆ ئەوروپی ئەوان نزیك تر بوون لەگەڵ لقەکانی ئەو چوار رووبارە بەرەو گەرمیان کۆچ بکەن بەمانای دەشتە لیتراوییەکان. هەر بۆ زێدە زانیاری وەك چۆن ئێمە باسی جەژنی نەورۆز و (میهرەگان) مان کرد کە دوو جەژنی ئاریانی کۆن بوو. لێرەدا لە لا٣٣٦ دەبینین خەزعەل ماجدی باسی دوو جەژنی سۆمەرییەکان دەکا کە یەکەمیان جەژنی بەهارو نوێ بوونەوەو ژنهێنانی پیرۆزە کە دەکەوێتە ٢١ی ئازاری هەموو ساڵێکی سۆمەری و کەسەری ساڵی تازەمان بووە. کە پێیان ووتووە (زاموە)[٢٥٣]. بە ئەکەدی پێیان ووتووە (زاگموکا) جەژنی (زگماك)

(٢٥٢) جگە لە گای پشت مل قەمبوور کە سەرچاوەکەی دۆڵی سندە ماری کوبراو (تنین) ماری سەربەقۆچ سەر بەهەمان شوێنە.

(٢٥٣) هەمان سەرچاوە ص٢٣٦.

*mak*-zag زگماك بە کوردی بە مانای رەسەن دێت جەژنی لەگەڵ لە دایك بوو جەژنی دووەم کە پێیان ووتووە جەژنی (زاموا)ی دووەم لەسەرتای پایزبووە کە جەژنی زەردبوون و تۆکردن و خەمباری بن کە (دموزی) بۆ جیهانی ژێرەوی کۆچی کردووە لە (٢١)ی ئەیلول لەهەموو ساڵێکدا کە ناوەندی ساڵی سۆمەرییە. کە لەم دوو جەژنەدا ماوەی شەوو رۆژ وەکو یەك دەبێ کە بەڵگەی لەنێو یەکتر توانەوەی سۆمەرییەکانە لەگەڵ سروشتدا.

پاشان جەژنی دووەم بە لەناوچوونی سۆمەرییەکان نەماوە بەلام ئاشوورییەکان دواتر لەسەرەتای نیسان یادی جەژنی نەورۆزیان کردۆتەوە کە (١٢) رۆژ بووە. وە ناویشیان ناوە جەژنی ئەکیتۆ Akitu جەژنی (- ezen - a - ki tum ) (ئیزنی[٢٥٤] ئەکیتۆم)) کە هەندێك بە جێژنیباران بارینی لێك دەدەنەوە کەواتە کورد میراتگری هەمان جەژنی سۆمەرییەکانە)[٢٥٥] بەبێ ئەوەی بکەوێتە ژێر گۆڕانکاری بابلییەکانەوە لەسەر جێژنەکە بە واتا خسوسیەتی وەکو تایبەتمەندی جێژنی سۆمەریی هێشتۆتەوە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی کە هاورەگەز بوینە لەگەڵ گووتیەکان ئەوەی جێگای داخە خەزعەل ماجیدی دەوری گوتییەکانی کەم کردۆتەوە ئەگەرچی سەردەمی زێڕینی سۆمەرییەکان بوو ئەو سەردەمە بوو کەوا گووتییەکان ناوچەکەیان حوکم دەکرد. وە بەتەنیا خەزعەل ژمارەی مەلیکەکانی گووتی بە (١٢) مەلیك دادەنێ وە بە (٩٠) ساڵ حوکم و گووتیەکانیش بە دڕندەو غەریب

(٢٥٤) هەمان سەرچاوە، ص٣٣٨.

(٢٥٥) هەمان سەرچاوە، ص٣٣٧، سۆمەرییەکان ناوی خواوەندەکانیان لە مانگ و رۆژانی هەفتە دەنا.

لەناوچەکە لەقەڵەم دەدا[٢٥٦] وەك بڵێ بیابانیەکان خەڵکی ناوچەکەبن نەك دانیشتوانی رەسەنی ناوچەکە کە گووتی بوون بە لێواری لقەکان و سەرچاوەی دیجلە و فورات و ناوچەکە بە گشتی کە زستان خواروشیان هەواری کۆچەرەکانی زاگرۆس بووە وە هیچ سنورێك لەبەردەم کوردەکان نەبوو تا لە لێوارەکانی رۆژهەلاتی دیجلە و فورات بەلام سامییەکان لەرۆژئاواوە بیابانێکی گەورە و بێ ئاوو بێ رێگا یان لەپێش بووە بە ئاسانی نەپەرنەوە.

هەڵقەیەکی دیکەمان دۆزیەوە کە رێك کەوت نیە ئەویش ناوی مەلیکی گووتی بە (ارارام) [٢٥٧] تۆمارکردووە کەلەهەمان ووشەی (وارارام) نزیکە کە جاف و گاوانییەکان بە (وارام) و بارمایان دەگوت (وارارام) کە لەسەردەمی ساسانیانیش بهرام یان وارام لەوانە بەهرام جوبین (بەهرام گوڕ) ئایا ئەمە بەڵگەیەکی گرینگی زانستییانە و مەنیقیانەیە؟. بۆ زێدە زانیاری بروانە جابان القبيلة الكردية المنسيةی مصطفى جواد زۆر گاوانییەکان بە (وارامی) ناوداربووە. یان هەر بروانە بەشی هۆزی جاف و گاوانی وارامی لەم نووسینەماندا. کە ئەمەش دەکەینە بەڵگەی پەیوەندی رەسەنایەتی و کاریگەی سەردەمی گووتی هاوبەش لەسەر کورد کە تاکە میللەتێکی کۆنن میرات هەڵگری سۆمەرییەکان شان بەشانی هەموو بەڵگەکانی دیکەی کە دەسەلمێنێ سەرچاوەی جەژنی نەورۆز دەگەڕێنێتەوە بۆ سۆمەری گووتی سەردەمی سۆمەری گوتیی هاوبەش. تەنانەت بۆ رەسەنایەتی گاوانی و

(٢٥٦) راستییەکەی (٢١) مەلیکی گووتی لەماوەی ١٢٥ ساڵ حوکمی ناوچەکە دەکەن سەردەمەکەش سەردەمی زێڕینی سۆمەرییەکانە، کەواتە گووتییەکان کێویی و نەزان نەبوون.

(٢٥٧) هەمان سەرچاوە، ص٣٣٧.

(بارامییەکان) و کاریگەری لەسەر ئاین و مەزهەبەکانی دوای خۆیان، دەبینین یەك لەجەژنەکانی (مندایی) الصابئـە الاقدمین) جەژنی (پەنجە)یە کە پێنجەمین رۆژی بۆ (بەهرام رەبە)[٢٥٨]یە بە مانای بەهرامی خواوەند. لەم رۆژەدا (تەعمید)ی تێدا دەکرێ قوربانی تێدا سەردەبڕێ کە ئەم (مەندایی)یانە کە (کەمایەتییێکن لە خوارووی ئێراق لە ناسریە و منتفك و عیمارە و بەسرە و سوق ئەل شیوخ و گەرمە و جبایش و ئەهواز و ناسریەی عەجەم)[٢٥٩] دەژیان کە ئەوانەش دانیشتوانی کۆنن زمانی کۆنیان فارسی وعەرەبی تێکەڵ بووە گەر وردببینەوە جەژنی (پەنجە) لە ژمارە (پێنج) یان پەنجاوە هاتووە کە پەرستگایەکی گۆدیای سۆمەری گووتی هاوبەش ناوی ژمارە (پەنجا) بوو وە لەنێو هیندێییەکانیش ناوچەیەك هەیە بەناوی (بەنجاب) جا یان لەپێنج ئاو (ئاب)ەوە هاتووە یان لە ژمارە (پەنجا ئاب)وە هاتووە پەیوەندییەك دروست دەکا لەنێوان ئێستا و مێژووی کۆندا لە بونی گاوانییەکانی جاڤ (گاڤی) گووتی گاوانی گاوەیی بە درێژایی مێژوو لەهەمان ناوچەدا تا هاتنی عەرەبە موسڵمانەکان ئەمەش بەڵگەی رەسەنایەتییە وە سمبولەکانی ئەو سەردەمەی سۆمەری گووتی هاوبەش هەمووی پێکەوە دەبنە سەرچاوەی دروست بوونی جەژنی نەورۆزی هەمیشە زیندووی کوردی ئێستاکە وە سەرچاوە نەك نەورۆزەکەی ئێستای کوت و مت کە خاوەنی تەمەنی چوار هەزار ساڵی پڕ لە گۆڕانکارییە.

(٢٥٨) عبدالحمید افندي بن بکر افندي عبادة. ص٥٢-٥٣ سنة الطبع ١٩٢٧.

(٢٥٩) هەمان سەرچاوە، (مەندایی)، ص١١، کە سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراوە لەسە مەندایییەکان لە ساڵی ١٩٢٧ز، کە کاتی عەرەبەکان بەشی رۆژئاوایان داگیر کردبوو.

سەرچاوەكان:

سەرچاوەكان بە زمانی فارسی:
١. تاريخ ايران، حسن بيرنياو عباس اقبال.
٢. اطلاعاتي عمومی، عنايت الله شكسابور.
٣. تاريخ كامل ايران، دكتور عبدالله رازی.
٤. نوروز در كردستان، عبيدالله ايوبيان.
٥. كوردو بيويستكی نەژادی، رشيد ياسمی.
٦. اهميت كردستان درا دوار تاريخی، منصور مخدوم.
٧. فرهنگ اطلائي
٨. ايران در زمان ساسانيان، كرستين و. رشيد ياسين.
٩. طوايف وعشاير كرد، سيد صمدی.
١٠.سيری در تاريخی ايران باستان، فريدون شايان.
سەرچاوەكانی بە زمانی كوردين:
١١. ميديا: دياكونوف. وەرگێڕن برهان قانع.
١٢. كوردستان نيشتمانی يەكەمينی سۆمەرييانە، هاوڕێ باخەوان.
١٣. نەژادی كورد، ئول. ڤيلجيڤيسكی، و. رەشاد ميران.
١٤. خشتەكانی شمشارا يۆرجين ليسۆ و. عزيز گەردی.
١٥. گۆڤاری كۆڕی زانياری كورد ب.٢ ،١٩٧٤.
١٦. مێژووی دێرينی كوردستان فازل قەرەداغی.
١٧. كوردستانی خوارووی رۆژ هەلات، ی. ئی. ڤاسيليەڤا،و. د. رشاد ميران.
١٨. تاريخی جاف، كريم بەگی فتاح بەگی جاف.
١٩. گوڵبژێرێك لە مێژووی عەشايری جاف و ميكائيلی، تارق صالح، تاهير سور.
٢٠. چيانشينەكانی زاگرۆز، هورمزی بێگ لەری .
ناوی سەرچاوەكان بەزمانی عەرەبی:
٢١. فتوح البلدان، بلاذري.
٢٢. الف ليلة وليلة ، مجلد٣.
٢٣. بلدان الخلافة الشرقية، لسترنك.
٢٤. سومر فنونها وحضارتها، اندری بارو.
٢٥. الاصابة في تميز ف الصحابة، وتفسير روح المعاني، ذيل سورة الفتح.

٢٦. البنية الذهنية الحضارية في شرق المتوسطي، يوسف الحوراني.
٢٧. فانديدات افيستا، ترجمة من الفرنسية، الموصلي.
٢٨. سومر استطور وملحمة، د. فاضل عبدالواحد علی.
٢٩. حضارة العراق واثاره، ت. سمير عبدالحليم الجلبي.
٣٠. اشور بانيبال، سيرته ومنجزاته، د. رياض عبدالرحمن امين الدوري.
٣١. دائرة المعارف الاسلامي، م. لواء الركن محمد نجم الدين النقشبندي.
٣٢. تاريخ الشرق الادنى القديم، سامی سعيد و رضا هاشمي.
٣٣. تاريخ كرد وكردستان، طبعة القديمة، امين زكي بك.
٣٤. اثر المدونات البابليةفي المدونات التوراتية، الاب سهيل قاشا.
٣٥. جاوان القبيلة الكردية المنسية، د. مصطفى جواد.
٣٦. دائرة المعارف الاسلامية، مجلد(٥).
٣٧. محاظرات بتاريخ الامم الاسلامية، الشيخ محمد الخضري بك.
٣٨. رحلة ابن بطوطة، ١٣٨/١، مطبعة التقدم.
٣٩. دائرة المعارف الاسلامية، مينورسكي.
٤٠. صلاح الدين الايوبي من جديد، (اصله ومنشئأه، عبدالخالق سرسام.
٤١. العشائر الكردية، فؤاد حمة خورشيد.
٤٢. انجيل بوذا، طبعة بيروت،١٩٥٣.
٤٣. تاريخ عرب قبل الاسلام، د. جواد علی.
٤٤. العرب قبل الاسلام، جرجي زيدان.
٤٥. طبيعة المجتمع العراقي، د. علی الوردي.
٤٦. فيظانات بغداد في التاريخ، احمد سوسة.
٤٧. الاكراد وبلاده منذ اقدم العصور، مقدم شيخ عبدالواحد، باكستان.
٤٨. لقاء الاسلاف، د. جمال رشيد.
٤٩. القادسية، احمد عادل كمال
٥٠. مقتبسات اليهود من الشرائع العراقية القديمة، حسن النجفي.
٥١. جنوب كردستان، هنري فيلد، دراسة انثروبولوجية، م. جرجيس فتح الله.

سەرچاوەی دیكە:

- كورد لە سەرچاوە عەرەبیەكاندا، و. ئازاد عبید.
- تاريخ الاسلام السياسي والديني ، د. حسن ابراهيم حسين،١٩٦١.
- بخور الالهة، خزعل الماجدي، دراسة في الطب والسحر والاسطور و الدين.

## لەبەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

١. بەستەی گومان، شیعر ١٩٦٩، چاپخانەی کوردستان.
٢. لە لێواری گەردوندا، شیعر ١٩٩٠، بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری کوردی.
٣. ئاشتی نامە، شیعر١٩٩٥ ئۆفسێت.
٤. صلاح الدين الايوبي من جديد، دراسه ١٩٩٨ دەزگای کاوەی رۆشنبیری.
٥. سەلاحەدین ئەرمەنی‌نیە رەوەند و زەرزاری دوینـــی هـەولێرە، ٢٠٠٠ بزافـی رۆشنبیری کوردی.
٦. ئەوکاتانەی ئێراق هەمووی کوردستان بوو، کاوەی گوتـی جاف و ئەژدیهاك بابلی بوو، ٢٠٠٥، ئەو پەرتوکەی لەبەردەستتە.

ژمارەی تۆمارکردنی لە کتێبخانەی هەرێم : (            )



# ئاڤێستای نەورۆز

ئەم کتێبە باس لە چۆنیەتی دۆزینەوەی شوێنی رووداو و سەرچاوەی چیرۆکی کاوە و ئەژدیهاك دەکا، باس لە چۆنیەتی پەیدابوون و مانای ناوی کورد و کرمانج و نەژادی کورد دەکا.

لێکۆڵینەوەیەکە.. لەسەر بیر و هزری نێوان دوو رووباری دیجلە و فورات و زاگرۆسیەکان، کە هەمیشە خواروو ی ئێراق تا هاتنی عەرەبە موسڵمانەکان هەمووی کورد و ئاری نشین بوو. ئێراق چۆن لە (ئوور-ئار-ئارۆك - ئارواق)ی کوردی و سۆمەرییەوە هاتووە. باسی هێمای ئایینی هیندۆئەوروپی سەرەتایی زێتر لە دوو هەزار ساڵ بەر لە زەردەشت دەکا. کە سنووری لە سندەوە تا فوراتی نێوەند بوو کۆدیا چۆن کاوەیە و مەلیکایەتی نەویست چۆن کاوەی گووتی پەیامبەری ئاشتی و برایەتی و رزگارکەری مرۆڤە لە کۆیلایەتی بۆ یەکەم جار لە مێژووی کۆندا. گۆدیا چۆن بوو بە خواوەند و نەمر. گاییەکان چۆن زاڵ بوون بەسەر (مار)ییەکان یان ئەژدیهاکی (مار) لەسەر شان، کاریگەری هزری سۆمەری و گووتی هاوبەشە لەسەر ئایین و هزری دوای خۆیان، چۆن کورد میرات گری سۆمەرییە زاکرۆسییەکانە. لەگەڵ دەیەها وێنەی شوێنەواریی و گۆدیا و ئەژدیهاك زیاتر لە چوار هەزار ساڵی بەر لە ئێستا.